# چۆن بووم بە پرد؟!

## بیرەوەرییەکانی محەمەد ئەمین پێنجوێنی

ئامادەکردنی: خەڵات عومەر

**(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) پیاوی ئەرکە سەختەکان.**

(جەلال تاڵەبانی).

**(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) پردی نێوان باکوور و باشوور.**

(عەبدوڵڵا ئۆچالان)

**(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) چەپێکی نەتەوەیی، نەتەوەییەکی چەپ.**

(جەمال نەبەز).

**(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) دیپلۆماتێکی شارەزا لە مێژوو.**

(عیسمەت شەریف وانلی)

**سەیدای پێنجوێنی شاعیرو سیاسی و کوردێکی ئەنتەرناشیونالٌ.**

(پرۆفیسۆر نادری نادرۆف)

**دەخوازم هەموو کوردێک تێکۆشەرێکی بێ فیزی وەکو محەمەد ئەمین پێنجوێنی بێت.**

(دکتۆرە دوریە عەونی)

**محەمەد ئەمین پێنجوێنیم خۆشویست، لەبەرئەوەی وەکو خۆم شاعیرو جوانپەرست و هونەرمەندو کوردپەروەرە.**

(هۆمەر دزەیی)

**قسەکانی پێنجوێنی وەک تیغ کاریگەرن.**

(بەرپرسێکی گەورەی تورک لە کاتی پرۆسەی ئاشتیدا)

## ناوەڕۆک



## بەشی یەکەم:

## پێنجوێن بەبێ تۆ نزیکە مەرگم.

**بەشی دووەم:**

**شاری شاران.**



**بەشی سێیەم:**

**رۆژانی سەخت.**

**بەشی چوارەم:**

**خەبات بە شێوازێکی تر.**

**بەشی پێنجەم:**

**دەمی ڕاپەڕین.**



**بەشی شەشەم:**

**خەونی نەتەوەیەک لە هەندەران.**

**بەشی حەوتەم:**

**شابازێک لە قەفەزدا.**

## بەشی هەشتەم:

## هۆنینەوەی تانوپۆی خەونەکان.

رازێك سەبارەت بە پرۆژەی ئەم كتێبە.

ساڵانێكە كەڵكەڵەی ئەوە كەوتبووە سەرم، كە بیرەوەرییەكانم بنووسمەوە، زۆرجاریش دۆست و برادەران هانیان دەدام دەست بەو كارە بكەم، هێندێك جاریش كە بابەتێكی گرنگ، یان ڕووداوێكم دەگێڕایەوە، هێندە بایەخی مێژوویی هەبوو، گلەییان لێدەكردم كە بۆچی ئەم باسوخواسە نانووسمەوە، تاوەكو لە ئایندەدا وەكو بەڵگەیەك بۆ تۆماركردنی مێژووی سیاسیی كوردستان سوودی لێوەربگیرێت.

ڕۆژگار هات و ڕۆیشت، من دەستم نەكرد بە نووسینەوەی بیرەوەرییەكان، جا بەهۆی سەرقاڵیی ژیانەوە بێت، یاخۆد بە هۆكاری دیكە.

نووسەری بەتوانا كاك (خەلات عومەر) لە هەرە نزیكترین هاوڕێكانمەو پەیوەندییەكەشمان زۆر كۆنەو دەگەڕێتەوە بۆ هاوڕێیەتیم لەگەڵ نووسەرو هونەرمەند مامۆستا (عومەری عەلی ئەمین)ی باوكی و دۆستایەتیم لەگەڵ بنەماڵەكەیان.

لەگەڵ خەلات، زۆرجار گفتوگۆ دەکەین و قسەی دڵمان بۆ یەکتری دەکەین، ڕۆژێکیان خەلات وتی: "مامۆستا بۆ نایەیت پێکەوە دەستبکەین بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانت، تۆ هیچ مەکە، بۆم بگێڕەوەو منیش دەیهۆنمەوە، مەردی چاک بە با ئەم هەموو بابەتە گرنگانەی کە لای تۆ هەن، نەفەوتێن و لە دەست مێژوونووسی کوردیش نەچێت".

ئەقڵم گرتی و قسەکانی خەلات-م پەسەند کرد، بەتایبەت کە من زۆر متمانەم بە خۆی و بە قەڵەمەکەشی هەیە، وتم: "جا ئەگەر تۆ ئەوەم لەگەڵ بکەیت، کۆڵێک مەمنوون دەبم".

هەر زوو دەستمان کرد بە کارکردن، نزیکەی دوو ساڵێک بە ئامادەکردنی ئەم کتێبەوە سەرقاڵ بووین، وامان دانابوو کتێبەکە زووتر چاپ بکرێت، بەڵام بۆئەوەی کتێبێکی باش بێت، چەندینجار پیایدا دەچووینەوەو دەستکاریمان کرد، هەتا گەیشتین بەوەی بەم شێوەیە بێت کە ئێستا لە بەردەستتاندایەو دەیخوێننەوە. بێگومان ئەمە ناکاتە ئەوەی کە بڵێم کتێبەکە کەموکوڕیی تێدا نییە، بەڵام لە کۆتایی کارکردن و کە دواجار کتێبەکەم پێش چاپکردن خوێندەوە، هەستم کرد کە پرۆژەی دانانی ئەم کتێبە کارێکی گرنگە بۆ مێژووی سیاسیی کوردستان، ئەمەش بۆ من مایەی خۆشنوودییە. ئێوەش دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە خۆتان دەتوانن حوکم بدەن.

دەمێنێتەوە بڵێم، پرۆژەی دانانی ئەم کتێبە، بەم ناوەڕۆک و شێوازە بەبێ ئەرک و ماندووبوونی خەڵاتەکە-ی (عومەری عەلی ئەمین)، نەدەکراو نە پێکدەهات و نەدەبوو، بۆیە کۆڵێ سوپاسی دەکەم کە ئەم کارەی بۆ من و بۆ مێژووی کوردستان کرد.

**محەمەد ئەمین پێنجوێنی**

٢٠٢١

لەپاش مردن
گیانم ئێوەن، هەژاری کورد
بۆ شالاو و هێرشبردن
سەر بەردەبازی پێتانە
لە مێرگدا.
بۆ ڕووباریش،
ئێسکەکانم بکەن بە پرد...!

چۆن بووم بە پرد؟!

مەلی خەیاڵت هەڵدە با بفڕێت، بەرز بفڕێت، دانەکەوێت بەرز بفڕێت، شاباڵی بەسەر حەوتەوانەی ئاسماندا پەخش بکات، سێبەرێک دروست بکات بۆ ئەوانەی بێ نەوان، بۆ ئەوانەی ئەگەر هەژارن و زستان بەرگی هەژارانەی دڕیون، چەترو نوا بێت، خەیاڵ بۆچی باشە ئەگەر وا نەبێت؟!

ئێستا من منداڵێکی چەتوون و لاسارم، هەراش بووم و بە حاڵ فێربووم، ئەم وێنانە ببینم، کام وێنە؟!

وێنەی پێنج وێنەو هەزار وێنە، پێنجسەد هەزار وێنە، ئێستا کاتێک چاوانم تەفرەم دەدات، لە بینینی یەک وێنە، ئەوەی دەبێتە زەڕەبین و دووربین و مایکرۆسکۆبم بەم چاوە کزانەوە، بەم سەرەوە، کە بەفری تەمەن لە سەری داباریوەو ناهێڵێت کڕێوەی بەفری زستانی قەندیلی لێ ببڕێت، یەک وێنایە، یەک ئایندەو یەک خەونە.

وا باوە لە هەر چوارپارچەی نیشتمانەوە بە (پێنجوێنی) بانگم بکەن، چیرۆکی ئەم ناوە پێنجوێنییە، دەشێت پێنج جولەکەی لە پشت بێت، یان پێنج وێنە بێت، گرنگ نییە کام چیرۆک دروستە، بۆ من ئەم پێنجوێنییە شتێکی تایبەتە، چوارپارچەی دڵی لەتلەتی نیشتمانەو پارچەی پێنجەم بۆ من نەبم، کە بەم دەردی بێ وڵاتییەوە دڵم پێنجسەد هەزار لەتە؟!

لەتێک عەشق بردی، لەتێک غەمی وڵات، لەتێکی تر بێدادیی، لەتێک شیعرو لەتێک سیاسەت بردی، نازانم چی ماوە شەیتانی داماو بیبات؟!

مەلێ هەڵدەدەم کە مەلی خەیاڵمە، بۆئەوەی تۆزێک بیرەوەریی باس بکەم، لەم سەربووردەی کتێبەدا. بۆ کەس نا، بۆ بەدەستهێنانی سەروەریی و مێژوو نا، بۆئەوەی بڵێم منیش چیرۆکێکم هەیە، منیش مرۆڤم و هەقم هەیە باسی چیرۆکەکەم بکەم، پێتان باشە، پێتان خراپە، ئەمە چیرۆکەکەمەو خۆتان بڕیار بدەن.

من دەزانم چیرۆکەکەم پڕ پڕە لە دراما، ئەگەر بکرێت بە فیلم، نیزیکترین کەسە نزیکەکانی خۆیشم باوەڕم پێ ناکەن، قەیچێکا با وا بزانن من ڕاست ناکەم، بەڵام دەزانم دواجار دەزانن، من بۆچی وا بووم و بۆ وام کردووە. ڕەنگە

ڕێگای هەڵەم هەڵبژاردبێت بۆ گەیشتن بە ڕاستی، بەڵام پێی گەیشتووم، دەرباری ڕێگای ڕاستی و خەونی نیشتمانەکەم بووم، خەڵک هەبوون گوایە قارەمان و ئەفسانەی ڕێگای گەیشتن بوون بە بیروباوەڕی ڕاستی، بەڵام بوون بە پەند، پەندی جوان نا، پەندێک کەس ڕووی نایەت باسی بکات!

دێمەوە سەری دێڕو هەندێ قسە دەکەم، دەمەوێت قسەکانم کۆبکەمەوەو بڵێم: "من شتێکی بچووکم و گەورە نیم، خەڵک سەرکردەو گەورەن، هەر هەبن و سەرکردەو گەورەبن، بەڵام لەم دەورووبەرەشدا من هەبووم، من سەرکردە نەبووم، بەشێکی گەورە نەبووم لە شتێکی بچووک، بەشێکی بچووک بووم لە شتێکی گەورە، بەلای منیشەوە گەورەیی لەمە زیاتر، گەورەیی نییە!

ئەم چیرۆکە سەرو سامانی منە، هیچم نییە لەم چیرۆکە زیاتر نەبێت، وا ئێستا دەچمە سەری و ورد ورد دەیگێڕمەوە.

من بەشێکی بچووک بووم لە شتێکی گەورە، من خواروخێچییەک بووم لە ڕاستییەکی گەورە، تۆزێک شیعرو تۆزێک خەون و خولیا بووم. ئێستا کە لێرەوە سەیری فیلم و درامای ڕابردووی ژیانم دەکەم، حەز دەکەم زۆر شت بەو شێوەیە نەبووایە کە ڕووی دا. خۆم چیرۆکەکە بنووسمەوە هەزار جار دەستکاریی دەکەم، بەڵام لە ئێوە

دەپرسم، کێ دەتوانێت چیرۆکەکەی خۆی بەو شێوەیە بنووسێتەوە کە دەیەوێت؟

ئێستا تەمەن هیچی بە بەرەوە نەماوە، کاتی پەشیمانیی و پێداچوونەوە نییە، هەیەو نییە ئەمەیە کە بیگێڕمەوە، ئەمەش کەم نییە من خۆم باسی زۆریی و کەمیی ناکەم، خەڵک هەبوون بوون بە سەرکردە، بە سەردارو جوامێری مێژوو، بوون بە هونەرمەندی گەورەو شاعیری گەورە، هەبوون بوون بە چراو ڕێگای تاریکیان ڕووناککردەوە، بەغیلی بەوانە دەبەم لە من باشترو گەورەتر بوون.

هەبوون بوون بە قوتابخانەیەکی بچووک و هەزاران منداڵیان تێدا گەورە بوو، هەبوون برینساز بوون و هەتوانی زام بوون، هەبوون مۆم بوون و دریان بە تاریکیی شەوەزەنگ دا. من هیچ لەوانە نەبووم و بەدەست و دامەنیان نەگەیشتم، بەڵام لە کۆتاییدا منیش شتێک بووم.

ئێستا مەلی خەیاڵم بمباتەوە بۆ منداڵی، بۆ گەنجی، بۆ سەردەمی کامڵبوونیشم خۆشم باوەڕ ناکەم، کە بووم بە شتێک پێی دەڵێن پرد!

زەمان هات و ڕۆیشت وا ڕێکەوت لەنێوان چوارپارچەی دڵی نیشتمانێکی بریندارەدا، منێک کە زۆرجار تاوانبارکراوم، ئێستا ببم بە پرد، پردی ڕۆژانێک ئەگەر بەقەد تاڵە

دەزوویەکیش بووبێت، بۆ من نا، بۆ خەونێک کە بەهای هەبووە.

دەڵێن ئەوی لەسەر پردی سیرات لەو دنیا بپەڕێتەوە، لە خەم دەرەخسێت، من چیم دەوێت ئەگەر لەم دنیایەدا بووبم بە پرد، بۆئەوەی خەونی وڵاتێک تۆزقاڵێک لەخەمرەخسین نزیک ببێتەوە؟!

لێرەدا دەست بە چیرۆکەکەم دەکەم، سەرو سایەو سامانم ئەم چیرۆکەیە کە تێیدا بووم بە پرد لەنێوان پارچەکانی نیشتماندا، من خۆم دووچاری سەرەتاکان دەبووم، بەڵام باوەڕم نەدەکرد دەرەنجام وابێت، ژیان خۆی چۆنە با وا بێت، من بیروباوەڕم هەڵبژاردووە، بەڵام وردەکارییەکانم هەڵنەبژاردووە، مرۆڤ وردەکاریی نییەو هێڵی گشتی بیروباوەڕە.

لە هەموو زەمانێکدا داکۆکی لە بیروباوەڕم دەکەم، وردەکاریی جێگای رەخنەیەو مەرج نییە من چۆنم بۆ هاتووە ئەوە باش بێت، ئەوە ڕاست و دروست بێت!

ئەوەی ئەم چیرۆکەی من دەخوێنێتەوە، ئازادە چۆن سەیری دەکات و چۆن هەڵیدەسەنگێنێت، بەڵام من کە پاڵەوانیم، ئەو هەقەم هەیە بەڕاستی بۆتانی بگێڕمەوە.

کە بووم بە پرد، خۆشم نەمدەزانی دەبم بە پرد، وای چ پردێک، خۆزگە زەمانێک ئەوانەی ئەم چیرۆکەی من دەخوێننەوەو بەسەر پردی شەقارو ماندووی من و هاوڕاکانمدا دەپەڕنەوەو دەچنە بەری ئارامی ئەو خەونەی خواستوومانە بێتە دی و وەک ڕۆژی ڕووناک دەزانم دێتە دی، بزانن ئەوان لە بەرەبابی پیاوان و ژنانێکی ماندوون و سەرسەختانە داکۆکی لێ بکەن و لەدەستی نەدەن.

دەزانم ئەگەر پردێک بووبم، ئەوان دەبن بە هەزار پرد، ئەگەر ئەم باوەڕەشم بە نەوەکانی داهاتوو نەبووایە، نەدەچوومە سەر ئەو خەیاڵەی ئەم چیرۆکە بنووسمەوە، کە چۆن بووم بە پرد؟!

پێنجوێنەکەم

**شاری هەرمێ و هەنگوینەکەم**
**ئەی گۆشت و ئێسک و خوێنەکەم**
**کولووە بەفری شیو و شاخت**
**دارگوێزی چڕ، بەدەماخت**
**ئاووهەوای سازکارت**
**گەشتی سەیرانی بەهارت**
**پاییزی پەلکەزێڕینەت**
**لوتکەکانی وەک پەرژینت**
**کانییەکانی بەر مانگەشەو**
**شەپۆلی دەنگی قاسپەکەو**
**گوڵە شیلانی ڕەنگاوڕەنگ**
**چەند جۆرە گژوگیای قەشەنگ**
**کەژاوەی مانگی نیسانت**
**هەزاران دیمەنی جوانت**
**بیرو هۆشم ئەورووژێنن**
**فرمێسک لە چاو قەتیس دێنن.**

١- بەردێك لە پردی نێوان باشوورو خۆرهەڵاتی وڵاتدا.

بەری درەختی خۆشەویستییەکەی دایکم و باوکم، کە گەرمەو کێشەی زۆری بۆ دروستبووە، تا بتوانن خێزانێکی گەورە دروست بکەن، دە منداڵ بووە.

من سێیەمین منداڵی ئەو خێزانەم و جگە لە خۆم پێنج براو چوار خوشکم هەبووە، کە ئێستا هێندێکیان لەم دنیایەدا نەماون.

نازانم ئاخۆ لە دنیایەکی تردا باوکم و دایکم بە یەک شادبوونەتەوەو چاوەڕوانی ئێمە دەکەن، کە جارێکی تر لەو دنیایەدا هەموو خێزانەکەمان کۆببێتەوە، یان دنیا هەر ئەمەیە کە هەیەو ئاوها بە دەردەسەریی دەیگوزەرێنین و هیچ دنیای ترمان لە ڕێگادا نییە؟!

دەفتەرچەی سەدەی ڕابردوو و ڕێکەوتی ساڵی (١٩٤٤)، دەبێت لە لاپەڕەیەکیدا ئەوەی تێدا تۆمارکرابێت، کە چۆن من لەو ساڵەدا چاوم بە دنیای ڕازاوەی پێنجوێن هەڵهێناوەو گوێچکەم بە ئاوازی مۆسیقای ئاهەنگی ئەو ڕۆژگارە زاخاو دراوە.

باوکم بە نەسەب ڕەگوڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (باشماغ)ی سنووری پێنجوێن و بە هەق و حسسابیش شوێنەوارو ماڵ و موڵکی باوک و باپیرانم لەوێ ماوە.

دایکیشم خەڵکی (مەریوان)ی خۆرهەڵاتی کوردستانە بە ناوی (بەردەڕەش)، ئێستا گوندەکە گەورە بووەو یەکێکە لە شارۆچکەکانی شاری مەریوان و گوندی باشماغیش لەم ڕۆژگـارەدا بۆتە مەرزێکی نێودەوڵەتی و هەرێمی کوردستان بە ئێرانەوە دەبەستێتەوە.

بەهۆی نزیکیی گوندی باشماغ لە باشووری کوردستان و گوندی بـەردەڕەش لە دیـوی خۆرهەڵاتی کوردستان و گـەرمـوگـوڕیـی پـەیـوەنـدی کۆمـەڵایـەتـی و کـاروبـاری بازرگانییەوە، باوکم پەڕیوەتەوە ئەوبەرو چاوی بە دایکم کەوتووەو هەر زوو هۆگری بووەو کەوتۆتە بەندو داوی عیشقییەوە.

کارەکە هـەر وا ئاسان نـەبـووە، چونکە ماڵە باوانی دایکم نەیانویستووە کچەکەیان بدەنە کەسێک لە دەرەوەی گوندەکەی خۆیان، چجای باوکم کە نەک خەڵکی گوندەکە نەبووە، بەڵکو خەڵکی گوندێکی دیوی ئێراقیش بووە.

بەهەرحاڵ گرفت پەیدابووە، تەنانەت کار گەیشتووە بە دەرگیری و شەڕەتفەنگ و تەقوتۆق و ئاخری چیرۆکەکە ئەوە بووە، کە باوکم و دایکم بە یەک شاد بوون و خێزانیان دروستکردووە. من لەو خێزانەوە هاتوومەتە دنیاو لەم چیرۆکەشمدا کە سـەبـارەت بە پـردە، بوومەتە بەردێک

بۆ بناغەی ئەو خەونەی، کە نەک لەنێوان خۆرهەلات و باشووری ولاتدایە، بەلکو بۆئەوەی لەنێوان هیچکام لە پارچەکانی نیشتماندا، سنووری دوژمنکرد نەمێنێت.

٢- پێنج وێنە، یان هەزاران وێنە؟!

ئەو وێنانەی کە ئێستا دێنەوە بەرچاوم سەبارەت بە پێنجوێن، پێنج وێنە نین و هەزاران وێنەی ڕەنگاوڕەنگن.

ئاوەدانییەک کە تێیدا بۆ یەکەمجار دنیام تێدا ناسیوە، لەناو ڕیزە چیایەکدایە، کە هێندێک جار ئاسمان و ئەستێرە نەبێت، هیچ نابینیت.

باخ و گول و گولزارو چیمەن و لالەزار، دارکاژو دارگوێزی بالابەرز، داربەڕووی گولزاری چیا، مازووی گەزۆ لێباریوی نوالان و دارقەزوانی شۆخی کێوان. دارستان و پێکدادانی دارودرەخت و دەوەن و هەردو نزارو کۆسار.

خۆ بەتایبەتی لە بەهارو هاویندا کە بە جارێک دەبووە قیبلەی دلان و هاوینەهەوار، ئەوە هەر باسی پاییزی مەکە، کە گەردانەو ملەشیلان بەو چیایانەدا هەلدەواسران و وەک زێڕی عەیارە بیستوچوار دەدرەوشانەوەو شەڕیان لەگەل شەبەنگی خۆر دەکرد.

زستانانیش وێنەکەی پێنج وێنە نەبوو، پێنج هـەزار وێنە بوو. بەفری سپی، بەفری زیویین بەو کەژو کێو و کەمەرانەوە، هەزاران وێنەیان لە کامێراو ئاوێنە دەدزی و دەدرەوشانەوە. چلورەو سەهۆڵبەندان، ڕێبەندی سەختی مانگی ڕێبەندان، بریسک و هورِێکیان بوو، چاوی چاوتیژیان لە خۆری مانگی میوەگەنان دەسەندەوە.

پێنجوێن پێنج وێنە نـەبـوو، پێنجسەد هـەزار وێنەو زیاتریش بوو.

سەردەمی منداڵیم پڕپڕ بوون لە وێنە، شوکرانەبژێرم لە زەمانێکدا لەدایکبووم و لە جوگرافیای پێنجوێنیشدا هاتوومەتە دنیاو ئێستا بە سەری سپیشەوە دەتوانم زۆر شت بگێڕمەوە، کە چیرۆکی ڕەنگاوڕەنگن.

من منداڵی زەمانێکم کە دەڵێن پێنجوێن، پێنج وێنەی هەبووە، بەڵام بۆ من ئەو وێنانە لە بژاردن نایەن.

بیرمە چۆن خۆمان بە شتی سەیرو سەمەرەوە خەریک کردبوو، شەڕەسەگ و گەڕەک و تاقم تاقمێنە، منداڵیم وەک زۆر ڕۆژگاری بێهودەی گەلەکەم بوو. لە هەر گەڕەکێک دەستەو تاقمێک منداڵەوردکە کۆدەبوونەوە، هەر گەڕەک و دەستەو تاقمێک خۆیان لـەوەی بەرامبەر بە باشترو ڕاستتردەزانی. ئەمان خۆیان لەوەی تر بە ڕاستترو چاتر

دەزانی و هەموانیش دەکەوتنە وێزەی یەکتر.

بەهەرحاڵ نامەوێت بڵێم ئەو زەمانە باش بوو و ئێستا خراپە، نامەوێت لەبارەی زۆر شتیشەوە هەر بڕیار بدەم. جوانیی زەمانی ڕابردوو ڕەنگە باش و جوان نەبێت، بەڵام ئەم زەمانە ئەوەندە ناشیرین و دزێوە، وات لێدەکات خۆزگە بە ڕابردوو بخوازیت.

منداڵیی ئەو زەمانە زۆر سەخت بوو، سوپاسگوزارم منداڵی منداڵەکانم و منداڵەکانی ئەوانیش زۆرباشترن و دەخوازم داهاتوو بۆ منداڵ و بۆ هەموانیش باشتربێت. منداڵیی ئەو زەمانە بەڕاست سەخت بوو، نازانم منداڵیی ئەم زەمانە کە سەخت نییە، خۆشنوودیی زیاتری تێدایە، یان ئەوەی ئێمە واتای خۆشی تێدا زیاتربوو؟!

ئێوارەمان لێدەهات و هەرکە خۆر لە پشت چیا سەرکەشەکانەوە خۆی دەشاردەوە، بیناییمان دەبووە بینایی کوێران و تاریکیی باڵی بەسەر دنیادا دەکێشا، هەموان دەبوو پەنا ببەینە بەر چراو گوێ لە کەسێک بگرین، کە وا باوە لەبەر ترووسکایی چرادا خۆی دەبێتە چرایەکی ترو خەیاڵمان ڕۆشن دەکاتەوە.

باوباپیرو کەسانێک کە تەمەن و ئەزموونیان لە ئێمە زیاتر بوو، بەدیار تروسکایی چرایەکی کزەوە بیرو بەندی

خەیاڵیان دەهۆنینەوە. سەربووردەو چیرۆک و ئەفسانە، ژوورو ماڵی تاریکیان ڕۆشن دەکردەوەو خەیاڵیان وا دەوڵەمەند دەکرد، هەر باسی مەکە.

ئینجا شەو هەبوو جگە لە حیکایەتخوان، دەنگبێژو شاعیرو خۆشخوان دەهاتن، ئاهەنگساز دەبوو، بەندو باڵۆرەیان دەگێڕایەوە، بەدیار کوانووی ساردی ئاگرەوە، منداڵیمان پشکۆبوو دەگەشایەوە.

فۆلکلۆر، گرەوی بەخت، گۆرانی، شیعر، چیرۆک، مەتەڵ و یاریی لە کوانووی جارانی منداڵی پێنجوێنەکەم دەنیشتن و بۆ حەوت تەبەقەی ئاسمان بەرزیان دەکردمەوە.

٣- بەرکێو و بەری کەناو.

لە پێنجوێن کە ئەو دەمە بە هەق و حساب شارۆچکە بوو، بۆ من لەو هەموو شارانە گەورەتر بوو کە دواتر لە چوارقوڕنەی دنیادا بینیمن. لە پێنجوێن کۆمەڵە گەڕەکێک هەبوون، بەڵام گەڕەکی سەرەکی (بەرکێو)و (بەری کەناو) بوون.

لە خەیاڵی منداڵیم بپرسیت، وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: "ئەو دوو گەڕەکە ئەوەندە گەورە بوون، بلۆکی یەکێتیی شورەوی و بلۆکی خۆراوای زەمانی خۆیان بوون"! گەڕەکی

بچووکیش لەنێوان ئەو دووانەدا هەبوون، گەڕەکی (چاڵە ڕۆحێ)، (ئەلیاسەفرە). منداڵیش دڕندەیی خۆی هەیە، یان هەر دڕندەیی نییەو دوایی دنیاو کلتووری جۆراوجۆریشم بینی لەناو ئەوانیشدا باوی هەیە، کە سەگ بەردەدەنە یەکترو باسی سەگی براوە لە مەجلیس و دیوەخاندا دەبێتە باسوخواس.

بەفر دەباری پێنجوێن دەبووە پارچەیەک لە زیو و بلوور، کوانوو گەرم دەبوو، قسەوباس دەکراو چیرۆک و گۆرانی ئاسمانی بێ ئەستێرەی دەدرەوشاندەوە، منداڵ دەبووە چەپڵەڕێزانیان و خۆشنوود دەبوون و باسوخواسی سەگی ئازا، سەگی داماوی کەلەپاچەکراوی دەشاردەوە.

سەگێک هەبوو (کوڵە)یان پێدەوت، لە سەردەمی منداڵی و مێردمنداڵی مندا، وای لێهاتبوو وەک ئەفسانە چیرۆکەکانی کۆڕی دیوەخانی گەرم دەکردەوە.

منداڵیم لە پێنجوێن و زۆرێکیش لە مێردمنداڵیم ڕازاوەترین سەربووردەی ڕۆژەکانی ژیانمن. دوای ئەوە چی نەما لە جوانیی ژیان نەیبینم، چی نەما لە خۆشنوودیی بەدەستی نەهێنم، چی نەما لە وێنەی پێنج هەزار وێنەی پایتەختی درەوشاوەی دنیا نەکەوێتە بەرچاوم، بەڵام ئێستا کە سینەمای چاوانم دەیەوێت ڕاووشکاری جوانی بکات،

بولێڵ و نابینام و هیچ نابینم و ئەوەی دەدرەوشێتەوەو دەیبینم، پێنج وێنەو پێنج هەزار وێنەکەی پێنجوێنە دەیبینم!

٤- من کە لە بەرەی سۆفییەکان بووم.

پێنجوێنییەکان ببوون بە دوو بەشەوە. بەشێکیان لایەنگری (شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان)و بەشەکەی تریان سۆفی (شێخ عوسمانی بیارە) بوون.

لە هاویندا شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان لە کەرکوکەوە بنەو بارگەی دەپێچایەوەو دەهاتە پێنجوێن و لە دەشتی (بوبیان) دەگیرسایەوە. ئەمە هاوینەهەواری ئەوان بوو. بەجۆرێکیش کەشوهەوای سازگاری ئەوێیان بە دڵدا چووبوو، زەویوزاری ناوچەکەیان لە خەڵکەکەی کڕیبووەوەو دواتریش گوندەکان بوون بە موڵکی خۆیان.

زۆربەی (بەرکێوییەکان) دەروێشی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزان بوون، ئێمە کە خەڵکی گەڕەکی (بەری کەناو) بووین، زۆربەمان سۆفی بووین، خۆمان بە شوێنکەوتەی (شێخ عوسمانی بیارە) دەزانی. شێخ عوسمان هاوینان لە بیارەوە کە هەواری دەگواستەوە بۆ پێنجوێن، لە مزگەوتی (پاشا) لایدەدا. ئیتر مزگەوت دەخرۆشاو بەو دەوروبەرەدا سۆفی پێکیاندا دەداو خەڵک بۆ زیارەت و تەبەڕک و

مرازحاسڵکردن و دوعـاو نزا، ڕوویـان لە شێخ دەکـردو دەوروبــەری مزگەوت بە جارێک قەرەباڵغ و میچکوت دەبوو.

ئەم چیرۆکی دابەشبوونە بەسەر (دەروێش)و (سۆفی) دا، چیرۆکی ململانێی نێوان هەردوو گەڕەکی (بەری کەناو) و (بەری بناو)و ململانێی هەردوو بنەماڵەی (بارام)و (مخە) ی ئەو زەمانەی پێنجوێن، بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی بایەخدار دەبێت بۆ کەسێک بییەوێت لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لێکۆڵینەوە لە پێکهاتەی ئەو ڕۆژگارەی شارەکە بکات.

٥- شەڕە تێڵا.

ململانێیەکی توونـد لەنێوان بنەماڵەی (بارام)و بنەماڵەی (مخە)دا هەبوو، دیاربوو ئەمە ڕەگوڕیشەی خۆی هەبوو. ئەم جۆرە ململانێیە بۆ ئەو زەمانەی ئەوسای پێنجوێن و شوێنەکانی تری کوردستان، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەچاو ئێستادا دواکەوتوو بوون، دیاردەیەکی ئاساییە. ئەوەی ئاسایی نییەو لەبەرچاوی منداڵیم لاناچێت، ئەوەیە کاتێکت دەزانــی لەناو بــازاڕی پێنجوێندا ژن و پیاو و گەورەو منداڵ بە چەقۆو بێڵ و داس و تێڵا بەردەبوونە یەکتری و وەک گێژەڵووکە بەیەکدا دەهاتن و یەکتریان

تێلاترێن دەکردو سەروپۆتەلاکی یەکتریان دەشکاند. ئەگەر پۆلیس نەکەوتایەتە بەینیانەوەو بلاوەی پێ نەکردنایە، هەر بەجارێ یەکتریان دەبڕاندەوە! لەو نێوەندەدا مشکی و کلاو و جامانە دەکەوتنە قورەوە، سەروپۆتەلاک دادەگیرایە خوارەوەو کەواو کراس دەدڕان و فەقیانە دەپچڕان و بێهودە خوێن دەڕژا.

خەڵکی پێنجوێن بە سروشتی خۆیان سادەو ساکارو بێوەی و میواندۆست بوون. وەک هەموو کوردێکیش میهرەبان بوون، بەلام ئەوەی کە لە بیرەوەریی ئەو سەردەمەمدا ماوەتەوە، تەنها ئەم شەڕە تێلایەی نێوان بنەماڵەی (بارام)و (مخە)یە، تۆزێک وێنەکە ناشیرین دەکات.

ململانێش لەنێوان گەڕەکی (بەرکێو)و گەڕەکی (بەری کەناو)دا هەبوو، بەلام ئەمیان شەڕو شۆڕو شەڕە تێلا نەبوو. بە پێوەری خۆی و تاڕادەیەکیش بە پێوەری ئەو زەمانە بێت، دەشێت بڵێین بۆنی پێشکەوتنیشی لێدەهات.

٦- بیجامە.

ماڵی ئێمە لە (بەری کەناو) بوو. بەهۆی ئەوەی کە گەڕەکەکەمان لە ناوەڕاستی شارو بازاڕەوە نزیک بوو، گەنج و کوڕوکاڵ لە (بەرکێوییەکان)، ئیرەییان پێ دەبردین.

لەڕووی گوزەرانیشەوە خەڵکی گەڕەکی ئێمە لەوان باشتر بوون، ئەمە تۆزێک جیاوازی دروستکردبوو.

تەرمینالی سەرەکی شاریش لە بەری ئێمە بوو. کە خەڵک لە سلێمانییەوە دەهاتن، لە بازاڕ دادەبەزین و دەچوونە چایخانەکان، زوو لەگەڵ کوڕانی گەڕەکی ئێمە تێکەڵ دەبوون و دەکەوتنە گفتوگۆ.

بێگومان ئەودەمە ماشێن کەم بوون، زۆربەی ئەوانەش کە لە سلێمانییەوە دەهاتن بە مەبەستی گەشتوگوزارو سەیران و سەفا، ڕوویان لە پێنجوێن دەکرد.

لە هەموو شتێکدا لەنێوان ئێمەو بەرکێوییەکاندا کێبڕکێیەک پەیدا ببوو، منداڵی بەری ئێمە زۆرتریان مەکتەبلی بوون و بە پێوەری ئەو زەمانە خەڵکەکەی ئامادەتر بوون بۆ کرانەوە بەسەر گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا.

ئێمە خۆمان لە بەرکێوییەکان بە شارستانیتر دەزانی، لەوەشدا ئەوان زۆرجار تانەو تەشەریان لێدەداین و گاڵتەیان پێدەکردین، بەو حسابەی کە ئێمە جیاواز لە نەریتی باوی کۆمەڵایەتی و وەک شارنشین هەڵسوکەوت دەکەین. خەڵکی ئەودەمە جلی کوردی و شەرواڵ و مراخانییان لەبەر دەکرد، بیرمە جارێکیان هێندێک لە بەرکێوییەکان تانەیان لە باوکم دابوو، کە گوایە برایەکم لە ماڵەوە بە جلی

ژنانەوە چووە بۆ مزگەوت! تومەس بیجامەی لەبەردا بووە، ئەوانیش کە لەوەوبەر جگە لە شەرواڵ و چۆغەو کەواو سەڵتە، ئەو جۆرە جلەیان نەبینیبوو، وایان زانیوە کە ئەوە جلی ژنانەیە!

## ٧- پیاوچاك و ساڵح.

باسی ململانێ و کێبڕکێ و ئیرەیی و شەڕە تێلام بۆ کردیت، بۆئەوەی نەکەویتە سەر ئەو خەیاڵەی کە مەبەستمە هەمووشتەکانی ڕابردوو بە خراپ بژمێرم، دەمەوێت باس لە یادگارییەکی جوانی منداڵیش بکەم. ئەوەی کە یەکێکە لەوانەی لەدوای بەسەربردنی چیرۆکی ژیانم، هەرچەند نموونەی هاوشێوەیم هاتبێتەوە بەرچاو، مەلی خەیاڵم بە شاباڵی خۆی فڕیوەو بردوومیەتیەوە بۆ کونج و کەللەبەرێک کە لە منداڵیمدایە.

جاران وەک ئەم ڕۆژگارە دینداریی و خواناسی و موسوڵمانییەتی نەببووە کاڵای سیاسی و بەهای ڕۆحی چاکەخوازیی و میهرەبانی هەبوو.

ئەودەمەی منداڵیی من لە پێنجوێن، وەک ئێستا ئوتێل و شوێنی گلدانەوەی ڕێبوارو موسافیر نەبوو. شارۆچکەکەش لەبەرئەوەی دەکەوتە نێوان دوو وڵاتەوە، خەڵکێکی زۆری

غەریبەو غەوارەو دێوانە پێیدا دەپەڕینەوە.

(حاجی سالّح)ێک هەبوو هەر بە هەق پیاوچاک بوو، (حاجی سالّحی فەرزالّی)یان پێدەوت، ئێواران دەچووە مزگەوتەکان، مزگەوت بە مزگەوت دەگەڕا، چی بێ نەواو بێ دەرەتان و غەوارەیە، دەیدۆزینەوەو کۆی دەکردنەوە، نەدەسرەوت هەتا بەدەستی خۆی خواردنیان بۆ پەیدا نەکات و تێریان نەکات، هەروەها دالّدەیان نەدات و شوێنی خەوتنیان بۆ دابین نەکات و نەیان حەوێنێتەوە.

حاجی سالّح هەر بەوەوە نەدەوەستا، کە بە تەنگ مرۆڤەکانەوە بێت، خەمی گیانلەبەرو ئاژەڵیشی بوو، بەتایبەت زستانان کە دەبووە بەفرو کڕێوەو تووش و سەرماوسۆڵە، بۆ پەلەوەرو ئاژەڵ و بالّدار سەخت بوو شتێکیان دەستبکەوێت و خۆیانی پێ تێر بکەن، ئەو دەکەوتە خۆی و وەک ئەوەی ئەرکی سەرشانی بێت، دانەوێڵەو وردەنان و ئالیک و پاشماوەی خۆراکی کۆ دەکردەوە، بگرە لە بەرک و گیرفانی خۆی پارەی بۆ تێرکردنیان خەرج دەکرد.

لەو سالّانەی دواییدا کە منیش بە شوێن خەونەکەوە چوومە دەرەوەی ولّات، هەرجارێک لە ئۆروپا خەڵکم دەبینی بە تەنگ ئاژەڵ و گیانلەبەرەوەن و بە نیانی مامەڵەیان

لەگەڵدا دەکەن، وێنەی حاجی ساڵحی پێنجوێنەکەی خۆمان دەهاتەوە بەرچاو. نەمدەتوانی لە ناخی دڵمدا سەد جار ئافەرینی لێ نەکەم و وەک نموونەی مرۆڤی جوان و میهرەبانی وڵاتی کوردەوارییی خۆمان یادی نەکەم.

هێندێک جاریش خەیاڵی ئەوەم دەکرد کە لەم زەمانەدا حاجی ساڵح بمایە، هەقی ئەوەی هەبوو بکرێتە سەرۆکی ڕێکخراوێک بۆ داڵدەدانی ڕێبوارو بێنەواکان، یان هەقی ئەوەی هەبوو ببێتە سەرۆکی ڕێکخراوی دۆستانی ئاژەڵ.

یادیان بەخێر پیاوی چاک و مرۆڤی چاک. هەر ئاین و بیروباوەڕێکیان هەبێت لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەدا هەن و هەبن، یادیان بەخێرو حاجی ساڵح-یش کە لە پیاوچاکان بوو، سەد هەزار جار یادی بەخێر.

٨- ماڵە باوان.

وا ڕێکەوت لە ژیانمدا زۆر شوێن بکەم. لە زۆر شوێن و خانوودا نیشتەجێ بم، لە خانووی گەورەو بچووکدا بگیرسێمەوەو ڕۆژو شەو بەڕێ بکەم. بە بێداریی ئەستێرە بژمێرم و بە خەوتوویی لەو شوێنانەدا بچمە خەوی قووڵەوەو ئەستێرە نەمخوێننەوەو هەر حسابی بوون و نەبوونیشم بۆ نەکەن.

لە پێنجوێن زۆر شوێنم گۆڕی، لە گوندو ئەشکەوت و لێرەوارو زۆزان، لە شار، لە کۆلانی تەسک و شەقامی بەرینی شار. لە سلێمانی، هەولێر، بەغدا، ئۆروپا، بەرلین و شارانی تری درەوشاوەی دنیا ڕۆژم بەڕێکردو شەوم لاواندەوە، شیعرم نووسی و دەرگیری سیاسەت بووم و بووم بە دەرباری خەونەکەمەوە.

شەرابم نۆشی، ژنم ناسی، سەمام کردو بەتاڵ بوومەوە، خۆشترین بۆنم هەڵمژی و ڕقم لە خۆم بوو، لەگەڵ خۆم ئاشتبوومەوە، ڕۆژان دێت و دەڕوات، وەک چۆن مەل و باڵدار گەرمیان و کوێستان دەکەن، منیش هاتم و چووم. قەدەرم بوو نەسرەوم و سرەوتن تەنها ئەوە بێت هەرجارەو لە شوێنێک بگیرسێمەوە.

من لە ژیانی خۆمدا زۆرجار ماڵم بینی، ماڵی گەرم، جیاواز لە کۆشک و تەلارو خانوو، بەلام ماڵی گەرمم بینیبێت، ماڵم بینیبێت پڕ بووبێت لە میهرەبانی، لە بۆنی خواردن و چێشت، لە بۆنی سمڵ و زاخ، لە بۆنی مێخەک و وەنەوشەو لالەزار، هەر ئەو ماڵە بوو کە دایکم و باوکم بۆ ئێمەیان چێ کردبوو.

لێمگەڕێن با تۆزێک باسی ئەو ماڵەتان بۆ بکەم...

لەو سەردەمەدا ماڵی ئێمە زۆر ئاوەدان بوو، دیوەخانمان هەبوو، باوکم بە هەق و حساب لە هەرە دەوڵەمەندەکانی پێنجوێن بوو، بازرگان و گەورە تووجارباشی شار بوو، کەس نەبوو تەلەفۆنی هەبێت، ئێمە تەلەفۆنمان هەبوو.

تۆ لەو ڕۆژگارەدا زەنگت لێبدایە، ئێمە یان دووەم، یان سێیەمین ژمارەی شارەکە بووین کە وەڵاممان دەدایەوە، بیرم چۆتەوەو نازانم دوو بوو، یان سێ؟!

من و باوکم پەیوەندییەکی سەیرمان لەنێواندا هەبوو، ئەو هەمووماني خۆش دەویست. خوشک و برا، بەڵام متمانەی زۆری بە من هەبوو، منیش زۆر هۆگری ئەو بووم. ئێمە شەش برا بووین، باوکم منی زۆر خۆش دەویست، بێگومان هەموانی خۆشدەویست. هەردوو برا گەورەکەم کاک مەحمودو کاک قادر، سەرەوکاری کاروباری بازرگانی باوکمیان دەکرد، لۆری گەورەی پڕئازووقە لە ئێرانەوە دەهاتنە عەمبارەکانی ئێمە، ئەوان پێیەوە خەریک دەبوون. بەرەو سلێمانی بەڕێیان دەکردن، بەڵام بۆ دەفتەرداریی و دوکانداریی، کارەکە بە من سپێردرابوو.

باوکم یەکەم کەس بوو قاسەی پارەی هێنایە پێنجوێنەوە، کلیلی قاسەکەشی دا بە من، وابزانم باوکم مەبەستی لەوە بوو کە بڕوابەخۆبوونێکی زۆر لە ناخمدا بچێنێت.

لەو زەمانەدا ماڵی ئێمە ئاوەدان بوو، بازرگان لە مەریوان و سنەو کرماشانەوە دەهاتنە ئەوێ. سیاسی و لێقەوماو و خەڵکی جۆراوجۆر ڕوویان تێدەکردین، هەبوون لە سنووری ئەودیوی نیشتمانەوە هاتبوون، هەبوون لە سنووری ئەمدیوی نیشتمانەوە بۆ ئەودیو دەچوون.

ماڵی باوکم دوو دەست بوو، یەکێکیان بۆ ژیانی خۆمان بوو، ئەوی تریشیان بۆ میوانخانەو دیوەخان بوو، دیوەخانەکە بۆ کەسایەتیی سیاسی و بازرگانە گەورەکان بوو، میوانخانەکەش بۆ ئەوانە بووە کە ڕێیان دەکەوتە لامان و شەو دەمانەوە. لەبیرمە لە دیوەخانەکەدا دەستشۆرو حەمامی گەرموگوڕ هەبوو، کە ئەودەمە دارگوێزیان دەخستە ژێر بەرمیلێکی گەورەوەو گڕیان دەداو گەرمیان دەکرد، ئاوی گەرم بەوجۆرە پەیدا دەبوو.

بیرمە لەو میوانخانەیەدا قەرەوێڵە هەبوو، سابوونی بۆنخۆش و ماجون و فڵچەی ددان شتن و شانەی قژداهێنان هەبوو. ئەمانە بۆ ئەودەمەی پێنجوێن وەک خزمەتگوزاریی ئەم زەمانەی ئۆتێلی پێنج ئەستێرە بوو. خەڵکی سەیروسەمەرە ڕوویان لەم دیوەخان و میوانخانەیەی باوکم دەکردو هێندێک جار هەر نەتدەزانی کێن و بەدوای چییەوە پەڕیونەتە ئەم شوێنە!

لەوانەی بیرم بێت، کەسانێکی سەردەمی ڕووخانی حوکمی (موسەدەق) بوون لە ئێران. هەبوون (حزبی تودە)و هەبوون (دیموکرات) بوون. ئینجا لە مەجلیسی هەموو ئەمانەدا من منداڵێک بووم گوێم بۆ فێربوون هەڵدەخست، جا وەرەو گوێت بنێ بە دەمی قەرەباڵخی ئەو ڕۆژگارەوەو ببیستە!

شیعری حافز، سەعدی و نالی، شیعری کوردی و فارسی ئاوێزان دەبوون، لەو زەمانەوە زۆرم لە بەرگەوە بۆ بەرگ لەبەرکردو ئێستا کە بیرم نەماوە خەتای هیچ نییەو دەردە پیرییە.

سەیرە، ئەوە بوو دواتر لە ئۆروپا هێندێکم لەوانە بینییەوە کە پەڕی ڕۆژگار گەیاندبوونییە ئەو نیشتمانە بچکۆلەیەی ئێمەو ئەو دیوەخانەی کە باسمکرد. خەڵک تێی دەڕژان و گەلێکیش سەرسام و سوپاسگوزار بوون، کە چۆن لەو زەمانەداو لە پێنجوێن باوکم داڵدەی داون.

## ٩- بازرگانی و سیاسەت و نابووتی!

بازرگانیی باوکم لەنێوان ئێراق و ئێراندا بوو. ئێراق و ئێران هەر بەزۆرو زەبر سنووریان بۆ دروستکراوە، ئەگینا ئەوەی دەکرێت ناوی بنێین (قاچاخ)، خۆی بە تەنها ئەوە یاساییە.

ساڵی (١٩٩٠) ئێراق پەلاماری کوەیتی داو بەهۆی ئەوەوە شەش دەری لێگیراو تەوق درا.

یەکێک لە ستراتیجییەتەکانی دەوڵەتی ئێراق، وەبەرهێنان بوو لە قاچاخچێتیدا. دەوڵەتی ئێراق کەوتە مامەڵە لەگەڵ قاچاخچییەکاندا و پسوڵەی بۆ کردن تا چییان پێدەکرێت بیکەن و کاڵاو کەلوپەل لە دیوی ئێرانەوە بهێنن بۆ دیوی ئێراق.

هەندێک جار بەربادیی خۆی دەبێت بە سیستم، ئەمە هەردەم بۆ بازرگانی لە پێنجوێن ڕاست بووە. بەو شێوەیەش قاچاخچێتی سیستمێکی بازرگانی بووە.

پێموابێت ساڵی (١٩٥٥)، یان (١٩٥٦) بوو، وشکەساڵی و قاتوقڕیی بوو، باوکم گەنمێکی زۆری کڕیبوو و عەمباری کردبوو، بازرگان لە سلێمانی و کەرکوکەوە بۆ گەنم کڕین ڕوویان تێکردین، بەڵام خەڵکەکە ناڕازی بوون، نەیاندەویست گەنم لە پێنجوێن بچێتە دەرەوە، بۆیە گردبوونەوەو گەلەکۆمەکییان کرد، وەخت بوو پەلاماری عەمبارەکانی گەنم بدەن، باش بوو (مودیر ناحیە) کە سوڵتانی ئەو زەمانەی پێنجوێن بوو، کەوتە بەینەوە، ئیتر باوکیشم بڕیاری دا گەنم بە بازرگانەکان نەفرۆشێت و گەنمەکە لە پێنجوێن بمێنێتەوە. لەو سەروبەندەشدا بڕێکی

گەنمەکەی بەسەر فەقیرو هەژاراندا دابەشکردو ئەوەشی کە مایەوە، پاش گومرگکردن، حکومەت خۆی مامەڵەی پێوەکرد.

عەمبارەکانی باوکم بەهۆی نزیکیی پێنجوێن لە ئێرانەوە، هەمیشە پڕبوون لە ڕزق و ڕۆزی وەک قەیسی و کشمیش و گوێزو بادام، جگەلەوەش ئەو لە پاییزاندا تووتنی لە جووتیارەکان دەکڕییەوەو بە بازرگانەکانی سلێمانی و بەغداو کەرکوکی دەفرۆشتەوە.

مەحمودی براگەورەم (پارتی) بوو. سەر بە جەماعەتی (هەمزە عەبدوڵلا) بوو، لەوانەی پێیان دەوتن (جەناحی تەقەدومی)، ئەمانە چەپڕەو بوون، خۆیان بە باڵێکی پێشکەوتووخوازی پارتی دەزانی. لە سەردەمی (عومەر عەلی)دا، کە (موتەسەریف)ی سلێمانی بوو، مەحمودی برام بە تۆمەتی سیاسی دەستگیرکرا.

گلۆڵەمان کەوتە لێژیی و حکومەت دەستی گرت بەسەر عەمبارەکانی باوکمداو بازاڕمان لەبرەو کەوت و بازرگانییەکەمان بە جۆرێک کز بوو، دەتوانم بڵێم هەر بە جارێک ئیفلاس بووین و نابووت کەوتین.

١٠- حوجرەکەی مەلا عارف.

ئەوسا هێشتا خوێندنی ئاینی باو بوو، ئەوی بیویستایە منداڵەکەی ڕێگای فێربوون بگرێتەبەر، دەبوو لە حوجرەوە دەست پێ بکات.

من بەرلەوەی بخرێمە حوجرە، دەمزانی (مەلا عارف) دراوسێمانەو ناوبانگیشیم بیستبوو، کەپیاوێکی ئاینی بەویقارو زانایەو بە چاوی خۆشم بینیبووم چۆن ئێواران فەقیەکان بە ماڵاندا دەگەڕان و داوای (ڕاتیبەی فەقێ)یان دەکرد.

ماڵی ئێمە لەبەرئەوەی بازرگان و دەستڕۆیشتوو بووین، هەمیشە کە فەقیەکان دەهاتنە پێش دەرگا، مەنجەڵمان بۆ پڕ دەکردن. لە گوێی منداڵیمدا ئاوازی داواکاری فەقیەکان دەزرنگێتەوە، کە هەمیشە بە هاوارێک دەستیان پێدەکردو دەیانوت:

خەڵکینە ڕەحمەتی خواتان لێبێت...

حوجرەکەی مەلا عارف لە (مزگەوتی پادشا) بوو، کە لە ماڵی خۆمانەوە نزیک بوو، من لەوێ نرامە بەر خوێندنی ئاینی و فەقیەکانی مەلا عارف دەرسیان پێ دەوتم. دوو ساڵی تەمەنی منداڵیم لە حوجرە بەسەربرد، لەوێ فێری نوێژو سەلاوات و قورئانناسی بووم و زۆر لە بنەما سەرەتاییەکانی ئاین و خواناسی فێربووم.

ئەوساو وابزانم ئێستاش هەروایە، فەقیەکان بۆئەوەی ئێمە لەسەر ناسینی ئەلف و بێ و پیتەکان ڕابهێنن، بە ئاوازو بالۆرەیەکەوە وانەکان دەڵێنەوە، کە بەجۆرێکە گوێچکەی فێرخواز لەگەڵ دەنگ و ناسینەوەی پیتەکاندا ڕابێت.

ئەوەی یادگاریی زەمانی حوجرەم بێت و ئێستا بێتەوە یادم و جارجارەش بزەیەک بخاتە سەر لێوم، ئەوەبوو یەکێک لە هاوڕێکانم بە هیچ شێوەیەک فێری ئەوە نەدەبوو بڵێت: (قول ئەعوزو برەب ئەلفەلەق)و لێی ببوو بە کۆڵی شێرو وەک ئەوەی زمانی بەسترابێت، هەرچەند پێیان دووبارە دەکردەوە، نەدەهاتە سەر زمانی و دەیوت: (قول وەقوزو...)، هەرچەند هەوڵیان لەگەڵ دەدا، سودی نەبوو، تا لە ئاخریداو بیرمە پاییزێکی ساردیش بوو کە لە حەوزی مزگەوتی پادشایان هەڵکێشا و وەخت بوو لە سەرمانا ڕەقیتە بێت، ئیتر بەدەم جنێودان و بە دانەچوڕکێوە مزگەوت و حوجرەی بەجێهێشت و نەگەڕایەوەو وازی لە خوێندن هێناو بوو بە سەربازو دوایی بوو بە عەریف!

١١- نەبووم بە قوتابی، بووم بە خەیات!

کە دوو ساڵی خوێندنی حوجرەم تەواوکرد، تەمەنم هەر حەوت هەشت ساڵێک دەبوو. بەیانییەک براگەورەکەم

تەسکەرەکەمی لە باوکم وەرگرت و پەلی گرتم و بردمی بۆ قوتابخانە.

کاکە (حەمەی فەڕاش) کە خزمی خۆشمان بوو، وا دەردەکەوت کە حاکمی قوتابخانەکە بێت. هەر لە دوورەوە بە دەنگێکی بەرز بەسەر براگەورەکەمدا نەڕاندی و وتی: "ئەم تولفەت بۆچی هێناوە؟!"

کاکم وتی: "هێناومە تا ئەمساڵ وەکو گوێگر لە قوتابخانە بێت تا ساڵێکی تر، وەک قوتابی داخلی بکەم".

کاکە حەمەی فەڕاش قوشقی بوو و ناوچەوانی ئاگری کردەوەو، وەک ئەوەی زمانی حاڵی بڵێت: ئەوە کاری نەکردەیە، تێی خوڕین و بە دەرکردن دەریکردین.

بەلوشکەلوشک و هوڕو گریان گەڕامەوە ماڵەوە، نازانی ئەوە چەند ئازاری دام و چەند جار دڵی منداڵیمی بریندارکرد! ئێستاش کە بەلای قوتابخانەکاندا تێدەپەڕم و بەم باری تەمەنەوە، بە قورسی پێیەکانم لەدوای یەک هەڵدەگرم و شەقاو دەنێم و سروودی منداڵانی قوتابخانەم گوێ لێ دەبێت، بیرەوەریم دەمباتەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی کە دەمبینی منداڵان دەچن بۆ قوتابخانەو بەیانیان لە حەوشەی قوتابخانەکەی پێنجوێندا ڕیز دەبن و سروودی نیشتمانی دەچڕن و ئەو کێوانە دەلاوێننەوە.

زۆرم حەسرەت هەڵکێشا کە نەمتوانی وەک ئەو مندالانە منیش بچمە قوتابخانە. ئەوەی سەبووریمە، ئەوەیە کە دەڵێم: بەری ڕەنجی مامۆستا نیشتمانپەروەرەکانی زەمانی منداڵیمە، کە منداڵیان بە کوردایەتییەکی وا گۆش کرد، ئێستا لەژێر ئالای شەکاوەی کوردستاندا هەموو بەیانییەک وەک مارشێکی موقەدەس بە یەک دەنگ یەکتر بلاوێنن و سروودی (ئەی ڕەقیب) بۆ یەکتر بسەننەوە.

باوکم پیاوێکی دنیادیدە بوو، کە زانی بەختم چرووکی کردووە لەوەدا کە ببەمە قوتابی، وتی: "پێویستە فێری پیشەیەک بیت". ئیتر ئەوەبوو ناردمییە لای یەکێک لە خەیاتەکانی ئەو سەردەمەی پێنجوێن و بووم بە شاگردی خەیات.

باوکم زۆر لایەنگری ئەوەبوو کە ببمە قوتابی و بخوێنم، بەلام دیاربوو لە خەیاڵی خۆیدا وای دانابوو کە ئەگەر نەشتوانم بخوێنم، باشتر وایە فێری پیشەیەک ببم و لە کوردەکەی هەردوو جەژن نەبم.

ئەو دەیوت: "خوێندن سودی زۆرەو دەرگای هۆش و ئەقڵ و خواناسی بەڕووی مرۆڤدا ئاوەلا دەکاتەوە، بەلام مرۆڤ هەر پیشەیەکیشی هەبێت باشە". دایمە دووبارەی دەکردەوە، "ئەگەر پیشەیەکت هەبێت، وەک ئەوە وایە

بازنی زێڕینت لەدەستدا بێت و کەی پێویستت بوو، زێڕەکە بفرۆشیت".

ڕۆژگـــار هـــات و ڕۆیـشـت مـن کـە گـــەورە بـــووم لە دنیادیدەییەکەی باوکم تێگەیشتم، دەڵێن سوڵتانەکانی عوسمانی ســـەرەڕای ئـــەوەی منداڵەکانیان لە کۆشک و تەلاردا پەروەردە کردووە، بەڵام هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوەشیان کردوون پیشەیەک فێربن و تیایدا شارەزابن. دوایـی خوێندمەوە کە چۆن هێندێک لەوانە زێڕەنگەرو پیشەوەریی وا دەستڕەنگینیان لێ دەرچووە، کە دەستکردی خۆیان بە دەوڵەت فرۆشتۆتەوە.

ڕاستییەکەی منیش لە سایەی دووربینییەکەی باوکمەوە لە بەچکە شاگردێکی خـەیاتـەوە، بـووم بە وەستایەکی دەستڕەنگین. وام لێهات دەزگـای جل دوورینم دانـاو لەماڵەوە شـــەڕواڵ و مراخانی و کـەواو کـراس و دەرپێی ژنانیشم دەدووری.

١٢- نەمردم و بووشم بە قوتابی!

(پیرەمێرد)ی فەیلەسوفی خۆمان وتوویەتی: "ئەگەر ئارام بگریت، لە بەرسیلە، حەڵوا دروست دەکەیت".

شـــەوانـی بـێ ئەستێرەو ڕۆژانـــی درێـــژو دووبـــارەم

بەدیار چرکەچرکی مەکینەی خەیاتییەوە بەسەربرد، شان و قۆڵی زۆرم کوتاو زۆری ڕووتم پۆشتەو پەرداخ کرد. خواوڕاستان چەرخی مەکینەی خەیاتییەکەم لەگەڵ چەرخی ڕۆژگاردا خولانەوەو لە پێنجوێن قوتابخانەی شەو کرایەوە. وەک وتم، باوکم بازرگان و دەستڕۆیشتووی زەمانی خۆی بوو، کۆڕو دیوەخانی گەرم بوو، دوکانەکەی ئێواران جمەی دەهات، پیاوی دەوڵەت و پایەدارو سەرداری پۆلیس و مودیر ناحیەو مەئمورو مامۆستا لەلای باوکم کۆدەبوونەوە، ئەویش لەبەرئەوەی ئیشوکاری بڕوات، ساڵی چەند جارێک زیافەتی دەکردو هەموانی لەسەر سفرەو خوانی ئاوەدان کۆدەکردەوە.

لە یەکێک لەو زیافەتانەدا، یادی بەخێر جارێکیان مامۆستا (حەسەن ڕەشید یارە) وتی: "ئەری بەڕاست ڕۆڵە تۆ بۆ نایەیت دەستبکەیت بە خوێندن، تۆ بەم جوانییەوە بۆ بە خەیاتییەوە گەنجیت بەبا دەدەیت؟"

وتم: "مامۆستا باوکم ناهێڵێت". وتی: "باوکت لێگەڕێ بۆ من، خۆم قایلی دەکەم". کاری ڕاست بێت مامۆستا حەسەن باوکمی قایل کردبوو، کە بچمە بەر خوێندن و لە قوتابخانەی شەو دەست بە خوێندن بکەم.

مامۆستا وتی: "بەیانی وەرە بۆ قوتابخانە

تاقیکردنەوەیەکت پێدەکەین، بزانین تواناو زیرەکیت بایی ئەوەیە بتخەینە چ پۆلێک؟"

ڕۆژی تاقیکردنەوەکەم زۆر دەترسام، بەڵام باوەڕیشم بە خۆم بوو لە ماوەی منداڵی و حوجرەو دوای ئەوەش، هەستم دەکرد کە من لە منداڵی تر جیاوازم و دەبێت زیاتر خۆم فێر بکەم. لە تاقیکردنەوەدا دەرچووم و بووم بە قوتابی قوتابخانەی شەو.

ساڵێک لەوێ بەپەرۆشییەوە قوتابییەکی چست و چالاک بووم، تا وام لێهات بە تاقیکردنەوەیەک بایی ئەوە زانست و زانیاریم پێبێت، بمخەنە پۆلی چواری قوتابخانەی ڕۆژ. تازە چووبوومە پۆلی چوار، مامۆستایەکی موسڵاویمان هەبوو، هەرچەند دەیهێناو دەیبرد ئەقڵی نەیدەگرت کە چۆن من تەنها ساڵێک لە قوتابخانەی شەو خوێندوومەو ئێستا خراومەتە پۆلی چوار. هێندێک پرسیاری لێکردم، ئازا وەڵامم دایەوە، وتی: "هەستە سەر تەختەڕەش و بە عەرەبی بۆم بنووسە هائولاء". هەستامە سەر تەختەو ڕاستییەکەی خەریک بوو تێبکەوم و هەڵەیەک بکەم، لەو کاتەدا (عومەر)و (ئەحمەد) کە هاوپۆلم بوون و ئێستا دوو مامۆستای دڵسۆزیان لێدەرچووەو هەر پایەداربن لە ژیاندا ماون، فریام کەوتن، بەڕاستی بۆم نووسی (هائولاء).

مامۆستا موسڵاوییەکەم زۆری بەدڵ بوو، قەناعەتی کرد کە شایستەی ئەوەم قوتابی پۆلی چوار بم. لەڕاستیدا من خۆم ئەوەم زۆر لەسەر دڵ گران بوو، کە لەو مەسەلەی نووسینی (هائولاء)ەدا عومەرو ئەحمەد فریام کەوتن، بەڵام کە پۆلی چوارەمم تەواو کردو پلەی یەکەمینم بەدەستهێنا، دەستخۆشی و ئافەرینێکی گەورەشم لە خۆم کرد، کە پیاوانە کارەکەم ڕاپەڕاندووە. تۆزێک هەر گومانم لە زیرەکیی خۆم هەبوو، بەڵام هەرئەوەندە بوو لە پۆلی چوارەوە بۆ پۆلی پێنج لە پلەی یەکەمیدا بم، لە پۆلی پێنجەوە بۆ شەشیش هەر لە پلەی یەکەمیندا مامەوە. ئینجا ئیتر ئەمجارەیان هەر تەواو باوەڕم بە خۆم پەیدا کردو بە خۆمم وت، کوڕە نەک جارێک ئافەرین، سەد جار ئافەرین.

## ١٣- هەرزەکاریی و شیوعی!

لەو سەردەمەی کە هەرزەکاریی من بوو، ببوومە قوتابی، دەورانی حزبایەتی (پارتی)و (شیوعی) بوو، براگەورەکەم پارتی بوو، بەڵام سەر بە (جەناحی تەقەدومی) بوو، خزمێکیشمان هەبوو پارتی بوو و لایەنگری تەقەدومی بوو ناوی (حەمەی ڕەشە بەحری) بوو، کوڕێکی زۆر ژیکەڵەو خوێندەوار بوو، تەنانەت سەروسەودای ئەدەبیات و چیرۆک

نووسینیشی هەبوو، لە گۆڤاری (هەتاو)دا دەینووسی، کە (گیو موکریانی) دەریدەکرد. هێندێک بڵاوکراوەم لەو وەردەگرت، بیرمە جارێکیان لە سلێمانی بووم ناردمیانە لای تێکۆشەری بەنامێ (نوری ئەحمەدی تەها)، وابزانم ئەو سەردەمە دوکانی وەکالەتی ڕادیۆو شتی وای هەبوو، وشەیەکی نهێنییان پێوتبووم، کۆمەڵێ شتی دامێ و منیش هێنامەوە بۆ پێنجوێن و تەسلیمی (حەمەی ڕەشە بەحری)م کرد.

دوای ئەوە خۆم دەچووم بۆ لای (حەمە). باوکێ دوکانی هێلکە فرۆشتنی هەبوو، وتی: "برۆ پێنج دینار بخە سەبەتەی هێلکەکەوەو بڵاوکراوەیەکی تێدایە هەڵی بگرە". پێنج دیناری ئەو زەمانە زۆر بوو، بەڵام من لە خۆشی بڵاوکراوەکە باکم بە پارەکە نەبوو، بێگومان پێنج دینارەکە بۆ باربۆو کۆمەکی حزب بوو، لەناو سەبەتەی هێلکەدا ڕۆژنامەی (خەبات)ی نهێنیم دەهێناو بۆ قوتابییەکانی هاوڕێم دەخوێندەوە. لە ڕۆژنامەکەدا وێنەی (مەلا مستەفای بارزانی) تێدا بوو بە جلوبەرگی جەنەڕاڵییەوە، پیشانی هاوڕێکانم دەداو بابەتەکانم بۆ دەخوێندنەوەو ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە سەیری منیان دەکرد، کە چۆن ئەم شتانەم دەستدەکەوێت.

من هەر لە کۆتایی پۆلی چوارو سەرەتای پۆلی پێنجەوە

دەرکەوتبووم کە هەرزەکارێکم سەرو سەودام لەگەڵ سیاسەتدا هەیە. بێگومان بۆ ئەو تەمەنەو بۆ منیش نادیاربوو هێڵە فکرییەکان جیا بکەمەوە، بەلاّم بە هەستەوەری خۆم کۆمەڵەیەکم دروست کردبوو بە ناوی (کۆمەڵەی کاوە)و زۆرێک لە قوتابییەکانم لە دەوری کۆکردبووەوە. زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەکە لایەنگری شیوعی بوون، بەلاّم هەشبوون کە لایەنگری پارتی بوون و نەبوون بە شیوعی، لەوانەش (بەکری حاجی سەفەر).

جا سەیر لەوەدا بوو لەو ڕۆژگارەدا قوتابی چوارو پێنج و شەش، وەک ئەوانەی ئەمڕۆ نەبوون و تەمەنیان گەورە بوو، هێندێکیان ڕیش و سمێڵیان هەبوو، هەشیان بوو ژن و منداڵیان هەبوو، کەچی هەموویان کەمەندکێشی ئەو ڕەفتارەی من ببوون، کە چۆن ئەو بلاّوکراوانەم دەهێناو بۆم دەخوێندنەوە.

گەیشتبوومە پۆلی شەش و ئەوەبوو کە شۆڕشی چواردەی تەمموز هەڵگیرساو کۆتایی بە دەسەلاّتی پادشایەتی هات و دەورانی (زەعیم عەبدولکەریم قاسم) هاتەئاراوەو دەرگای بەختی شیوعییەکان کرایەوە، من و ڕێکخراوەکەشم کەوتینە بەرەی شیوعییەکانەوە، ئەگەرچی خەڵکەکە زۆرینەیان هەر پارتی بوون.

١٤- بوومەلەرزەکەی پێنجوێن.

نیوەڕۆی ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٤٩) بوو. لە پێنجوێن بوو بە شین و ڕۆڕۆ. ئەودەمە پێنج شەش ساڵێک دەبووم. تومەز ئەوە ئەو ڕۆژە مێژووییەیە کە دواتر گەورە بووم، زانیم ڕووداوە گەورەکەیە کە بە (بوومەلەرزەکەی پێنجوێن) ناسرا.

وەکو ئێستا لەبیرمە کە چۆن خەڵک خرۆشابوون و بەیەکیاندا دەداو بە پەلەپروسکێ، لە بازاڕەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوەو ببوو بە گردەو بێنەیەک هەر مەپرسە.

بێگومان ئەو دەمە ڕەمەزان زۆر بە پیرۆزیی ڕادەگیرا، بەڵام برا گەورەکانم بەڕۆژو نەدەبوون و دایکم بە بێدەنگی نیوەڕوان خواردنی بۆ ئامادە دەکردن.

لەسەر نانخواردن بووین کە بوومەلەرزەکە ڕوویدا، ئیتر هەموو شت شێواو هەموان کەوتنە پەلەپروزکێ و کوڕ ئەو کوڕە بوو لە ماڵ بچێتە دەرەوە، کەس نەیدەوێرا لەناو ماڵدا بمێنێتەوە، چونکە زۆرماڵ لە بوومەلەرزەکەدا بەسەر خاوەنەکانیاندا ڕووخابوون و خەڵکێکی زۆریش لەژێر دارو پەردوودا فەوت بوون.

لە نزیکی گەڕەکی (بەری کەناو) مەزاری پیاوچاکێک هەبوو، پێیان دەوت (پیر یونس). دەوروبەری دارستانێکی

چڕ بوو، ئەوکاتەش هاوین بوو، خەڵکەکە هەموو لەو ناوە بڵاوەیان کرد. دەمەو ئێوارەش جارێکی تر بوومەلەرزەکە دووبارەبووەوە، بەڵام دوایی زانیمان کە ئەمەی ئێوارە، وەکو ئەوەی نیوەڕۆ زیانی لێنەکەوتوتەوە. جارێکی تر لە سەروەختی پارشێودا بوومەلەرزەیەکی تر ڕوویدا، ئەمەیان زیانی زۆری لێکەوتەوەو خانوو ڕووخاو خەڵکی تیادا مردو هەندێکیش برینداربوون. دوای ئەوەش چەند بوومەلەرزەیەکی تر ڕوویاندا، تا ئیتر وای لێهات خەڵکی پێنجوێن کەوتنە سەر ئەو خەیاڵەی بە جارێک شارەکە جێبهێڵن.

ماڵی ئێمەش کە زانیمان (پیر یونس) دادمان نادات و پیری بوومەلەرزە بەڕاستییەتی، بنکەو بارەگامان پێچایەوە بەرەو گوندی (ڕاوگان). پوورێکم خوشکی باوکم بوو، کە (پوورە خونچە)مان پێدەگوت، لە (ڕاوگان) بوو، ئیتر کەریان هێناو بارو بنەمان پێچایەوە بەرەو هەواری ڕاوگان.

دەڵێن منداڵ لە بەزمی خۆی ناکەوێت، ئەم قسەیە بۆ ئەو ڕۆژەی منیش ڕاست بوو. لەوکاتەدا کە خۆمان دەپێچایەوە بۆئەوەی بچین بەرەو ڕاوگان، کەرێکی کوڵکنیان هێناو من و عەبدوڵلای برام هەریەکەمانیان لەگەڵ کەلوپەلدا خستە بەرچنەیەکەوە. عەبدوڵلا لە من منداڵتر بوو، وەک ئەوەی

نە بامان دیبێت و نە باران و نە بوومەلەرزەش ڕوویدابێت، کەوتینە یاری و گەمان، ئەوەندە جوڵەجوڵمان کرد باری کەر پساو، هەردووکمان کەوتینە سەر زەوی!

دوای ئەوە خەڵک خۆی کەپرو کوچک و نوای بۆ خۆی دروستکرد، چونکە هاوین بوو، تۆزێک ئاسان بوو شوێنێک بۆ خۆت بدۆزیتەوە، ئینجا میری لە داروتەختە بەنگەڵەی دروستکرد.

دوای ئەوە چارەنووسی بوومەلەرزە بردینی بۆ سلێمانی. ئەو شوێنەی پێیان دەوت گومرگە سووتاو بوو بە پەناگەمان، ئەوە خانێکی گەورە بوو، دیاربوو زەمانی خۆی کاروانسەرا بووە. نزیکەی (٤٥) خێزانێک دەبوو، هەر خێزانەیان لە کایەو دوکانێکدا جێکردەوەو هەریەکە لەوانە بەلوعەی ئاوی تیابوو. ئاودەستی تیابوو. ژن بەجیاو پیاو بەجیا، سەرەیان دەگرت. لەچاو ئەو بارودۆخەدا، خراپ نەبوو، ئەگەر بەراوردی بکەیت بە لێقەومانی گەورەتر. بوومەلەرزەکەی پێنجوێن بۆ زەمانی منداڵیی من، یەکەمین لێقەومان و نەهامەتیی گەورە بوو.

ئێمە بیست شەوێک لەو کەمپەدا ماینەوە، کە ئەوە کە مپی کارەساتی سروشتی بوو، دوای ئەوە زۆرجار لە کەمپدا مامەوە، بەهۆی دەردەکوردەوە، ناسرووشتی ئەمانەی دوایی بوون!

١٥- گڵۆپ و کارەبا.

دوای ئـەوەی بیست شـەوێک لـە کـەمپـەکـەی کۆنە کاروانسـەرا ماینەوە، بنەو بارگەمان گواستەوەو هاتین بەرەو ناو شاری سلێمانی. جا تۆ نازانیت چۆن چەرخی ڕۆژگار دەورو دەفتەری خۆی دەنووسێتەوەو چی دەبێت بە بەخت و نسیب! ئێمە کە هاتین بۆ سلێمانی، بنەو بارگەمان کەوتە هەواری ماڵی (حاجی عەلی بەگ). ماڵی باوکی هونەرمەندی گەورەو گۆرانیبێژی پێشمەرگە کاکە (حەمە جەزا)و (کاک قادر)ی برای، کە دوایی پێشمەرگەو سەرکردەیەکی جوامێری لێدەرچوو.

(حاجی عەلی بەگ) ماڵیان لە گەڕەکی (کانی ئاسکان) بوو، لەگەڵ باوکمدا بەهۆی بازرگانییەوە دەمێک بوو سەرو سەوداو دۆستایەتییان هەبوو. لە ماڵی حاجی عەلی بەگ ژوورێکیان داینێ و نزیکەی سێ مانگێک لەوێ ماینەوە.

بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا کە گڵۆپی کارەبام بینی، لە ماڵی حاجی عەلی بەگ بوو. لام شتێکی سەیرو سەمەرە بوو، لەوەوبەر لە پێنجوێن جگە لە چراو لۆکس، هیچم نەبینیبوو، کە سەیری ڕووناکیی ئەو گڵۆپەم دەکرد، وەکو تەلیسم وابوو. لە ماڵەکەی حاجی عەلی-دا ئاودەستخانەیەکی پاکوتەمیزی شارییانەی تیابوو، زوو زوو دەچوومە ئەوێ هەر بۆئەوەی

دووگمەی گلۆپەکە هەڵبدەمەوەو دایبگیرسێنم. چەند جار لەسەریەک دووگمەکەم هەڵدەدایەوەو دام دەدایەوەو ئەو گلۆپ و کارەبایە بۆ خەیاڵی ئەو سەردەمی منداڵی من، شتێک بوو سەرم لێدەرنەدەکردو سەیروسەمەرە بوو!

جا هەر بەبۆنەی کارەباوە دەمەوێت باسی ئەوە بکەم، کە چۆن بوومەلەرزەکە بوو بە هۆکاری ئەوەی کارەبا بگاتە پێنجوێن. ئەو سەردەمە وەک ئێستا نەبوو و ڕووداوەکان کەم بوون، بۆیە ڕووداوی بوومەلەرزەکەی پێنجوێن زۆر دەنگیدایەوە، هەڵمەتێکی پیتاک کۆکردنەوەو باربۆ و کۆمەکی لێقەوماوانی پێنجوێن، لە سەرتاپای ئێراقدا دەستی پێکرد، وابزانم (سەعید قەزاز)، کە ئەودەمە ببووە وەزیری ناوخۆ، ڕۆڵێکی کارای هەبوو لەو هەوڵەدا.

لە پێنجوێن ئێمەش بۆنەیەکی شیعرخوێندنەوەمان ڕێکخست و لاوانی سلێمانیش چووبوون بۆ هەولێرو شانۆییەکیان پێشکەشکردبوو و داهاتی شانۆییەکەیان بەخشیبووە سندووقی باربۆی لێقەوماوانی پێنجوێن.

بێگومان ڕووداوەکە هەستی ئەدیب و شاعیرانیشی وروژاندبوو، (بەختیار زێوەر) شیعرێکی جوانی بۆ بوومەلەرزەکەی پێنجوێن داناوە، خۆ شیعرەکەی (موفتی پێنجوێن)ی کە بە (پێنجوێن بەبێ تۆ نزیکە مەرگم...) دەست

پێ دەکات، هەر زوو دەنگیدایەوە.

وردە وردە خەڵک گەڕایەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی و دەستیان کرد بە چاککردن و بوونیاتنانەوەی خانووە ڕووخاو و وێرانەکانیان. ئەو پارەیەی کە بۆ کۆمەک و هاوکاریی خەڵکی لێقەوماوی پێنجوێن کۆکرابووەوە، دوو ماشێنی گەورەی دروستکردنی ئەلەتریکیان پێ کڕی و بەو شێوەیەش ئیتر پێنجوێن ڕووناک بووەوەو بوو بە خاوەنی کارەباو ئەلەتریکی خۆی.

## ١٦- بەیانی ژمارە یەك و یەکەم شیعرم.

باوکم جگە لە کاری بازرگانی، خۆی شەش حەوت دێهاتی (حامی بەگی جافی) بەکرێ گرتبوو، بەیانیان زوو، نیوەی شەوی مابوو کە خەڵکی دێهاتەکان هەموویان لە دەوروبەری پێنجوێنەوە حاسڵاتیان بە کەروبار دەهێنا. بەروبوومی ئەو جووتیارانە سەوزەو تەڕەکاڵ بوو، تەماتە، خەیار، شووتی، کولەکە، بامێ و باینجان، ئەوان هێندێکیان بۆ خۆیان دەفرۆشت و ئەوەی تریان دەهێنا بۆ ئێمە.

لەو ماوەیەدا باوکم کاروباری وەرگرتنی ئەو تەڕەکاڵەی بە من سپاردبوو، بۆیە دەبوو بەیانیان زوو تاریک و ڕوون بچمە بازاڕ.

با لێرەدا باسی شتێک بکەم، بەیانییەکی بەهار بوو، گەڕەکێکمان هەبوو لە پێنجوێن ناوی (قەڵادێ) بوو، لەناو کەشوهەواو سروشتێکی بەهاری دڵڕفێندا بوو. بەیانییەک لەوێ چاوەڕوانی بارو بارگەی تەرەکاڵی جووتیارانم دەکرد، چواردەورم گوڵاڵەو لالەزار بوو، کانی و کانیاو تەقیبوون و سروشتی جوان شەش دەری لێگرتبووم، لەپڕ نازانم چۆن ئەو جوانییە کردمی بە شاعیرو ئیلهامی شیعرم بۆ هات، بیرمە لەسەر بەرزاییەک بووم کە سروشت پڕ جوانیی کردم، بۆئەوەی زمانم بپرژێت بە یەکەمین شیعرم، کە بە ناوی کوردستان بوو. باشییەکەی لەوەدا بوو دایمە کاغەزو قەڵەمم پێبوو، لەوێ نیوەیم نووسی و کە هاتمە ماڵەوە نیوەکەی تریم تەواو کرد. بەینی خۆمان بێت ئەو شیعرەم وەکو شیعرەکانی (دکتۆر شۆ) بوو.

بیرمە لە هێندێکیدا دەڵێم:

**ئەم کوردستانە وەستاوە لەسەر هەوا**
**لەسەر دەستی هێندێک ئیشکەر**
**ئەیپارێزن وەک دلاوەر**
**کوردستان، کوردستان !**

لەوەوە دەستم کرد بە شیعرنووسین و جارێکیش بابەتێکم نارد بۆ گۆڤاری (هیوا).

ئەو سەردەمەو لە دەوروبەری ساڵەکانی (١٩٥٥و ١٩٥٦) لە بەغدا یانەی (الارتقاء الکوردی) هەبوو، کە خۆمان پێمان دەوت (سەرکەوتن)، بیرمە چووم ئەدرەسی ئەو یانەیەم لە براگەورەکەم وەرگرت و شیعرێکم بە پۆستەدا نارد بۆ گۆڤاری هیوا. لەو ماوەیەدا کە شیعرەکەم ناردبوو، هەر بیرم دەکردەوەو لە خۆم دەپرسی بڵێی پۆستەکەم گەیشتبێت، یان ئەگەر گەیشتبێتیش تۆ بڵێی شیعرەکەم بایی ئەوە بێت بڵاو بکرێتەوە؟! بەپەرۆش بووم و چاوەڕوان بووم، هەتا لە یەکێک لە ژمارەکانی گۆڤارەکەو لە بەشی پۆستەی خوێنەراندا بینیم هێندێک لە کۆپلەی شیعرەکانمیان بڵاوکردۆتەوە.ئای ئەوە چەند دڵخۆشی کردم وام دەزانی هەموو دنیا موڵکی منە. ئەوە یەکێک بوو لەو خۆشییانەی ژیانم کە وەک گوڵ گەشاندمییەوە، بۆیە بە ئێستاشەوە لە یادم ناچێت و وەک یادگارییەک بیر لە تام و چێژی دەکەمەوە.

جا من بڵاوبوونەوەی ئەو شیعرەم ئەوەندە لا گرنگ بوو، هەر زوو هاوڕێکانی کۆمەڵەکەم کۆکردەوەو شیعرەکەم بۆ خوێندنەوە. ئەوانیش بەلایانەوە سەیر بوو کە شیعرێکی من لە گۆڤارێکی وەهادا بڵاوبۆتەوە.

لەو دەمەدا کوڕێکی پێنجوێنی هاوڕێم بوو ناوی (حسێنی حاجی مەلا) بوو، ئێستا حەجی کردووەو بازرگانیشە، ئەوسا شیعری جوانیشی دەنووسی بە ناوی (دڵتەڕ) کۆنە فەقیە بوو و دەستوخەتیشی زۆر خۆش بوو، بە خەتێکی فارسی شکستەی زۆر جوان دەینووسی. بەبۆنەی بڵاوبوونەوەی شیعرەکەمەوە لە گۆڤاری هیوا-دا، بە خەتی خۆی شیعرەکەی بە گەورەیی نووسیبووەوەو چەند دانەیەکمان لێ بڵاوکردەوە.

لەو سەردەمەدا جگە لە گۆڤاری (هیوا)، گۆڤاری (پەیام) یش دەردەچوو، کە بەشی ڕۆشنبیریی باڵیۆزخانەی ئەمریکایی لە بەغدا دەری دەکرد. من هانی هاوڕێکانم دەدا پەرە بە توانا ئەدەبی و سیاسییەکانیان بدەن، بێگومان سیاسەت هەمیشە سام و سوێی هەبوو، بۆیە هەوڵم دەدا کاری ڕۆشنبیریی بکەین. بۆ نموونە لەناو قوتابییانی پۆلی پێنج و شەشدا، کەوتینە سەر بەندو داوی ئەوەی کە تەنها بە زمانی پاراوی کوردی قسە بکەین و گوێ لە گۆرانی کوردی بگرین و گۆڤارو بڵاوکراوە کوردییەکان بخوێنینەوە.

وادەی جەژنی نەورۆز هاتە پێشەوە، چووم دووان لە هاوڕێکانم ڕاسپارد، لەبەر دەرگای قوتابخانەدا بوەستن و هەر قوتابییەک هات، پێی بڵێن بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە

قوتابخانە نییەو کارەکەشمان بۆ چووە سەر.

ئەو دوو هاوڕێیەم یەکێکیان تێکۆشەرو پێشمەرگەی سەرکردە کاک (بەکری حاجی سەفەر)و ئەوی تریشیان (شێخ عەلی نزارە) بوو، کە لە گوندی (نزارە)وە هاتبوو و لە پێنجوێن دەیخوێند.

ئیتر ئەوەبوو هەموو قوتابیانی ئەو دەمەی پێنجوێن کۆبووینەوەو چووینە (ناوشاخان). بە سروودو گۆرانی نیشتمانی و شیعرو وتارخوێندنەوە یادی نەورۆزمان کردەوە.

لەودەمەدا من بە نهێنی و لە ڕێگای (شەوکەتی مەلا مارف)ەوە، پەیوەندیم کردبوو بە (یەکێتیی گشتیی قوتابییانی ئێراق)ی سەر بە (حزبی شیوعی)یەوەو بەدرێژیی چالاکییەکانی ئەو یادکردنەوەیەی جەژنی نەورۆزم لە ڕاپۆرتێکدا هۆنییەوەو ناردمان بۆ گۆڤاری یەکێتیی قوتابییان و بڵاوکرایەوە.

کە ڕاپۆرتەکە بڵاوبووەوەو پۆلیس و حکومەتی ئەوکاتەی پێنجوێن پێیان زانی، گێرمەو کێشەی زۆرم بۆ دروست بوو. (مودیر ناحیە) بانگی کردم و زۆریش سەرزەنشتی کردم و وتی: "ئەم چالاکییە سیاسییانە هەمووی لەژێر سەری تۆدایە".

لەوماوەیەدا بەهۆی چالاکی سیاسییەوە هەر حکومەت ناحەزو دوژمنم نەبوو، بەڵکو بەهۆی بیروباوەڕی چینایەتییەوە کە ئەو دەمە بە هەرزانە لێی تێگەیشتبووم، باوکیشم بوو بە دوژمنم. حکومەت باوکمیان بانگ کردبوو، هەڕەشەیان لێکردو باسی چالاکییە سیاسییەکانی منیان بۆ کردبوو.

ئینجا لەو ماوەیەدا کە سەرەوکاری کۆکردنەوەی حاسڵاتی تەڕەکاڵی ئەو گوندانەم دەکرد، کە باوکم بە کرێی گرتبوون، لەجیاتی ئەوەی پەرە بە داهات و دەستکەوتی باوکم بدەم، هەوای شیوعییەت دابووی لە کەللەم، لە گوندەکانی (بناوەسووتە)و (هەرگێنە)و دێهاتی ناوچەی (بوزان) ببووم بە ڕێکخەری جووتیارەکان و پێم دەوتن "کاکە ئێوە ئەم بەروبوومانە بەری ڕەنجی ماندووبوونی خۆتانەو هەق نییە بیدەن بە باوکم"!

باوکم جگە لەوەی لەسەر هەڕەشەکانی مودیر ناحیە لە من پڕبوو، ئەوەشی بیستبووەوە کە جووتیارەکانم لەو پڕکردووە، هەر بەجارێ قوشقی ببوو. دەیوت: "هەتیو تۆ نان و دۆ بڕی و جارێکی تر کاری وا بکەیت واو وات لێ دەکەم".

لەڕاستیدا گوێم بە قسەکانی باوکم نەدا. لەسەر چالاکی بەردەوام بووم، دوایی کە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی پەرەیان سەند، زۆربەی ئەو جووتیارانەم کرد بە شیوعی.

جا باشە پیاو بەخێر یادی دۆست و هاوڕێی خۆی بکات، کە لە سەردەمێکدا هاوکاری بوون. ئێستاش ئەگەر من هاوڕێ و هاوکاری ئەو ڕۆژگارە بژمێرم، خوا دەمگرێت بەخێر یادی هەریەکە لە (بەکری حاجی سەفەر)و (حسێنی حاجی مەلا)و (حەمە سدیقی ئاسنگەر) نەکەم!

وای کە بەسوێیە یادی کاکە حەمە سدیقی ئاسنگەر، کاتێک خوێندکاری کۆلێجی یاسا بوو، لە ساڵی (١٩٦٣) دا بەعسییەکان لەناویان برد. لەو سەردەمەدا لەناو بازاڕی پێنجوێندا دوو سێ چایخانە هەبوون. لەبەرئەوەی چایخانەکەی (دەروێش کەریم) ڕادیۆی لێبوو، کە ئەوسا ڕادیۆ کەم بوو، بە پاتری گەورە ئیشی دەکرد، خەڵک زۆرتر ڕوویان تێدەکردو منیش بەیانیان بۆ نان و چا خواردن دەچوومە لای دەروێش کەریم.

ئەو بەیانییە کە چووم بۆ چایخانەکەی دەروێش کەریم، سەیرم کرد حەشامات کۆبوونەتەوە بەدیار ڕادیۆ بۆرەوە، کە گەیشتم و گوێم دایە ڕادیۆ، بەیانی ژمارە یەکی دەخوێندەوەو بانگی سەرکەوتنی شۆڕش و ڕووخاندنی

سیستمی پادشایەتی دەدا لە ئێراقدا.

ئەودەمە کە بەیانی بوو، ڕادیۆ بە عارەبی بەیانەکەی دەخوێندەوە، چونکە لەو سەردەمەدا ڕادیۆ بە زمانی کوردی تەنها بە ئێواران پەخشی دەکرد. کێچ کەوتە کەوڵم، ئەو ڕووداوە بۆ ئەو زەمانە زۆر گەورە بوو، بەپەلە گەڕامەوە ماڵەوەو چووم براکانم لە خەو هەستاندو وتم: "کاکە دونیا شێواوەو لە بەغدا شۆڕش بەرپابووەو دەسەڵاتی پادشایەتی کۆتایی هاتووە".

ڕۆژ بووەوە، بەڵام چۆن ڕۆژێک، وەکو ڕۆژانی تر نەبوو، هەر زوو لە بەیانییەوە کەوتمە کۆکردنەوەی هاوڕێکانی (کۆمەڵەی کاوە). دەستمان کرد بە چالاکی و بە پاکی پێنجوێندا بڵاوبووینەوەو کەوتینە دڕاندنی وێنەکانی پادشای ئێراق و سڕینەوەی شوێنەواری سیستمی پادشایەتی و ڕۆحێکی زەعامەتی وامان بەبەردا کرا وەک ئەوە وابوو ئێمە خۆمان زەعیم (عەبدولکەریم قاسم) بین.

ئەگەرچی لەو زەمانەدا لە پێنجوێن هێشتا هەر (پارتی) باڵادەست بوون، بەڵام ئێمەش وەک لاوانی شیوعی هاتبووینە کایەو خۆمان دەنواند.

من ببووم بە سەرۆکی (بەرگری میللی)و چەک و تفەنگی ماڵەوەم هێنابوو، خەڵک و گەنجانم ڕێکدەخست.لەو

سەروبەندەدا تا پۆلی شەشەمم بە زیرەکی هێنابوو، هەموو ساڵێکیش یەکەم دەبووم، کەچی ئەو ساڵە بەهۆی چالاکی سیاسییەوە کەوتمە باری نووشستی و لە خوێندندا نەک لە یەکەمینەوە کشامەوە بۆ دوایەمین، بەڵکو دەرنەچووم لە یەک دوو وانەشدا کەوتم.

با مادەم باسی نووسین و بڵاوکردنەوەی یەکەم شیعرم کرد، یادێکی (گۆران)ی مەزن بکەم. بیرمە ساڵیادی شۆڕشی گەلاوێژ بوو، لە پێنجوێن ڕێکخراوی (ئاشتیخوازانی ئێراق)، کە مامۆستا گۆران سەرۆکی لقی سلێمانی بوو، فێستیڤاڵێکی شیعرو وتارخوێندنەوەی سازکردبوو، کە کەسایەتی دیاری ئەو سەردەمە تێیدا ئامادە بوون، لەوانە: (شێخ لەتیفی شێخ مەحمود، ڕەمزی مەلا مارف، جەمیل ڕۆژبەیانی، هونەرمەند ئازاد شەوقی، مامۆستا شوکر مستەفا)، کە هەر خۆشی ئاهەنگسازی فێستیڤاڵەکە بوو، کە منی پێشکەش کرد، وتی: "ئێستا گوێتان لە دەنگی زوڵاڵی شاعیرێکی لاوی پێنجوێنی دەبێت".

منیش هاتمە سەر سەحنەو بە دەنگێکی دلێر شیعری (من ئینسانم) خوێندەوە، کە هەر خۆشم نووسیبووم، ئەوەی هانیشی دام ئەم باسە بگێڕمەوە ستایشی (گۆران)ی مەزن بوو، کە دوای خوێندنەوەی شیعرەکە پێی وتم:

"هیوادارم دەستبەرداری هەموو شت بیت و بە تەنها خەریکی شیعرنووسین بیت".

با بۆ یادی (گـــۆران)ی مەزنی شاعیری مەزنی نەتەوەکەمان، شیعرەکەتان بۆ بنووسمەوە، کە ئاوها دەست پێدەکات:

**من ئینسانم**
**هەموو گیانم**
**وەکو ئینسانی سەر جیهان**
**لە یەک ئەچێ**
**بەبێ گومان،**
**ئیتر بۆ من**
**وەکو دوژمن**
**سەیری کەسانی تر بکەین**
**گشتمان هەر حەز لە ژین ئەکەین.**
**ئینسان ئەبێت**
**ئینسانی بێت،**
**گشت کەسی لا یەکسانی بێت**
**هەوڵی ئاشتی جیهانی بێت،**
**نەک هەر خۆمان خۆمانی بێت.**

گوێژە سنگی لە دامێنی
ئاسمان ئەسوێ...!
ئەزمڕ لوتی
بەرەو تیشکی هەتاو ئەنێ
گڵەزەردە لارە ملەو ماچی گزنگی خۆر ئەکات
ئاوا نابێ...!
هەورازەکەی تاسڵوجەش
تەخت بووە، وەکو بازیان...!
ئەوەی ڕەق و زەق و دیارە
دیارە هەر، بەردەقارەمان...!

۱- سلێمانی، پاریسی زەمانی خۆی.

بارگەو هەوارم بەهۆی سیاسەتەوە کەوتە سلێمانی، وا پێدەچوو بەختم بۆنی ئەوەی کردبێت کە ڕێم دەکەوێتە ئەم شارە، بۆیە ساڵێک پێش ئەوە هەر لە پێنجوێنەوە لە قوتابییەکی چالاک و هەمیشە یەکەمینی پۆلەوە، هاتمە ئەوەی وەک هەرزەکارێکی بەگوڕی سیاسی و بەپێچەوانەی سروشتی قوتابییەتی خۆمەوە، لێرە بە نیوەناچڵی هەوڵی تێپەڕاندنی پۆلی شەش بدەم.

ئێستا ڕۆژگـار ڕۆژگـاری شۆڕشی (١٤ی تەمموزە) و حوکمی پادشایەتی لە ئێراقدا کۆتایی هاتووە، منیش وەک گەنجێک کە ئەو ڕۆژگارە وا بڕیاری لە چارەنووسم دابوو، بەدوای خەونی کوردایەتییەوە بکەومە بەرەی حزبی شیوعییەوە.

کەوتوومەتە شارێکی گەورەی وەکو سلێمانییەوە، کە بۆ ئەو ڕۆژگارەی من، لە چاو شارۆچکەیەکی وەکو پێنجوێندا پاریسی زەمانی خۆی بوو.

لە سلێمانی تاقیکردنەوەی ئیکمالییەکەی پۆلی شەشم داو بە هەزار حاڵ وناڵی عەلی، تێیدا سەرکەوتم و بڕوانامەی پۆلی شەشم خستە تەنکەی باخەڵمەوە، کە بۆ ئەو زەمانە، هاوتای بەکالۆریۆسی ئەم ڕۆژگارە بوو. ئێستا نەک بە کالۆریۆس، وەختە بڵێم دیبلۆمی باڵاو دکتۆراش بەهایان نەماوە.

ئەوکات بە تەنها بڕوانامەی شەشی سەرەتایی بەس بوو، بۆئەوەی لە (ئامادەیی پیشەسازیی) وەربگیرێیت، وەک ئێستا نەبوو کە قوتابی بە بڕوانامەی پۆلی سێی ناوەندییەوە لەو ئامادەییە وەردەگیرێت، دیاربوو ئەمە لە بەختانی من بوو.

بینای ئامادەیی پیشەسازیی سلێمانی ئەوسا، هەر ئەم شوێنەی ئێستایەو لە جێی خۆیەتی، نازانم بڵێم کە سەیرە لە شوێنی خۆی ماوە!

ئەو دەمە ئامادەیی پیشەسازیی سێ بەش بوو: دارتاشی، میکانیک و کارەبا. من سەرو سەودام لەگەڵ کارەباو ئەلەتریکدا هەبوو، بۆیە چوومە بەشی کارەبا.

ئەوسا ئامادەیی پیشەسازیی جۆرێکی تر بوو و لە دوو نهۆمی سەرەکی پێکهاتبوو. بەشی خوارەوەی پۆلەکانی خوێندن بوو، بەشی سەرەوەشی شوێنی مانەوەو گوزەرانی

ئەو قوتابییانە بوو کە خەڵکی دەرەوەی شار بوون.

بێگومان وەک وتم، ئەو دەمە من بەیەکجاریی ساغ ببوومەوە کە سەر بە حزبی شیوعیم. حزبی شیوعی لەدوای شۆڕشی چواردەی تەممووزەوە گەورەترین حزبی ئێراق و بەشێک بوو لە دەسەڵات و خەڵکی ئێراق سێ بەشیان ببوونە شیوعی.

کە لە پۆلی شەش بووم لە پێنجوێن، پێش ئەوەی بێم بۆ سلێمانی، لیژنەی قەزا دروستکراو کرام بە ئەندام. بەرپرسی لیژنەی قەزا (مامۆستا سەعید عەبدوڵلا)، کە دواتر چووە مۆسکۆو دکتۆرای لە زانستی سیاسیدا هێنا، بوو بە مامۆستای زانکۆی سلێمانی، ئەندامەکانیش: (تایەری میرزا ئەحمەد، حەمەی باخەوانی شاعیر، ئەحمەد شا، جەلالی حاجی نەسروڵلا، قادری حاجی حسێن)و بەندە بوون و یەکەم کۆبوونەوەش لەماڵی تایەری میرزا ئەحمەد کرا.

کاتێک هاتمە سلێمانیش هەر بە ئەندامی لیژنەی قەزا مامەوە، سێ مانگی پشووی هاوین دەچوومەوە پێنجوێن و سەرەوکاری ئیشەکانی حزبم دەکرد، ئەمەش بۆ من کەم نەبوو. لەو دەمەدا جوانێکی خوێندەواری چست و چالاک بووم، بۆیە یەکسەر دەستم کرد بە سەردانی دێهاتەکان و کەوتمە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی حزب و دروستکردنی

ڕێکخستن لە ناوچەکەدا.

بەهۆی کارو چالاکی سیاسیمەوە لەناو جووتیاراندا (پارتییەکان) ڕقیان لێهەڵگرتبووم، بێگومان خۆ هەر من نەبووم کە لە پێنجوێن و دەوروبەری کارمان بۆ حزبی شیوعی دەکرد، بەڵام بەهۆی تەمەن و خوێندەوارییەکەمەوە زیاتر کەوتبوومە بەرچاوان.

٢- کتێبخانەکەی پێنجوێن.

هێشتا لە پۆلی شەش بووم، خولیای کردنەوەی کتێبخانەیەک لە پێنجوێن لە کەللەی دابووم، لەدوای شۆڕشی چواردەی تەمموز کتێب و چاپەمەنی و گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوە زیادی کردو بارودۆخی سیاسیش لەبار بوو بۆئەوەی لە پێنجوێنیش کتێبخانەیەک بکەینەوە.

(حاجی محەمەد) ناوێک هەبوو، کە دەکاتە باوکی دکتۆر (عوسمان)ی شارەزاو پسپۆڕی ئێسقان، دوکانێکی هەبوو لەگەڵی ڕێکەوتین مانگانە حەوتسەدو پەنجای بدەینێ، خوا هەڵناگرێت باش بوو ڕوبعێک خاتری گرتین و وتی: "با ئەو ڕوبعەش باربۆی من بێت بۆ حزب"، بەو جۆرەش کرێکە بوو بە نیو دینار.

ئیتر لەو دوكانەدا كتێبخانەیەكم دانا بە ناوی كتێبخانەی (بیری نوێ)، كە بووە نێوەندێک بۆ خوێندەوارو شیوعییەكانی پێنجوێن، كە هاتمە سلێمانی كەسێكم لەسەر دانا، بەڵام هەر دەستم پێوەی بوو. بۆئەوەی كتێبخانەكەش ئاوەدان بێت، دەبوو كتێب و بڵاوكراوەكان لە سلێمانییەوە بهێنم.

ئەو دەمە لە سلێمانی چەند كتێبخانەیەک هەبوو. كتێبخانەی (گەلاوێژ) لەسەر شەقامی (مەولەوی) بوو، پشتی سینەما (ڕەشید)ی جاران كە ئێستا لە جێی ئەو بازاڕی (ڕەشـەمۆڵ) بیناكراوە، (ڕەئوف مەعروف)، كە خۆشی شیوعی بوو، خاوەنی كتێبخانەی گەلاوێژ بوو، كتێبی ئەدەبیم لای ئەو دەبرد، بۆ كتێبی سیاسیش دەچوومە كتێبخانەكەی (بیری نوێ). ئەم كتێبخانەیە حزبی شیوعی خاوەنی بوو، لە شەقامی (كاوە) بەرامبەر كەبابخانەكەی (عومەری ئەجێ) بوو. كتێبخانەی (زێوەر)یش هەر لە شەقامی مەولەوی بوو، ئەم كتێبخانەیە (حەمە ڕەسوڵ هاوار) خاوەنی بوو. ئەویش ئەو دەمە شیوعی بوو، بەڵام دوایی (حەمەی زێوەر) بوو بە خاوەنی، لای ئەوانیش بڵاوكراوەم دەبرد بۆ كتێبخانەكەی پێنجوێن.

ئیتر هەرچی لەم كتێبخانانەی سلێمانی بڵاو دەبوونەوە، من دەمودەست دەمگەیاندنە كتێبخانەكەی پێنجوێن و

هەموو جاریش ئەو کارە بەئاسانی مەیسەر نەدەبوو.

بیرمە جارێکیان زستانێکی سەخت بوو، بەفرێکی زۆر باریبوو، منیش بارێک کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارم پێبو، ئۆتۆمبێل هەتا (ناڵپارێز) بڕی کرد، لەوەولا لەبەر زۆریی بەفرەکە، نەدەگەیشتە پێنجوێن، بەناچاریی بارەکەم دا بە کۆڵمداو بەناو بەفردا ملی ڕێگام گرتەبەرو یەک دانە ڕۆژی ڕەبەقی ویست تاوەکو لە ناڵپارێزەوە گەیشتمە پێنجوێن.

بەهەرحاڵ کتێبخانەکە بۆ ئەو ڕۆژگارە لەڕووی ڕۆشنبیریی و سیاسییەوە سوودی خۆی هەبوو. خەڵکێکی زۆریش بەهۆی بڵاوکراوەکانییەوە سەوداسەری خوێندنەوەی ئەدەب و سیاسەت بوون، تەنانەت وەک نێوەندێکی هونەریش وابوو.

هەر بەهۆی ئەو کتێبخانەیەوە بوو کە توانیمان لە پێنجوێن چەند شانۆگەرییەک پێشکەش بکەین. لەناو ئەوانەداو ئێستا کە لەبیرم مابێت شانۆییەک بوو، من وەک ئەکتەر ڕۆڵی (وەزیر)م تێدا دەبینی و (جەمال جەلال)یش، کە دوایی بوو بە کادرو پێشمەرگەی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)و لە (حکومەتی هەرێم)یشدا تا پلەی قایمقامی ڕۆیشت، وەک ئەکتەر لە شانۆییەکەدا ڕۆڵی (پادشا)یەکی دەبینی.

تا من هاتمە سلێمانی، کتێبخانەکەی پێنجوێن هەر مایەوەو بـەردەوام بوو لـەوەی سـوود بە خوێندەواران بگەیەنێت, با بیریشم نەچێت و بۆرە کتێبخانەش گلەییم لێ نەکات و بنووسم، کە ئەو کتێبخانەیە یەکەم کتێبخانە بوو لە دوای شۆڕشی چواردەی تەمموز لە پێنجوێن دانرا.

٣- خەبات لەناو شاردا.

هەرکە هاتمە سلێمانی، منیان خستە لیژنەی قوتابیانی حزبی شیوعی شاری سلێمانی. ئەوانەی کە لەلیژنەکەدا بوون کەسایەتی ناسراو بوون. لەوانە (جەلالی میرزا کەریم) نووسەرو شاعیری بەنامێ، ئەودەمە ئەو ئەندامی مەکتەبی محەلی حزب و بەرپرسیاری لیژنەی قوتابیان بوو، هەریەکە لە (حەسەنی عەلی غالب، ڕەفعەت زوهـدی و نەجمەدین نوری) برای (بەهادین نوری) ئەندامی لیژنەکە بوون. کە لە لیژنەکەشدا کاروبار دابەشکرا من کرامە بەرپرسی ناوەندی پیشەسازیی سلێمانی و بەرپرسی هەموو دواناوەندییەکانی شاری سلێمانی. ئیتر لەو دەمەدا بارودۆخی سیاسی دوای قۆناغی پاشایەتی، جۆرێکی تر بوو، ئێمەش تـازە فێری سەرەتاکانی خەبات ببووین، دەمانویست لە بارودۆخی خۆمانەوە دەست پێ بکەین.

لەو ماوەیەدا من قوتابی ئامادەیی پیشەسازیی بووم و شەوانیش هەر لە بەشی ناوخۆیی دەمامەوە. ژیانکردن لەو سەردەمەدا لە بەشی ناوخۆیی ئامادەیی پیشەسازیی قورس و گران بوو، خواردن خراپ بوو، شوێنی دەستشتن و ئاودەست پیس و پۆخڵ بوو، شوێنی نووستن ساردو نسرم، حەمامی مەڵکەندییان ڕووبەڕووکردبووینەوە، بۆئەوەی خۆمانی لێ بشۆین، بەڵام ئەویش خراپ بوو، ئەمانە هەموویان بیانووی باش بوون بۆئەوەی چالاکییەک ڕێکبخەین.

ئەودەمانە ببوومە بەرپرسی هەموو دواناوەندییەکانی سلێمانی و لەهەمان کاتیشدا بەرپرسی ناوەندی پیشەسازیی سلێمانیش بووم. جا بتبینیمایە لەم گۆڕەپان بۆ ئەو گۆڕەپان، لەبەردەم حەشامەتی قوتابیاندا چۆن وتارم دەداو و فوم بە کەڕەنای ناڕازیبووندا دەکرد.

٤- خۆپیێشاندان و مانگرتن.

ئامادەیی سلێمانی کوڕان، کە ئێستاش لە شوێنی خۆی ماوە، لەو سەروبەندەدا ببووە گۆڕەپانی ململانێی سیاسی لەنێوان شیوعی و پارتیدا.

ڕۆژێکیان قوتابیانی لایەنگری پارتی و شیوعی بەیەکا

دێن و دەبێت بە شەڕیان، حزب بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئێمە کە لیژنەی قوتابیانین، بۆ پشتیوانی لە قوتابیانی شیوعی چەند کەسێک دەنێرێت بۆ ئامادەیی سلێمانی، یەکێک لەوانە (حسێن فەرەج) ناوێک دەبێت. لەو شەڕو فەرتەنەیەدا حسێن کە کرێکارێکی هەژاری لادێی بوو، دەبێتە قوربانیی.

ئەودەمە کە من لە لیژنەی قوتابیان کارم دەکرد، لە سەدا نەوەدی قوتابیانی ئامادەیی پیشەسازیی سلێمانی شیوعی بوون، بۆیە هەرکە هەواڵی شەڕەکەمان پێگەیشت، دەرگای قوتابخانەم گرت و پێش قوتابییەکان کەوتم و بە لێشاو چووین بەرەو ئامادەیی سلێمانی کوڕان. کە گەیشتینە جێ ڕۆمەڵغەزایەک بوو هەرمەپرسە، حسێن فەرەجی داماو لە خوێنی خۆیدا گەوزابوو، قەرەباڵغییەکی گەورە دروستببوو، خەڵک گرمۆڵە ببوون، بە هەزار حاڵ و ناڵی عەلی گالیسکەیەکی دەستیمان پەیدا کردو تەرمی حسێنمان خستە سەرو بەڕێکەوتین بەرەو بەردەرکی سەرا.

ئەوەی لەبیرم بێت من و (جەلالی میرزا کەریم، ڕەفعەت زوهدی و جەلال دەباغ لە پێشەوەی خۆپیشاندەراندا بووین. کابرایەکی تێکسمڕاوی پەنەکەوتەی دەست و بازوو و مەچەک ئەستووری چوارشانە، گالیسکەی تەرمەکەی حسێنی لە پێش ئێمەوە دەئاژوو، بەدوامانەوە پاکی شار

خرۆشاو خۆپێشاندان ئەوسەری دیار نەبوو.

بوو بە خۆپێشاندان (غەفوری میرزاکەریم) کادری باڵای حزبی شیوعی لە بەردەرکی سەرا وتاری بۆ خۆپێشاندەران داو وتی: "شەش شەقاوەی سەرسەریی ئارامیی سلێمانییان تێکداوە". ئەو سەردەمە لەناو شاری سلێمانیدا شیوعییەکان زۆر بەهێز بوون، سەندیکای کرێکاران و مامۆستایان و ڕێکخراوی ئافرەتان و ڕێکخراوی جۆراوجۆریان هەبوو، بۆیە خۆپێشاندانەکە خەڵکێکی زۆری پێوەنووساو هەتا تەرمەکەیان گەیاندە گردی سەیوان، ئاپۆڕای جەماوەریی نەڕەوییەوە.

جا کە باس باسی خۆپێشاندان بێت، با ئەوەشیان بگێڕمەوە کە سەبارەت بە دەستووری ئێراق خۆپێشاندانێکی ترمان کرد. بێگومان بۆ حزبی شیوعی، نەمانی سیستمی پادشایەتی و هاتنی قاسم لە بەختانی بوو، لەو دەمەدا ڕێنماییەکان کە بۆ ئێمە دەهات وا بوو کە هەم هاوکارو پشتیوانی حکومەت بین و هەم لە خەبات و تێکۆشانیشدا بەردەوام بین.

حزب سیاسەتی (التعاون والکفاح)ی پێڕەو دەکرد، ئێمەش لە لیژنەی قوتابیان ئەو سیاسەتەی حزبمان ڕەچاو دەکرد. حکومەتی قاسم ئومێدێکی زۆری بە ئێمەومانان

بەخشی، ئاڵای ئێراق بوو بە شمشێرو خەنجەر. شمشێر گوزارشت بوو لە عەرەب و خەنجەرەکەش بوونی کوردی بەرجەستە دەکرد. لە یەکێک لە ماددەکانی دەستووری کاتیی ئێراقیش-دا دەڵێت: "کوردو عەرەب لەم نیشتمانەدا شەریکی یەکترن".

حزبی شیوعی مەبەستی بوو کە دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ ئێراق دابنرێت، ئێمەش وەکو کورد ئەمەمان پێ باش بوو، بۆیە کەوتینە کنەی ئەوەی خۆپێشاندانێک ڕێکبخەین بۆ پشتیوانیکردن لە دانانی دەستووری هەمیشەیی بۆ ئێراق. شوێنی ئێستای بازاڕی عەسری، قوتابخانەی فەیسەڵییە بوو، لەو دەمەدا قوتابخانەکەیان ڕوخاندبوو، بەڵام هێشتا بازاڕەکەیان تێدا دروست نەکردبوو، ئێمە لە لیژنەی قوتابیان ئەو شوێنەمان دیاری کرد بۆخۆپێشاندان، ئیتر لەوێدا خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوەو قەرەباڵغییەکی گەورە دروستبوو. (جەلال دەباغ) لە تەنیشتمەوە وەستابوو، سەری نایە بناگوێم و وتی: "ئەرێ خۆ تۆ شاعیریت، بۆ کۆڕەکە گەرم ناکەیت؟". بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، شاعریێتییەکەم فریام کەوت و وتم: "میللەت ئازاو جەسورە، چاوەڕوانی دەستوورە". ئیتر ئەوە بووە هوتافی خۆپێشاندانەکەو یەکێک دەیوت و هەزاران بۆیان دەسەندەوە. بەوشێوەیە

خۆپیشاندانێکی گەورەمان بۆ پشتیوانیکردن لە دەستووری هەمیشەیی ئێراق بە سەرکردایەتیی قوتابیان بەرێکرد.

ماوەیەک سیاسەتی حکومەتی قاسم بەرامبەر کورد باش بوو، بەڵام هەر کە قەڵەمی دیرۆک لە ساڵی (١٩٦٢) نزیکبووەوە، سیاسەتی حکومەتی قاسم ڕوو لەوە بوو، بەرامبەر کورد بگۆڕێت، بۆیە کەفوکوڵی خەباتی قوتابیان لە خۆپیشاندانەوە دەیبردین بۆ مانگرتن.

بەهانەی زۆرمان هەبوو، وەک پێشتر باسم کرد، گوزەرانی قوتابییەتی و ژیانکردن لە بەشی ناوخۆیی، زۆر خراپ بوو، هەر لە ناوەندی پیشەسازیی خۆمانەوە دەستمان پێکرد.

مانگرتن ناوەندی سلێمانیشی گرتەوە، هەموو قوتابخانەکانی سلێمانی کچان و کوڕان، بەتایبەت ناوەندییەکان، بۆ ماوەی حەفدە ڕۆژی ڕەبەق لە مانگرتن بەردەوام بوون. لە سەروبەندی مانگرتنەکەدا ئێمە وەک لیژنەی قوتابیان لە هەلپەی ئەوەدا بووین زۆرترین کەسایەتییەکانی شاری سلێمانی وا لێ بکەین پیشتیوانیمان بکەن.

سەردانی (شاکیر فەتاح)مان کرد، کە ئەودەمە ماڵی لە گەڕەکی عەقاری بوو، دوای ئەو چووین بۆ لای (ئیسماعیل

شاوەیس)، پاشان چووین بۆ بارەگای پارتی کە ئەوکاتە لە پشت یانەی فەرمانبەرانەوە بوو، نزیکی ماڵی (حاجی عەلی بەگ).

ئەوکاتە لە سلێمانی (حەمەی حاجی تایەر) بەرپرسی پارتی بوو، ئێمەش نووسراوێکمان پێشکەش کردو بە ناوی قوتابیانەوە دوامان کرد پشتیوانی لە مانگرتنەکەمان بکەن. خوا هەڵناگرێت کاکە حەمە بەڕێزەوە پێشوازیی لێکردین و بەدەم و لفتێکی گەرمیشەوە گفتوگۆو قسەی خۆشی لەگەڵ کردین.

دوای ئەوە یاداشتێکمان هۆنییەوەو پێشکەشی وەزارەتی معاریفمان کرد و لە پاڵ داواکارییەکانماندا داواشمان کردبوو خوێندن لە ناوەندیی و دوا ناوەندییەکانیشدا بکرێت بە کوردی. کۆپییەکی ئەو نووسراوەشمان برد بۆ ڕۆژنامەی (ژین)، کە ئەوسا لە جێی پیرەمێرد (ئەحمەد زرنگ)ی خوشکەزای بەڕێوەی دەبرد.

زرنگ چاوێکی بە نووسراوەکەدا خشاندو وتی: "ئەگەرچی ناوەڕۆکی نووسراوەکە سیاسییە، بەڵام لەبەرئەوەی قوتابین، بۆتان بڵاو دەکەمەوە".

### ٥- عیسمەت شەریف وانلی.

خۆم بەشداریی کۆنگرەی یەکێتیی قوتابیانی بەغدا نەبووم، بەڵام نوێنەرایەتی حزب لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوو کە لە بەغدا بەڕێوەچوو. بەندو باوی ڕۆژگارو بەردەوامیم لە بەدواداچوونی کاروانەکەدا وای کرد بیرەوەرییەکی تایبەتم لەسەر ئەو کۆنگرەیە هەبێت.

عیسمەت شەریف خەڵکی (وان)ە،ماڵباتەکەی لەدوای شۆڕشەکانی باکووری کوردستان ئـاوارەی وڵاتی شام بوون و لەوێ گیرساونەتەوە، عیسمەت لە شام بڕوانامەی دیبلۆمی بەدەستهێناوەو دوایی ڕووی لە ئۆروپا کردووە.

لە کۆنگرەی یەکێتیی قوتابیانی جیهانی-دا لە بەغدا کە (عەبدولکەریم قاسم) ئامادەی دەبێت، (عیسمەت شەریف وانلی) وەک نوێنەری خوێندکارانی کـوردی ئۆروپا لە کۆنگرەکەدا وتارێک پێشکەش دەکات.

(وانلی) لە وتارەکەیدا باسی ڕەوایەتیی مافی کوردو داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەکات. بەهۆی ئەمەوە دەبێت بە گەرمەو کێشەو عیسمەت بە جوداخوازو تێکدەر تاوانبار دەکرێت و لە کۆنگرەکە دەکرێتە دەرەوە.

(مەهدی حافز)، کە دوایی بوو بە یەکێک لە سەرکردەکانی حزبی شیوعی ئێراق، لە کۆنگرەکەدا وەڵامـی (عیسمەت

شەریف وانلی) دەداتەوەو دەڵێت: "پێویستە کێشەی کورد وەکو کێشەی بەربەرییەکانی جەزائیر لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێراقدا چارەسەر بکرێت". پارتییەکان ئەمەیان قۆستەوەو وتیان: گوایە مەهدی حافز کوردی بە بەربەریی لەقەڵەم داوەو هەڵمەتێکیان دژی بەرپاکرد. ئەودەمە لەسەر دیواری کۆڵان و شەقامەکانی سلێمانی، ڕووت لە هەرکوێ دەکرد، نووسرابوو "مەرگ بۆ مەهدی حافزی شیوعی".

ئێمەش لە لیژنەی قوتابیان بەیاننامەیەکمان دەرکردو بە زمانێکی سیاسییانە هەم نارەزاییمان دژی قسەکانی مەهدی حافز دەربڕیبوو، هەم پشتیوانی عیسمەت شەریفیشمان کردبوو، لە درێژەی بەیاننامەکەشدا نووسیبوومان لەم قۆناغەدا پێویستە گەلی کورد پشتیوانی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم بێت.

لەسەر ئەم بەیاننامەیەش حزب لە لیژنەی قوتابیان تورە بوون و سەرزەنشتیان کردین و تاوانبارکراین بەوەی ئێمە کەوتووینەتە ژێر کاریگەریی پڕوپاگەندەی بۆرجوازیی کوردییەوە! بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بارە، من و چەند قوتابییەکی تر، شەوان دەچووین نووسراوی سەر دیوارەکانمان دەسڕییەوە، کە جنێودان بوو بە مەهدی حافز، لە جێی ئەو بە عەرەبی دەماننووسی "بژی تێکۆشەری

شیوعی مەهدی حافز".

لەم سالانەی دواییدا لە کۆنگرەیەکدا لە سلێمانی تووشی (مەهدی حافز) بووم ئەو چیرۆکەم بۆ گێڕایەوەو پێم وت: "کاتی خۆی لەسەر تۆ تووشی زۆر گێرمەو کێشە بووم"، ئەویش بە پێکەنینەوە دیوی تری چیرۆکی ئەو ڕۆژگارەی بۆ دەگێڕامەوە.

من بۆ یەکەم جار لە ناوەڕاستی شەستەکاندا لە پێنجوێن چاوم بە (عیسمەت شەریف وانلی) کەوت، ئەودەمە ئەو نوێنەری شۆڕشی کورد بوو لە ئۆروپاو دەمڕاستی جەنراڵ بارزانیش بوو.

تاریکەشەوێکی درەنگ لە پێنجوێن دەرفەت ڕەخسا لەگەڵ چەند هاوڕێییەکدا گفتوگۆیەک لەگەڵ عیسمەت-دا ساز بکەین، لەو گفتوگۆیەدا من ئەوم وەک باڵیۆزی کوردستان ناولێنا، ئەویش وتی: "وا نییە، من تەنها نوێنەرایەتی شۆڕش دەکەم".

یەکەمین جار لە ژیانمدا کە وشەی (لۆبی) کەوتبێتە بەر گوێم، لەسەر زاری عیسمەتەوە بوو. ئەو باسی لەوە دەکرد کە گرنگە لە دەرەوە پشتیوانی بۆ شۆڕش و مەسەلەی کوردی پەیدا بکەین. قسەکانم پێ بڕی، پرسیم: (لۆبی) واتای چییە؟!

لەم سالانەی دوایدا لە ولاتی ئەڵمانیاو لە شاری بۆن، دەستی خۆم بینییەوە کە لەناو دەستی عیسمەت شەریف وانلیدایەو لە پێشەوەی ڕێپێوانێکداین بۆ ناساندنی دۆزی کورد، ئیتر ئەوەبوو تا نەتەوەیەکگرتووەکان ڕانەوەستاین و لەوێ کە چاوەڕوانی بینینی (پوتروس گالی) سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکانمان دەکرد، گفتوگۆکەی ئەو شەوەی ناوەڕاستی شەستەکانی پێنجوێنم بە یاد هێنایەوە، وتم: "لۆبی ئا ئەمەیە کە ئێستا دەیکەین".

## ٦- باڵیۆزی ئەمریکایی و کوباو بارزانی.

سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول بوو، فڕۆکە دەستی کردبوو بە بۆردوومانی کوردستان، ئەو کاتە حزبی شیوعی پێڕەوی سیاسەتێکیان دەکرد ناویان لێنابوو (التعاون والكفاح) هاوکاری و تێکۆشان، ئەوەش جۆرێک لە دووڕوویی بوو. گوایە لە لایەک پشتیوانی حکومەت و لە لایەکی تریش لە خەباتی خۆیاندا بەردەوامن، لەم چوارچێوەیەشدا هەڵوێستی حزب لە بەرامبەر سەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلوولدا، بڵندکردنی دروشمی (ئاشتی بۆ کوردستان) بوو.

حزبی شیوعی لە زۆربەی شارەکاندا خۆپێشاندانی گەورەی ڕێکخست، لە بەغداش ئامادەسازیی دەکرد

بۆئەوەی خۆپیشاندانێکی ملیۆنی لە بەغدا ڕێکبخات، وەفدێکیش پێکهێنرا کە نوێنەری خەڵکی کوردستان بێت و بچێتە بەغدا.

لە ئەندامانی وەفدەکە ئەوەی لە بیرم مابێت، من و مامۆستا (فایەق نوری) کە لە ڕۆشنبیرە شیوعییەکانی سلێمانی بوو، ئینگلیزییەکی باشیشی دەزانی و (شێخ برایمی قادرکەرەم)، کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی بوو، (مەلا محێدین) وتاربێژو پێشنوێژی مزگەوتی کەرکوک بوو، (عەلی باراوی) کادری حزبی شیوعی بوو، (حەمەی حاجی ساڵحی حەمامچی)یش لە دەوڵەمەندەکانی سلێمانی بوو. کاک (حەمە عەلی)یەکیشمان لەگەڵ بوو بەرپرسی جووتیارانی هەڵەبجەو شارەزوری شیوعی بوو. سێ ژنیش ئەندامی وەفدەکە بوون، یەکێکیان مامۆستا بوو ناویم بیر نییەو دووانەکەی تریش یەکێکیان (توبا)ی خوشکی (جەلال ئەبو شوارب) بوو، کە لە ژنە تێکۆشەرو چالاکەکانی حزبی شیوعی بوو، ئەوی تریشیان ژنێکی هەڵەبجەیی بوو ناوی (ئافتاو) بوو، بە هەڵەدا نەچووبم دە دوانزە کەسێک بووین. سەرەتا چووینە لای (عەبدولکەریم قاسم) لە بینای وەزارەتی بەرگریی عێراق، وەک وەفدێک کە نوێنەری خەڵکی ئاشتیخوازی کوردستانین، داوامان کرد هێرش و

بۆردومان ڕابگرێت و هەوڵی چارەسەری کێشەی کورد بدات و ڕێگای گفتوگۆ بگرێتە بەر.

عەبدولکەریم قسەی زۆری کرد، سەرزەنشتی مەلا مستەفاشی کردو وتی: "ئێمە لە دەرەوە هێنامانەوەو ڕێزمان لێگرت و لە بەغدا کۆشکەکەی (نوری سەعید)مان دایە، کەچی ئەو ئەمەی لەبەرچاو نەگرت و دەستی دایەوە چەک لە دژی ئێمە".

دوای ئەوە سەردانی (مەهداوی)مان کرد، کە سەرۆکی (مەحکەمەی شەعب) بوو، (فەتاح سەعید شالی)، کە ئەندامی مەحکەمەی شەعب و لەلای دانیشتبوو. پاشان چووینە لای (ئەحمەد ساڵح عەبدی) کە حاکمی سەربازیی بوو، سەردانی زۆربەی کەسایەتییە سیاسییەکان و سەرۆک حزبەکانی ئەوکاتەی ئێراقمان کرد. لەوانە: (کامیل چادرچی، مەهدی کوبە، تۆفیق مونیر، عەبدولفەتاح ئیبراهیم)، لە هەموو ئەم سەردان و چاوپێکەوتنانەشدا جگە لە گفتۆگۆ، نووسراوێکمان پێبوو لەسەر کۆتاییهێنانی شەڕو ئاشتی بۆ کوردستان و پێشکەشمان دەکرد.

وەزیری ناوخۆمان بینی، وەزیری دادمان بینی، سەردانی هێندێک لە ڕۆژنامەکانیشمان کرد لەوانە کە ئەوسا لە بەغدا دەردەچوون، لەناویاندا ڕۆژنامەی (الرای العام)، کە

شاعیری گەورەی ئێراق و دۆستی کورد (محەمەد مەهدی ئەلجواهیری) سەرنووسەری بوو.

ڕۆژی دوایی سەردانەکەمان بۆ بەیانی، لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەدا، دەقی نووسراوەکەی ئێمەو وێنەی وەفدەکەی کوردستان بڵاوکرابووەوە.

لە بەشێکی ئەو نووسراوەدا، ئێمە داوای مافی کوردو جۆرێک لە خۆبەڕێوەبەریمان بۆ کوردستان کردبوو، جەواهیری لە ڕۆژنامەکەیدا ڕەخنەی لە میریی دەگرت. ڕۆژنامەکانی تریش هەواڵی سەردانی وەفدەکەیان بۆ بەغدا بڵاوکردەوە، کە داوای ئاشتی بۆ کوردستان دەکەن، بەڵام ڕۆژنامەی (الرای العام) کە شیوعییەکان بەڕێوەیان دەبرد، بەهۆی بڵاوکردنەوەی نووسراوەکەی ئێمەوە، پاش ماوەیەک داخراو دواتریش هەر لە ڕێگای حزبی شیوعییەوە (محەمەد مەهدی ئەلجەواهیری) ڕەوانەی (براگ) کرا.

یەکێک لەو شتانەی لە سەردانەکەماندا دەمەوێت سەرنجتانی بۆ ڕابکێشم، هەڵوێستی باڵیۆزی ئەمریکایی بوو لە بەغدا. لەو ماوەیەدا کە لە بەغدا بووین لەناو هێندێک ئەندامانی وەفدەکەدا باس لە سەردانی باڵیۆزخانەی ئەمریکایی کرا، هێندێک لایەنگری نەبوون و پێیان وابوو ئێمە لەبەرئەوەی شیوعین، ڕەنگە حکومەت لەسەر ئەو کارە بمانگرێت.

لەناو وەفدەکەدا من لە هەموویان تەمەنم کەمتر بوو، قوتابیش بـووم، گوێم بە هیچ نـەدەداو هێندێکی تریش لایەنگری سەردانی باڵیۆز بوون، بۆیە بڕیارمان دا ملی ڕێگا بگرینەبەر بۆ باڵیۆزخانەی ئەمریکایی. پاش ئەوەی چووینە باڵیۆزخانەو خۆمان ناساند، دەرفەتیان دا کە باڵیۆز ببینین.

لـەو دەمــەدا بەهۆی ئـەوەی (کـوبـا) ببوو بە وڵاتێکی کۆمۆنیستی، لەلایەن ئەمریکاوە ئابڵوقەی خرابووە سەر. لەمپەڕی دنـیاوە حزبی شیوعی ئێراقیش وەک ئـەوەی خۆی ئیشوکاری نەبێت، ئاگری گرتبوو، دەستی کردبوو بـە هەڵمەتێک بـۆ کـۆکـردنـەوەی ئیمزا بـۆ دژایـەتـی ئەو بڕیارەی ئەمریکا دژ بە کوباو لیستێکی دروستکردبوو ئیمزای کۆ دەکـردەوە، نازانم ژمارەکە ڕاسـت بـوو، یان نا، ئەوسا دەیانوت نیو ملیۆن ئیمزایە، بەڵام ئەگەر ئەو ژمارەیە ڕاستیش نەبێت، لەبەرئەوەی هەموو ئەو لیستانە کۆکرابوونەوەو خرابوونە گوێنییەکەوەو درابوون بە کۆڵی مندا، بۆئەوەی لەبەردەمی باڵیۆزی ئەمریکاییدا هەڵیڕێژم، دەمزانی کە ژمارەیەکی زۆرە.

وەستا عارفی خەیات، مشکی و جامانەی تێکەڵ کردبوو، بەهەیبەت و چوارشانەو قیافەت، پێشمان کەوتبوو، لەناو

ئەوانەدا کە چووین بۆ باڵیۆزخانە (فایەق نوری) لەبەرئەوەی ئینگلیزی باش دەزانی، کەوتە قسەکردن و کابرای باڵیۆزیش کەسێکی لەگەڵ بوو، کە قسەکانی دەکرد بە عەرەبی.

فایەق وتی: "ئێمە وەفدێکین لە کوردستانەوە هاتووین و داوای ئاشتی دەکەین بۆ کوردستان"و هێندێکی تر لەم قسانە، پاشان هاتە سەر ئەوەی، کە ئێمە بە ناوی گەلی کوردستانەوە هاتووین و ئەو هەموو ئیمزایەشمان هێناوە، بۆئەوەی دژایەتی خۆمان بۆ ئەو گەمارۆیە ڕابگەیەنین کە ئەمریکا بەسەر کوبادا سەپاندوویەتی!

کابرای باڵیۆز کەڵەگەتێکی تێکسمڕاوی جوانپۆش بوو، گوێی بۆ قسەکانی فایەق ڕاگرتبوو، کە تەواو بوو تۆزێک بێدەنگ بوو، وتی: "کارێکی باش دەکەن داوای ئاشتی دەکەن بۆ کوردستان". پاشان دەنکە شقارتەیەکی داگیرساندو نای بە پایپەکەی دەمییەوە، وتی: "هەموو ئەم ئیمزایانەی ئێوە بە یەک دەنکە شقارتە دەسووتێت". پێش ئەوەی ئاگری دەنکە شقارتەکە بکوژێتەوە، فڕێی دایە سەر لیستی ئیمزاکان، کە من هەڵمڕشتبوون، باش بوو دەنکە شقارتەکە کە کەوتە سەر ئەو هەموو کاغەزە، کوژایەوەو ئاگری لێنەکەوتەوە. ئینجا وتی: "نازانم ئێوە پەیوەندیتان بە کوباوە چییە؟ ئەمە پەیوەندی بە ئێراقەوە نییە، پەیوەندی بە

خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە نییە، ئێمە ئاگامان لێیە ڕۆژانە فڕۆکەی میک گوندو باخەکانتان دەسووتێنێت و کوردستان وێران دەکات، بۆ ناچن دوای بارزانی بکەون و شۆڕش بکەن؟!"

بێگومان ئەوسا ئێمە ئەم قسانەی کابرای باڵیۆزمان بەدڵ نەبوو، زۆریش سەرمان لێسوڕما، پاش تەمەنێک ئینجا زانیم ڕاست دەکات و لە دڵی خۆشمدا دەستخۆشیم لێکرد، کە دوای قسەکانی هەڵساو بەجێیهێشتین و بەوەش مەبەستی لەوە بوو "قاوەکانتان بخۆنەوەو فەرموون بۆ دەرەوە".

## ٧- فەسڵکردن لە خوێندن.

ئەم چالاکی و خۆپیشاندان و مانگرتن و پەتپەتێنە هەروا ئاسان نەبوو، لە ڕاستیشدا ئەگەر سەرسەختیی نەبێت، زەمینە بۆ هیچ شتێکیش لەبار نەبوو.

ئێمە وەک لیژنەی قوتابیان خزمێکی (جەلالی میرزا کەریم) لەنێوان گەڕەکی (سەرشەقام)و (بەرخانەقا)دا ژوورێکی بەکرێ دابووینێ و ئەو ژوورەمان کردبوو بە نێوەندو نووسینگەی چالاکییەکانمان و کاری حزبیمان تێدا دەکردو بەیاننامەو بڵاوکراوەمان لەوێ دادەناو دابەشمان دەکردن.

زۆرجـار لە هاتوچۆکردنیشدا بەناو ئەو گەڕەکانەدا دووچاری شەڕوشۆڕ دەبووین، بەتایبەت کە شەقاوەکانی پارتی لە پارێزدا بوون، بۆئەوەی کوڕوکاڵی شیوعی بێزار بکەن.

شەوێکیان من و جەلالی میرزا کەریم و برادەرێکی تر بووین، بەیانی حزبمان بڵاودەکردەوە، شەقاوەی پارتی دوامان کەوتن، جەلال لە تەمەندا تۆزێک لە من گەورەتر بوو، لەبەرئەوەی خەپەو قەڵەو بوو وەکو ئێمە فریای ڕاکردن نەکەوت، بۆیە شەقاوەکان کەوتبوونە ویژەی و زۆریان لێدابوو، هەتا کار بەوە گەیشت کە ئەگەر نەمانگەیاندایەتە نەخۆشخانە، زایە دەبوو، چونکە سەرو پۆتەڵاکیان بەجاریَ شکاندبوو!

جەلالی میرزا کەریم کوردێکی پاک و شیوعییەکی دڵسۆزو خوێندەوارێکی زەمانی خۆی بوو، جگە لەوەی لە دامەزرێنەرانی تیپی مۆسیقاو نواندنی سلێمانیدا بەشدار بـووە، لـەو پێشڕەوانەشە کە دەستی لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا هەیە.

ڕۆژێکی ناوەڕاستی مانگی ڕەشەمێی ساڵی (١٩٦٢) بوو، نووسراوێک لە بەغدای پایتەختەوە دێت بۆ ئامادەیی پیشەسازیی سلێمانی و بڕیاری فەسڵکردنی جەنابم و چوار

قوتابی تری تیا دەبێت. لەسەر کاری سیاسی فەسڵکرام و ئیتر بۆ من نەبوو شەوان بچمەوە بەشی ناوخۆیی، بەڵام لەبەرئەوەی لەلای زۆربەی قوتابییەکان خۆشەویست بووم، ئێواران دوای ئەوەی دەرگا دادەخرا، بەسەر دیوارەکەدا هەڵدەگەڕام و لەناو ژووری یەکێک لە هاوڕێکانمدا جێی خەوی شەوم دەکردەوە.

مامۆستا (نوری گوشاد) سەرپەرشتیاری بەشی ناوخۆیی بوو، پیاوێکی نەتەوەیی توندڕەو بوو، زۆر ڕقی لە شیوعییەکان بوو، شەوان مامۆستایەکی عەرەبی موسڵاوی لە بەشی ناوخۆ دەمایەوە، هەواڵی دابوو بەو کە گوایە من شەوان بە نایاسایی لەلای قوتابیان دەمێنمەوە. ئیستا هیچ گلەیم لێی نییە بۆ ئەو، ئەوە بەشێک بوو لە خەباتی سیاسی لەو دەمەدا.

شەوێکیان مامۆستا موسڵاوییەکە هاتە ئەو ژوورەی منی لێبووم، لەپشت پەردەی پەنجەرەوە خۆم شاردەوە. لە درزێکی پەردەکەوە ئاگام لێبوو، سەر قەرەوێڵەو ژێر قەرەوێڵەی بۆ سۆراغی من دەپشکنی.

ئەوسا قەرەوێڵەکان دووقاتیش بوون، بەڵام هیچی دەست نەکەوت و بەدەم بۆڵەبۆڵەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

ژیان ئاوا ناچێتە سەر، گلۆڵەم کەوتە لێژیی و ئیتر

ئەوەبوو بە ئەمری حزب کرام بە ئەندامی لیژنەی قەزای هەڵەبجە، هەڵەبجە خۆت بگرەو هاتم.

٨- وتارێك لە هەڵەبجە.

ساڵی (١٩٦٢) بەهۆی کارو چالاکی سیاسیمەوە لە لیژنەی قوتابیان بە بڕیاری وەزارەتی مەعاریف لە خوێندن دەرکرام. کار بەمەوە نەوەستا فەرمانی دەستگیرکردنیشم دراو لە سلێمانی کونە مشکم لێ بوو بە قەیسەری.

ئیتر ئەوەبوو لەسەر بڕیاری حزب گواسترامەوە بۆ هەڵەبجە، ئەودەمە بەرپرسی قەزای هەڵەبجەی حزب (نائب عەبدوڵلا) بوو، ئەندامی لیژنەی محەلیش بوو، دوایی بوو بە ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی و گیراو تووشی دەردەسەریی بوو.

من لە هەڵەبجە ناشارەزا بووم، هاوڕێیانی حزب شوێنی پشوودان و نیشتەجێبوونیان لە ماڵێکدا بۆ دابینکردم، بەڵام هەر زوو لەوێش هەڵکەندرام و ڕامکرد.

لە داخی فەسڵکردنم لە خوێندن و دەرکردنم لە سلێمانی، هەر کە گەیشتمە هەڵەبجە، وەک داشەهارەم لێهات. ئەودەمە دروشمی حزبی شیوعی (ئاشتی بۆ کوردستان) بوو، لەژێر پەرچەمی ئەم دروشمەدا لە بەغداو شارەکانی ئێراق و لە

کوردستانیش خۆپیشاندان ڕێکخرابوو، ئێمەش لە هەڵەبجە کەوتینە خۆمان و لە ناوەڕاستی مەیانی بازاڕدا گردبووینەوە، پێنجسەد بۆ شەشسەد کەسێک تێمان ئالان و ئالای چەکوش و داس بڵند کراو بازاڕی هەڵەبجە سوور دەچووەوە.

لەو گردبوونەوەیەدا من وتارێکی شۆڕشگێڕانەی حەماسیم داو ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە بکەومە بەر چاوان و دەسەڵاتی میری بکەوێتە شوێنم و هەوڵی گرتنم بدەن.

بەهۆی ئەو وتاردانەوە لە هەڵەبجەش گلۆڵەم کەوتە لێژیی و حزب یەک دوو کەسیان لەگەڵمدا دانابوو، بۆئەوەی بمپارێزن و لە چاوی میریی ونم بکەن.

لەبەرئەوەی ماڵە شیوعییەکانی ئەو شارە هەمووی پشکنینیان بۆ کرا، منیان گواستەوە بۆ ماڵێکی تر، کە ماڵە هەژارێکی وابوو کەس نەیدەناسین.

بارودۆخەکە دوای ئەو گردبوونەوەو خۆپیشاندانە لە هەڵەبجە زۆر ئاڵۆز بوو، میریی زیاتر لە سەدو پەنجا کەسی دەستگیر کردبوو و زۆر مەبەستیشیان بوو من دەستگیر بکەن، بەتۆمەتی وتاردان و سەرپەرشتیکردنی خۆپیشاندانەکە.

هەڤاڵانی حزب ئاگاداریان کردمەوە کە میریی بەتایبەت

بە شوێن مندا دەگەڕێت، بۆیە دوو کەسیان لەگەڵدا ناردم تاکو بمبەنە دەرەوەی شار.

شوێنێک هەبوو لە خوار هەڵەبجە پێیان دەوت (حەمەئۆغان) ئێستا بۆتە بەشێک لە شار، ئەو برادەرانەی کە حزب ڕایسپاردبوون ژیانی من بپارێزن وتیان: "ئێمە فەرمانی حزبمان پێیە بتبەینە ماڵی فلانی"، بەڵام من وتم: "خۆم هاوڕێیەکی ئامادەیی پیشەسازیم هەیە لە بەشی ناوخۆیش لە ژوورێکدا پێکەوە بووین، ناوی (ساڵح)ەو چاویلکەشی لەچاودایە، بمبەن بۆ لای ئەو". بە چاویلکەکەیدا ناسییانەوەو بردیانم بۆ ماڵی ساڵحی هاوڕێم.

ساڵح خۆی و دایکی بوون و باوکی کۆچی دوایی کردبوو، کە منی بینی سەیری لێهات، وتی: "ئەوە لەکوێوە پەیدابوویت"!

یەکێک لەو دووانەی کە حزب دایان نابوو لەگەڵمدا بن، ناوی مەهدی بوو، (مەهدی شێخ عابید)یان پێدەوت، تا ماڵی ساڵحی هاوڕێم لەگەڵمدا بوو، وابزانم دوایی بوو بە مامۆستاو نازانم ئێستا لە ژیاندا ماوە، یان نا؟

مەهدی وتی: "وا ئێمە گەیاندمانیتە شوێنی مەبەست، شوێن نەماوە لە سلێمانی و هەڵەبجەدا میری بەدوای تۆدا نەیپشکنیبێت، ئیتر مادام خۆت ئێرەت هەڵبژاردووە،

ئاگاداری خۆت بە".

زۆربـــەی نـەتـەوەپـەرسـتـانـی عـــەرەب و لـە شۆڤێنی و بەعسییەکان دەسـتـیـان گرتبوو بـەسـەر دامـودەزگـا فەرمییەکانی ئێراق و تەنانەت چواردەوری (عەبدولکەریم قاسم)یشیان تەنیبوو.

ئەوانە ببوونە تەونێکی جاڵجاڵۆکەیی و دەستیان بەسەر هەمووشتدا گرتبوو، دەستیان نابووە بینەقاقای ئازادی و دیموکراسییەوە. دەستیان بەسەر ڕادیۆدا گرتبوو، کە لەو سـەردەمـەدا ڕادیـۆ زۆر گرنگ بـوو، ڕۆژنامەکانیان خستبووە سایەو سێبەری بیروبۆچوونی خۆیانەوە، هیچ دەرفەتێک بۆ ئازادیی دەربڕین و گوزارشت نەمابووەوە، جگە لە ڕۆژنامەکەی حزبی شیوعی، ئەو ڕۆژنامەیە سایەو سەیوانی دۆزی کوردو دیموکراسی بوو.

دەزگـای پۆلیس و ئاسایش و زۆربـــەی دەزگاکانی دەوڵەت کەوتبوونە دەست نەتەوەچی شۆڤێنی عەرەبی و بەعسی. ئەوانە وەک کرمی دار دابوویانە جەستەی دەوڵەت و دواجار هەر ئەوانیش سەری قاسم-یان خوارد.

خـەڵـک هیچ ئومێدێکی بـە دروشـمـەکـانـی شـۆڕشی چـواردەی تەممووزو هیچ هیوایەکیشی بە قاسم نەما. ڕەشبگیریی دەستی پێکردو ئـەوەی بۆنی شیوعییەتی

لێبهاتایە، دەگیراو ئەوەی هەقی هیچیشی نەبوو بەس ناوێکی هەبوو، ئەویش لەسەر کوردایەتی دەگیرا، بە ڕادەیەک لەو دەمەدا بەندیخانەکان سیخناخ ببوون.

لەو ماوەیەدا من ئەندامی لیژنەی قەزاو بەرپرسی ناوشاری هەڵەبجە بووم و جارجاریش سەردانی دێهاتی دەوروبەرو دەشتی شارەزووریشم دەکرد. خەڵکی ناوچەکە بەشی زۆریان ببوون بە شیوعی لە دێی گامێش تەپە، کوڕەکەی (کوێخا مەحمود حەمەڕەشید)یش ببوو بە شیوعی و ئەندامی لیژنەی قەزا بوو.

جاری وا هەبوو دە بۆ پانزە ڕۆژ بەناو دێهاتەکانی ناوچەکەدا دەگەڕام و هەتا تەوێڵەو بیارەش دەچووم، دەگەیشتمە هەر دێیەک خەڵکێکی زۆر کۆ دەبوونەوە، لەبەردەمی مزگەوتدا دەستم دەکرد بە گوتاردان و سیاسەتی حزبم بۆ ڕوون دەکردنەوە.

لەو گەشتانەدا ئەوەی سەرنجمدابوو، بەشێکی زۆری ئەوانەی کە کۆدەبوونەوەو چالاکانە ڕۆڵیان دەبینی، کچان و ژنانی گوندەکان بوون، کە بە پەرۆشەوە بەشدارییان لەو کۆبوونەوە سیاسییانەدا دەکردو دەیانویست بێنە ناو ڕێکخراوەکانی حزبەوە.

هەموو ئەو ماوەیەی لە هەڵەبجە بەسەرمبرد، ژیانێکی نهێنیم هەبوو، چونکە میریی بەردەوام دەیویست دەستگیرم بکات، بۆیە لەناو هەڵەبجەدا دوو سێماڵیان بۆ دیاری کردبووم، هەرجارەی لە یەکێکیان خۆم دەشاردەوە. ئەو ماڵانەش هەریەکەیان حەشارگەیەکی نهێنییان تیابوو، ئەوە بەمەبەستی خۆشاردنەوە بوو لەکاتی هەڵمەتی ناوەخت و شەوانەی پۆلیس و پیاوانی میریدا. بەمجۆرە توانیم لەو ماوەیەدا بە چەرمەسەریی بیگوزەرێنم و دەست میریی نەکەوم.

شتێکی تر کە لە گرتن ڕزگاری کردم، ئەوە بوو کە لەو دەمەدا بەشێک لە خێڵەکانی هەڵەبجە لە (نەورۆڵی و کۆکۆیی و جاف) ببوونە چەکداری میریی، بەڵام وەکی تر ژێربەژێر پەیوەندییان بە پارتی و شیوعییەوە هەبوو، ئەمەش هێندێک سودی بۆ ئێمەومانان هەبوو، تا لە گرتن و کوشتن قوتارمان ببێت.

بە دەردەســەریـی ڕامکێشا هـەتـا سـاڵـی (١٩٦٣)، تا ئەوکاتەی کودەتا بەسەر قاسمدا کراو کۆتایی بە ئەفسانەی شۆڕشی تەمموز هات و خەونەکە بوو بە دێوەزمە.

٩- یەکەمجار چۆن مام جەلالم ناسی.

هێواش هێواش لەسەر پشکۆ قازانی مێردان قوڵپی دەداو لە ئاسۆی سووردا ئەستێرەی شۆڕشی ئەیلوول لە بارودۆخێکی ئاڵۆزی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خەریک بوو دەدرەوشایەوە.

لەو ماوەیەدا کە لە هەڵەبجە بووم، هەم بۆ کاری سیاسی و حزبی و هەم سەردانی کەسوکارو ئەرکی کۆمەڵایەتی، پێیەکیشم لە پێنجوێن بوو.

لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا، هێزێکی گەورەی پارتی بە فەرماندەیی مام جەلال لە ناوچەی چەمی شلێری پێنجوێن گلێرکرابوون. بنکەکانی پۆلیسی دەوروبەری پێنجوێن لە ترسی ئەو هێزەی پێشمەرگە، هەموو شوێنەکانی خۆیان چۆڵکردبوو، تێکڕا خزابوونە ناو سەرای پێنجوێنەوەو لەناو بینای قایمقامییەتدا خۆیان تووند کردبوو.

بینای قایمقامییەت قشڵەیەکی کۆنی عوسمانی بوو، کاتی خۆی کە ئینگلیزەکان ناوچەکەیان داگیرکردبوو، وەک پێگەیەکی بەهێز بۆ خۆیان بە کۆکی و مەحکەمی دروستیان کردبوو. هێزەکانی میریی لەو بینایەدا وەکو ئەوەی خۆیان بۆ ڕووبەڕووبونەوەیەکی گەورە ئامادە بکەن، پۆشتەو پەرداخ بە چەک و تفاقەوە لەپارێزدا بوون.

فڕۆکەکانی میری ڕۆژانــە دەوروبـــەری پێنجوێنیان بۆردوومان دەکرد، خەڵک پێوە دەبوون، ڕەزو باخ و پاوان دەسووتان، ماڵ وێران دەبوون و عەمبار دەسووتان.

بەناچاریی خەڵکیی پێنجوێنیان چۆڵکردو هەریەکەی بە لایەکدا سـەری خۆی هەڵدەگرت، وا ڕێکەوت من سەرم لە گوندی (بناوەسووتە) دەربهێنمەوە. خۆر لە ئاوابووندا بوو گەیشتمە بناوەسووتە، بینیم بە قەدپاڵێکەوە پۆلێک پێشمەرگە لە فارماندەکەیان کۆبوونەتەوەو قسـەیان بۆ دەکات، وەک ئەوە وابوو خۆیان بۆ پەلامارێک ئامادە بکەن. لە دواییشدا هەروا دەرچوو، ئەوانە هێزەکەی مام جەلال بوون چاوەڕوانی ئەوە بوون تاریک دابێت و بدەن بەسەر پێنجوێندا.

کە نزیکبووینەوە لە پێشمەرگەکان، یەکێکیان ناسیاوی خۆم بوو و بانگی لێکردم و دوای سـڵاوگۆڕینەوە وەک بەرپرس و کادری شیوعی ئەو ناوچەیە منی بە مام جەلال ناساندو وتی: "ئەمە فلانییە".

بێگومان من پێشتر نـاوی مام جەلالم بیستبوو وەک فـەرمـاندەو سیاسی و ڕووناکبیرو چەپێکیش دەمزانی شتی زۆری لـەبـاردایـە، بۆیە ئـەو وێـنـەیـەی بـە فلچەی خەیاڵ لە چوارچێوەی تابلۆیەکدا لە لام دروسـت ببوو،

ئەوە بوو کە ئەو جوامێرە پیاوێکی ڕیشسپی بەتەمەن و قاڵبووی خەباتەو گۆچانێکی بەدەستەوەیەو سەرکردایەتی لەشکرێک پێشمەرگە دەکات، بەڵام ئەوەی بینیم گەنجێکی چست و چالاک و قنج ودەم بەپێکەنین. تا من هەنگاوێکم نا بۆئەوەی سڵاوی لێ بکەم، ئەو سیانی هەڵهێناو دەستی خستە سەرشانم و بە خەندەیەکی دۆستانەوە وتی: "برای کۆمۆنیست چۆنی؟".

هەنگاوێکی هەڵهێناو ناو قۆڵی خستە ناو قۆڵم، لەوکاتەدا ئاگام لێبوو خەڵکەکە لایان سەیر بوو کە مام جەلال منی لەوان دوورخستەوەو لای دەوەنێکەوە بە تەنها گفتوگۆم لەگەڵ دەکات, بەشێک لە گفتوگۆکە ئەوە بوو، کە پرسیاری منی کردو منیش بۆم باسکرد کە قوتابیم و بە کاری حزبییەوە خەریکم. ئەو مەبەستی بوو کە من لەناو شاری سلێمانیدا قوتابیم، وتی: "مادام دەتوانیت هاتوچۆ بکەیت، ئیشمان پێت دەبێت، لە کاتی خۆیدا لە ڕێگای برادەرانەوە ئاگادارت دەکەینەوە".

### ١٠- مەخفەرەکەی پێنجوێن چۆن گیرا؟

دەمزانی کە ئەمشەو، یان شەوی دوایی قەڵای میریی کە سەراو بینای قایمقامییەت و مەخفەری پۆلیسە، پەلامار

دەدرێت و دەگیرێت، بۆیە لەگەڵ دەستەیەک لە گەنجی هاوڕێم گەڕاینەوە بۆ ناو شار، بەتایبەت کە ماڵمان نزیکی مەخفەرەکە بوو، پێمان باش بوو لە ماڵەوە بین نەبادا لەکاتی پەلاماردانی مەخفەرەکەدا کار لەکار بترازێت و ڕاو و ڕووت و تالانی بەرۆکی گەڕەکەکانی شار بگرێت.

ئیتر ئەو شەوە هەموو کۆبووینەوە تەقەی تفەنگ دەهات، غارغارێنی سوارو دەنگی هاتوچوون و فڕکان فڕکانی خەڵک، هاتوهاوار وەک ئەوە وابوو مەخفەرەکەی پێنجوێن بووبێت بە چەقی گەردوون و هەموان بە دەوریا بخولێنەوە.

قایمقامی پێنجوێن کە زانیبووی پێشمەرگە بە نیازی پەلامارن، تێی تەقاندبوو بەرەو سلێمانی، بۆیە ئەوەی مابووەوە لەو ناوەدا نوێنەرایەتی میریی دەکرد (معاون کەمالی شێخ غەریب) بوو، کە هەر خۆشی فەرماندەی هێزی پۆلیسی دەکرد لەناو بیناکەدا.

ئیتر لە بەینی تەقەو تریقەی تفەنگدا جارجار دەنگێک هاواری دەکردو دەیوت: "دەبێت خۆتان بەدەستەوە بدەن و چەکەکانتان ڕادەستی شۆڕش بکەن". لەناو تاریکی شەوداو بەدوای تاق تاق کەرەی تفەنگدا، جارجار ئەم بانگە دەدرایەوە بە گوێی کەمالی شێخ غەریبدا.

کەمال کوڕێکی ئازاو مەرد بوو، نەیدەویست خوێن بڕژێت، بۆیە دواجار بەدەم بانگەکەوە هات، بەڵام مەرجی ئەوەی دانا کە (حەمەڕەشیدخانی بانە) ئامادە بێت، ئەوسا مەخفەرەکە ڕادەست دەکات.

هەروەش بوو مەرجەکەی کەمال قبوولکراو حەمەڕەشیدخانی بانە هەتا مەیدان و مۆرو مشەمای میریی درایە دەست مام جەلال و بەمجۆرە پێنجوێن بە تەواوەتی کەوتە دەست شۆڕش.

کەمالی شێخ غەریب، ئامێری بێتەلی پەیوەندیکردن و پانزە هەزار دینار کە لە قاسەی میریدا بوو، لەگەڵ چەک و تەقەمەنی و ئۆتۆمبێل و چی هەبوو و نەبوو دایە دەست شۆڕش و دوایش خۆی بوو بە پێشمەرگەو فەرماندەیەکی شۆڕشی ئەیلوول.

ئیتر پۆلیس و فەرمانبەری میریی ئەوەی خەڵکی پێنجوێن بوو، چووەوە ماڵی خۆی و بەشێکیشیان بوون بە پێشمەرگەو نۆرەی کاریگەریان هەبوو لە شۆڕشدا.

ئەو شەوەی مەخفەرەکە گیرا، بۆ بەیانی لە یادمە من و (قادری حاجی حسێن)، کە کادری حزبی شیوعی بوو، لەگەڵ (تۆفیقە سمێڵ)، کە بەرپرسی جووتیارانی شیوعی بوو، چووینە ناو بینای مەخفەرەکە، دیاربوو شەو هەرچی

تیادا بوو، برابوو، هێندێک فەرمانبەری کوردو عەرەبیش لەو ناوە مابوون.

لەناو مەخفەرەکەدا بەشێک هەبوو بۆ کاروباری سیاسی و ئاسایش تەرخان کرابوو، لەوێ نووسراو و بەڵگەو فایلێکی زۆر بەجێمابوو، کەس دەستی لێ نەدابوو، ئێمەش هەموویمان کۆکردەوەو کردمانە چەند گوێنییەکەوەو دامان بە تەنگەی شانمانداو دوایش چارەنووسی ئەو فەردانە ئەوە بوو لە سلێمانی هەموویم دایە دەست (مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی)، کە ئەودەمە بەرپرسی حزبی شیوعی بوو لە سلێمانی.

گرتنی مەخفەرەکەی پێنجوێن بایەخی خۆی هەبوو، لە ڕۆژنامەکانی ئێراق و دەرەوەدا دەنگدانەوەی زۆری هەبوو و جۆش و خرۆشێکیشی دا بە بزووتنەوەکە.

## ١١- هەڵوێستی حزبی شیوعی.

حزبی شیوعی لە بارودۆخێکی ناسکدا بوو، دەیزانی کە ئەگەر قاسم بکەوێت، بەیەکجاریی شۆڤێنییەکان و بەعسییەکان دەرفەت دەقۆزنەوەو هیچ پەراوێزێکی دیموکراسیش لە ئێراقدا نامێنێت.

وەکو کوردیش کە بەشێکی زۆری سەرکردەو کادرەکانی شیوعی کوردبوون، نەدەکرا پشت لە مەسەلەی مافەکانی کورد بکات.

سەبارەت بە لایەنگیریی و بەشداری لە شۆڕشی ئەیلوولدا، ڕاو بۆچوونی جیاواز هەبوو لەناو حزبدا. ئەوەیان دەبێت وازلێبهێنین بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێت بچنە نێو وردەکاریی و بەراوردکاریی، بەمەبەستی قۆناغە جۆراوجۆرەکانی مێژوو.

ئاراستەی ڕووداوەکان بەرەو ئەوەیان بردین کە ڕاوبۆچوونێک بخەملێت سەبارەت بەوەی کە مادام بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەو چەکداریی لە کوردستاندا دروستبووە، باشترە ئەندامانی حزب تێیدا بەشداربن و شوێنە گرنگەکان کۆنترۆڵ بکەن و پێشەنگ بن و ڕێگە نەدەن بزووتنەوەکە بکەوێتە دەست خێڵ و بنەماڵەو دەرەبەگ و بە پێچەوانەوە بیکەینە بزووتنەوەیەکی چەپی کوردی، ئەمەش بۆ زۆربەمان بیانوویەک بوو کە لەو کاتەدا نزیک بوو لە واقیعی بارودۆخی ڕۆژگارەکە.

لەسەر ئەو بنەمایە بە ئاراستەی دروستکردنی هێزێکی چەکدار، چالاکی حزبی دەستی پێکرد. ئەوەندەی پەیوەستیش بێت بە منەوە، کەوتمە جموجوڵ و لە هەڵەبجە،

پێنجوێن، دەربەندیخان، قەرەداغ و هەتا دەگاتە دەوروبەری چەمچەماڵ و لەمبەریشەوە هەتا سورداش، چەکدارمان بۆ ئەو مەبەستە ڕێکدەخست و لە هەر دێیەک پێنج شەش چەکدارێکمان یەکدەخست.

لە گوندی (گامێش تەپە)ی شارەزور سێسەدو پەنجا چەکدارێکی سەر بە حزبی شیوعی گردبوونەوە، لە شوێنی تریش بێگومان ئەندامانی حزب و ڕێکخراوەکان دەستیان بە خۆچەکدارکردن کردبوو. لەڕاستیدا ئەمە بۆ حزبی شیوعی جۆرە مانۆڕێکیش بوو، کە وا دەردەکەوت دەیەوێت پیشانی پارتی بدات، کە ئەویش دەتوانێت بەشێوەی چەکدارانە خۆی ڕێکبخات.

بێگومان ئەم کۆبوونەوە چەکدارییانە کێشەو گرفتیشی لێکەوتەوەو لە ناوچەی (بەمۆ)و لای (قەڵادزێ)ش تەقوتۆق و پێکداپڕژان لەنێوان بەشێک لە جووتیارانی چەکداری سەر بە شیوعی و پارتیدا دروست ببوو.

ئیتر ئەوەبوو ئێمە لە بناری شارەزوور بووین، هەردوو هاوڕێیان (عەزیز محەمەد)و (کەریم ئەحمەد)، کە هەردووکیان لە بارودۆخی دواتری وڵاتدا گەیشتنە پلەی سکرتێری حزبی شیوعی، هاتن و سەرکۆنەیان کردین و پێیان وتین: "حزبی شیوعی دژی بزووتنەوەی چەکدارییە"،

تەنانەت کار گەیشت بەوەی کە لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو کەسانەشدا بکرێت، کە ئەندام و لایەنگرانی حزبیان چەکدار کردووە!

هێندێک لە کادرو ئەندامانی حزبی شیوعی بەمە وازیان لە حزب هێناو وتیان: "ئێمە تازە لای میریی ئاشکرابووین و وا لەقەڵەمدراوین کە چووینەتە بزووتنەوەی شۆڕشی ئەیلوولەوە". ئەوانی تریش بڵاوەیان پێکراو وتیان: "هەرکەسە بچێتەوە ماڵی خۆی"، کاک عەزیز محەمەدیش ڕووی کردە من و وتی: "نازانم تۆ چیت داوە لەم هەڵای چەکدارییەو بۆ ناچیتەوە بەلای تەواوکردنی خوێندنەکەتەوە"!

## ١٢- سەبارەت بە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول.

ئەوەی لە خوارەوە دەمەوێت بیگێڕمەوە، نامەوێت وەک هەڵوێستوەرگرتن سەبارەت هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول لەسەرم تۆمار بکرێت، چونکە تەنها دەمەوێت وەک گفتوگۆیەکی لاوەکی بیگێڕمەوە. بۆئەوەی بڵێم "لە شتی لاوەکیشدا گرنگە سەرنج تۆمار بکەین، چونکە ڕەنگە لە ئایندەدا ببێتە جێگای باسوخواس".

ئەوە ڕاستە کە بەشێک لەو نارەزاییانەی بزووتنەوەی شۆڕشی ئەیلوولی تەقاندەوە، ئەوەبوو کە (عەبدولکەریم قاسم) بڕیاری (یاسای چاککردنی کشتوکاڵی) دەرکرد،

ئەمەش لە بەرژەوەندیی ئاغاو خاوەن زەویوزار نەبوو، بۆیە لە زۆر ناوچەی وەکو پشدەرو بادینان و شوێنی تر، ئاغاو خاوەن زەوییەکان پشتگیریی شۆڕشەکە بوون، جگە لەوەش ئێمە کە لە سنووری پێنجوێندا بووین، ئاگاداری ئەوە بووین کە ئێرانییەکان دەستیان لە خۆشکردنی ئاگرەکەدا هەبوو.

لە سەروبەندی دروستکردنی کۆنگرەی نەتەوەییدا لە برۆکسل، یادی بەخێر شەوان لەگەڵ مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد)دا کاتێکی زۆرمان بە گفتوگۆکردن لەسەر ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارە بەسەر دەبرد. بۆی گێڕامەوەو وتی: "من هێشتا لە بەغدا بووم و ڕامنەکردبوو، لەگەڵ (عەبدولحسەین فەیلی) ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی پارتی دیموکراتی کوردستاندا چووینە باڵیۆزخانەی ئێران لە بەغدا، داوای پشتگیری بزووتنەوەکەمان کرد لە دژی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم، ئەمە سەرەتای پەیوەندیی شۆڕش بوو لەگەڵ ئێران". مامۆستا ئیبراهیم لە درێژەی ئەو باسوخواسەدا بە پەشیمانییەوە باسی لەوە دەکرد، کە کورد دژ بە قاسم، پەنای بۆ چەک بردووە.

نامەوێت بچمە سەر ئەو باسە، ئەوەندە نەبێت کە مام جەلالیش بۆچوونێکی هاوشێوەی هەیەو تەنانەت (جەنەڕاڵ بارزانی)یش سەبارەت بە سەرهەڵدانی بزووتنەوەکە ڕایەکی تایبەتی هەبووە.

شتێکم بیرکەوتەوە، با ئەوەش تۆمار بکەم.

برایەکم لەگەڵ پارتی ئیشی دەکرد، لە سەروبەندی گرتنی پێنجوێندا ئاگاداری ئەوە بووم تێکۆشەری بەنامێ (نوری ئەحمەدی تەها)، کە لەوەوبەریش زوو زوو بۆ کۆبوونەوە بە پارتییەکان سەردانی پێنجوێنی دەکرد، ئەمجارە بە نوێنەرایەتی بارزانی هاتبووە پێنجوێن، بۆئەوەی بڵاوە بە گردبوونەوە چەکدارییەکە بکات، بەڵام کارلەکار ترازابوو، ئیتر ئەوەبوو دەربەندی بازیان و دەربەندیخان گیران و میریی کەوتە بۆردوومانی بارزان و ناوچەکانی ترو شۆڕشی ئەیلوول کوردستانی گرتەوە.

بێگومان ئەگەر بە چاوی ڕەخنەگرانە بمانەوێت بە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارەدا بچینەوە، دەتوانین زۆر شت بهۆنینەوە، بەڵام ڕاستییەکیش هەیە کە بۆ هەموو ئەو قۆناغانە ڕاستە کە کورد دژی دەسەڵاتی ئێراقی بۆتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر دەوڵەتی ئێراقی مافەکانی کوردی بدایەو، یان کوردیش قەوارەیەکی سەربەخۆی هەبووایەو بە زۆرەملێ بە ئێراقەوە نەلکێندرایە، چی دابوو لەوەی پەنا بۆ چەک ببات و بۆ ئەم سەرکێشییەی دەکرد؟!

ئەوەی دەمەوێت بۆ مێژوو لەسەرم تۆماری بکەن، ئەم پرسیارەیە، نەک زانیارییەکانی تر کە گێڕامنەوە.

بریمان ڕێی سەخت
ڕێی مەترسیدار
بۆ ڕووناکی بەخت...!
بۆ گوڵی بەهار
ڕێگای مردن، ڕێگای پرداو و تەڵە
چەندمان تەقاند، چەندمان بڕی بە هەڵە...!
چەند دەربەندمان خستە دواوە
چەند لوتکەی هەزار بەهەزار
کێلگەی بەفرمان شێلاوە
لاپاڵ و نزار
هەتا هاتینە پێدەشتی پڕ دڕک و داڵ
لە گۆ کەوتبووین ئەدواین وەک کەڕو لاڵ...!
(تەی)مان کرد دەشتی پان و بەرین
بۆ دەرچوونی هیلاکی بەردمان ئەکرد بە سەرین
پەپوولەیەک رابەرمان بوو پلپلەی باڵی
هیلاکی ڕێ و تاسەی دووری جاروبار ئەماڵی...!
هەرکات ئەیدا هەتاوی بیر لە پژپەشمینی لەشی...!
بە چاوی پڕ لە تینی
بە گەردنی ئەخشینی
ڕێگە دووری پڕ داوی کردە باخچەی ئەوینی
ئنجا منی شکستەی جەورو ستەم
گیرۆدەی گوڵ هی پەپوولە هی (بەستەم)
وەکو هەنگی شانەو هەنگوین لێ دزراو
گەڕامەوە بۆ مژینی گوڵی گەرمی بەر هەتاو...!

١- کودەتا بەسەر قاسم-دا.

بەو پێیەی کە لە ڕووی کارگێڕییەوە پێنجوێن ناحیەیەکی سەر بە قەزای هەڵەبجە بوو، ئەودەمە کە ئەندامی لیژنەی قەزای ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی و بەرپرسی شاری هەڵەبجە بووم، سەرەوکاری ڕێکخستن و کاری حزبی پێنجوێنیش بووم.

ڕۆژێکی ساردی هەینی بوو، لە هەڵەبجە لە ماڵی مامۆستا (مەحمودی شەریف هەللاج) لە گەرمەی کۆبوونەوەدا بووین، بەپرتاو مامۆستا مەحمود خۆی کرد بەژووررداو بە خۆی و ڕادیۆکەیەوە کۆبوونەوەکەی پێ بڕین و وتی: "لە بەغدا کودەتا بووەو زەعیمیش کوژراوە". ئەو ڕۆژە جگە لە ڕۆژی (٨)ی شوباتی (١٩٦٣)، هیچ ڕۆژێکی تر نەبوو.

کۆبوونەوەکەمان تێکچوو و کەوتینە خۆمان و حەشاردانی بەڵگەو کەلوپەلەکانمان، ئیتر دەبوو چاوەڕوانی بڕیاری سەروو خۆمان بکەین، بۆ ئەوەش تەتەرمان نارد بۆ سلێمانی، تا بزانین هەڵوێستی نوێی حزب دوای ئەم کودەتایە چییەو ڕێنماییەکان چین کە دەبێت جێبەجێیان بکەین.

پاش یەک دوو ڕۆژ ئەو ڕێنماییانەی لە سەروو خۆمانەوە بۆمان هاتبوو، وای دەخواست کە خۆمان بۆ قۆناغێکی نوێ ئامادە بکەین.

ڕێنماییەکان چەند خاڵێک بوو، یەکێکیان سەبارەت ئەو ئەندامانەی حزب بوو کە لای میریی ئاشکرابوون، ئەمانە بۆئەوەی تووشی گرتن و زیندانیکردن نەبن، پێویستە لە شاردا نەمێنن و گەنجەکانیش ڕووبکەنە شاخ و ڕێکخستنەکانیش لە دەرەوەی شارو لە هەرشوێنێک بۆیان کرا، بنکەی چەکداریی دابمەزرێنن.

کەوتینە خۆمان و هەریەکە بەلایەکدا هێندێک لە هاوڕێیان بەرەو بناری بەمۆ ڕۆیشتن من و (حەمە کوڵەباڵ) کەوتینە کۆبوونەوە لەگەڵ جووتیارانی دەوروبەری هەڵەبجەو سێ ڕۆژمان پێچوو هەتا گەیشتینە گوندی (لامەرکەزی).

لەماڵی هاوڕێ (ئەولە) وچانێکمان داو بەڕێکەوتین بۆ گوندی گامێشتەپە، لەبەرئەوەی (حەمەڕەشید) خۆی سەرۆکی هۆزی (وردەشاتری) بوو، زۆربەی گەنجەکانی ئەوێش ئامادەییان پیشاندا کە چەک هەڵبگرن. بەزۆربەی گوندەکاندا گەڕاین و شەوێکیش لە شانەدەری لاماندا و ئیتر ئەوە بوو بڕیاردرا کە لە گوندی (وەڵەسم) بنکەیەکی سەربازیی دابمەزرێنین و هاوڕێ (فەریقی کوێخا تالیب)

سەرپەرشتی بکات.

دواتر ڕۆیشتم بەرەو گوندی (چەوتان و کۆڵیتان)و لەگەڵ (جەلالی چەوتان و کوێخا قادری کۆڵیتان و مەلا عەلی و کوێخا قادری زەنگیسەر) کۆبوونەوەیەکم کردو داوام لێکردن، کە بە هەموو توانای خۆیانەوە پشتیوانی (فەریقی کوێخا تاڵیب) بکەن و خۆشم گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک و پێداویستی و باربۆی بنکەکەی وەڵەسم. بەهۆی ئەوەوە کە خەریک بوو هێزی چەکداری ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی زیادی دەکردو بنکەی پێشمەرگایەتیش لە بەمۆو وەڵەسمە لە جۆش و خرۆشدا بوو، هێزەکانمان کەوتبووە بەرچاو، پارتیش ئەمەی پێ ناخۆش بوو.

## ٢- شیوعی قڕان.

لەدوای کودەتاکەی (٨)ی شوبات (عەبدولسەلام عارف) بوو بە سەرۆک کۆمارو (ئەحمەد حەسەن بەکر)یش بوو بە سەرۆک وەزیران، ئیتر لێرەوە ڕۆژانی ڕەشی شیوعی دەستی پێکرد.

میریی کەوتە ویژەی ئەندامان و کادران و لایەنگرانی حزبی شیوعی، ڕەشبگیر دەستی پێکردو شیوعییەکان بوون

بە ئاردی ناو درک، زیندان پڕکرا لە شیوعی و پەتیان بۆ هەڵواسین و سێدارەیان بۆ دامەزراندن و فوویان پیاکرد کە دەبێت شیوعی لە پاکی ئێراقدا قڕ بکرێن!

بە ئیمزای (عەقید ڕەشید موسڵیح ئەلتکریتی) حاکمی عەسکەری عام، بەیانی ژمارە (١٣) دەرکرا، بەپێی ئەو بەیاننامەیە سوپاو پۆلیس و حەرەس قەومی، کە ئەمەیان میلیشیایەک بوو بەعسییەکان دوای کودەتاکەی (٨)ی شوبات دروستیان کردبوو، دەستکراوەن لەوەدا کە لە هەرکوێیەک شیوعییەکیان بینی، سەری پان بکەنەوە.

ئیتر ئەوە بوو ئەوەی کەوتە دەستی میریی سەری دانا، یان یەخسیری بەندیخانە بوو، ئەویتریش بەرەو کوردستان ڕایکرد. بۆ شیوعییەکان، کوردستانیش پەناگەیەکی ئارام نەبوو، چونکە لەو ماوەیەدا کە بەعسییەکان بەیاننامەی ژمارە سیانزەیان بۆ قاتوقڕیی شیوعی دەرکرد، پارتیش بەیاننامەیەکیان دەرکرد کە لەوەی بەعسییەکان باشتر نەبوو.

شیوعییەکان کەوتنە نێوان بەرداشی دەسەڵاتی بەغداو پارتییەوە، کە ئەویش فتوای ئەوە دەدات کە شیوعییەکان ڕیشەکێش بکرێن. ئیتر بنکەو بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەی شیوعی کەوتنە بەر هێرشی پارتی، هەر زوو دایان بەسەر

بنکەکەی وەڵەسمەو بنکەکەی بەمۆشداو دەرگیری و شەڕوشۆڕ ڕوویداو کوشتوبڕی لێکەوتەوە، هاوڕێیانی ئێمەیان چەک کردو دەست و پێ سپی مانەوە. دوایی زانیمان بەشێک لەو هێرشەی کرانە سەرمان دەستی (ساواک)ی ئێرانی لەپشتەوە بوو.

بەشێک لەمە خەتای سەروو خۆمانی تێدابوو، من لە هەڵەبجە بووم نامەیەکمان لە لیژنەی محەلی سلێمانییەوە بۆ هاتبوو، دەڵێت: "شەڕ مەکەن، بەڵام بەرگریی لە بنکەکانی خۆشتان بکەن"، ئەمە وەکو مەتەڵ وابوو!

بەهەرحاڵ بەهۆی بارودۆخی خراپی بەغداو شارەکانی ترەوە زۆربەی سەرکردەو تێکۆشەرانی حزبی شیوعی ڕوویان لە کوردستان کرد، ئەمەش زەمینەی ڕەخساند بۆ دروستبوونی بۆچوونی سیاسی جیاوازو خۆڕێکستنی چەکداری تر.

٣- زیندانی ماوەت.

لە هەڵەبجەوە دەچووین بۆ پێنجوێن بە (سورێن)دا هەڵزنابووین، نزیک گوندی (وەڵەسم) پێشمەرگە ئێمەیان دەستگیر کردو بردینیان بۆ بنکەیەک لە نزیک (سەیدسادق). کابرایەک بەرپرسی بنکەکە بوو لە پێنجوێن، بە (مەحمودی

ناڵبەند) بانگیان دەکرد، یەکێک لە هاوڕێکانم کە لە ناوەندیی پیشەسازیی لە یەک پۆل و یەک ژووری بەشی ناخۆییدا بووین، هات بەپیرمەوەو وتی: "ئەمە فلان کەسەو لەو شیوعییانەیە کە ئێمە بەدوایاندا دەگەڕێین".

لەوردەمەدا پارتی کەوتبوونە گرتنی شیوعییەکان، ئێمەش کەوتینە داوەکـەوەو دەستبەسەرکراین و بردیانین بۆ زیندان لە پێنجوێن. ماوەی ساڵێک زیاتر بوو لە کەسوکارم دابڕابووم، نەیاندەزانی ماوم، یا مردووم، هەواڵم بۆ ناردن کە هیمەتێکم بۆ بکەن، بەڵکو ڕزگارم بێت، دیاربوو ئەوانیش ئەوەی پێیان کرابوو، کردبوویان، بۆیە دوای دوو ڕۆژ ئازادیان کردم.

چەند ڕۆژێکی نەبرد چەکدار دایان بەسەر ماڵەکەمانداو گرتیانمەوەو بردیانم بۆ زیندان، پاشان لەگەڵ کۆمەڵێک لە شیوعییەکانی تری پێنجوێندا بردینیان بۆ زیندانی (ماوەت).

لەڕێگا ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵماندا بوون ڕەفتاریان زۆر خـراپ بـوو، لای (سـیـاگـوێـزە)ەوە پشتوێنێک بەفر بارییبوو، کەچی بەو سەرمایە دەگەیشتینە هەر دێیەک، زیندانییەکانیان لە حەوزی مزگەوت هەڵدەکێشا، بەڵام وایان لەگەڵ من و (جەمال جەلال) نەکردو ئازاریشیان نەدەداین و دەیانوت ئێوە "قوتابین".

بە چەرمەسەریی گەیشتینە ماوەت و خزاندینیانە زیندانەوە، لەوێ لە کادرەکانی شیوعی، جگە لە (ئەورەحمانی ساڵحی خلە)و (سەید تۆفیق)ی کادری جووتیاران، (مام ئەورەحمانە شەل)ی هەولێر، (حەمە سوویەلە) کە دەمناسین، دەیان کادرو ئەندامی تریشی لێبوو، هێندێکیان لەوانە بوون لە بناری بەمۆ گیرابوون، هێندێکی تر لەو شیوعییانە بوون لە بەغدا ڕایانکردبوو، خەڵکی هەموو شوێنێکی تیابوو لە کوردو عەرەب و تێکڕا ژمارەی شیوعییەکان، چل پەنجا کەسێک دەبوون.

زیندانەکە سیخناخ بوو، پڕبوو لە سەربازو ئەفسەری عەرەب و جاش لەوانەی لە شەڕدا گیرابوون، یان خۆیان ڕادەستی پێشمەرگە کردبوو، هەمووشمانیان خزاندبووە هۆڵێکی گەورەوە، کە بە هەزار حاڵ جێگامان دەبووەوە. زیندانەکە هیچ مەرجێکی ژیاری تیا نەبوو، جگە لە ساردو سڕیی، ڕۆژی لەتێک نانیان دەداینێ و بەیانیانیش زوو، سەد کەسێکیان جیادەکردەوەو بەو سەرمایە بەو شاخانەدا هەڵیان دەگێڕان بۆ داربڕین.

ئێواران بە کۆڵ دارەکانیان پێدەهێنانەوەو لەبەردەم نێوەندێکی میریدا پێیان کەڵەکە دەکردن.بارودۆخی زیندانەکە تابڵێی خراپ بوو، برسییەتی تێیدا گەیشتبووە ڕادەیەک،

سەربازی عەرەب کە دەبران بۆ داربڕین لەو سەرنوێلکانەی ماوەت، کەلاکی ئاژەڵی تۆپیویان دەهێنایەوەو لە حەوشەی زیندانەکە دەیانبرژاندو دەیانخوارد.

کوڕێکمان لابوو نانەوا بوو، دەیانبرد بۆ نانکردن، کە دەگەڕایەوە لەتە نان و بەرماوەی دەهێنایەوەو دەیدا بە زیندانییەکان. سەربازێکی عەرەبمان لابوو پەنجەی قاچی لەجێ چووبوو، داوای هەویری لە نانەواکە کرد بۆئەوەی بیگرێتە قاچی، ئێوارە هەویرەکەی بۆ هێنابوو و ئەویش نابووی لە پەنجە گەورەکەی، نیوەی شەو هاوڕێکەی تەنیشتی بارەی لێهەستان، توومەس لەبرسا قەپی کردبوو بە هەویرەکەی قاچیدا.

من دڵەکزەم لەگەڵدا بوو، نەمدەتوانی خواردن بخۆم، تۆزێک نانم دەخوارد بەشی ئەوەی کە بتوانم بەردەوامبم، ئەوی ترم هەڵدەگرت و بە پەتێکدا هەڵم دەواسی، چونکە مشک ئەوەندە زۆربوو لە هەرکوێ داتبنایە، دەیخوارد.

(خولە ئامە) بەناو بەڕێوەبەری زیندانەکە بوو، بەڵام (عەلی برایم دەرویش) بکوژو ببڕ بوو، هەر ئەویش حوکمی دەکرد، عەلی خۆی و عەباسی برای شۆفێر بوون، باوکی (جەمال جەلال)ی هاوڕێشم لە پێنجوێن گەراجی هەبوو، زۆربەی کات کە دەهاتنە پێنجوێن، لە ماڵی ئەوان دەمانەوە،

ئەمە وای کردبوو عەلی برایم دەرویش لەگەڵ ماڵی جەمال جـەلال-دا نـان و نمەک لـە بەینیاندا بێت. بـەهـۆی ئەم پەیوەندییەوە من و جەمال جەلال لە زیندانەکەدا لە هەموان بارودۆخمان باشتربوو.

(خولە ئامە) لەوانە بوو کە لەگەڵ (شێخ لەتیفی حەفید)دا بوو، خۆشی بە دۆستی شیوعییەکان دەزانی، بۆیە لە ڕێگای ئەوەوە پەیوەندیمان بە حزبی شیوعییەوە دەکردو نامەمان ئاڵوگۆڕ دەکرد. هەرکە عەلی برایم دەرویش غافڵ بووایە، دەچوومە ژوورەکەی و نامەم دەخستە ژێر کاغەزەکانی سەرمێزەکەیەوە.

نزیکەی شەش مانگێک لە زیندانی ماوەتدا ماینەوە، شـەش مانگ بـەدەم خۆشە، سەرماو برسێتی و ئـازارو نەخۆشی و بێ نەوایی بەوکەژو کێوانەوە، کە دەنگت بە کەسدا ناگات.

ناخۆشترین ناخۆشییەکان ئـەوەبـوو، تـۆ هاتوویت خەبات بکەیت دژی داگیرکەری وڵاتەکەت، کەچی ئێستا لە زیندانی ئەوانەدایت کە خۆیان بە خەباتکار دەزانن لە دژی داگیرکەری وڵاتەکەت! نازانیت بڵێیت چی و ئەمە چ دەردیسەری و بەدبەختییەکە؟!

ڕۆژانێکی سەختمان گوزەراند، بەڵام لە ڕۆژانی سەختیشدا جارجارە هەر دەروویەک هەیە.

یەکێک لەو دەروانە، هونەرمەند (تەها خەلیل) بوو، ئەو لەسەر ئەوەی شیوعییەکی دەمکراوە بوو و بە ویستی خۆی قسەی دەکرد، هێنرابووە ئەم زیندانەو لەبەرئەوەی هونەری نواندن و شانۆشی خوێندبوو، جارجارە نواندنێکی دەکردو باری سەرشانی هەموانی سووک دەکرد.

لەو زیندانەداو بەو کێوە ساردو سەختانەوە، ڕۆژانی تاڵمان دەگوزەراند، لەپڕ دەروویەکی ترمان لێ کرایەوە، ڕۆژێک هێندێک ڕۆژنامەنووس بە کامێراوە هاتنە زیندانەکەو وتیان "ئەمانە لە چیکۆسلۆفاکیاوە هاتوون"، کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵماندا، مامۆستایەکی هەڵەبجەییمان لەگەڵدا بوو، ئینگلیزی زان بوو، وەکو کەو دەیخوێند. وتیان: "ئێوە جاش و پیاوی دەوڵەتن". وتی: "نەخێر، ئێمە لێرە لەبەر ئەوە زیندانی کراوین، چونکە شیوعین". کابرای چیکۆسلۆفاکی قوشقی بوو، کامێراکەی دا بە زەمیندا، وتی: "ئێمە لە دنیادا پڕوپاگاندە بۆ ئەم شۆڕشەی ئێوە دەکەین، کەچی ئێوەش شیوعییە کوردەکانتان زیندانی کردووە؟!"

ئەمە بوو بە خێروبەرەکەت بۆمان، چونکە لەو دەمەدا زۆربەی وڵاتانی کۆمۆنیستی پشتیوانی شۆڕشی کوردیان دەکرد.

بەرەبەیانێک پێش تاریک و ڕوون لەپڕ دەرگاو پەنجەرەی زیندانەکە شکێندران، وتیان: "شیوعییەکان هەموو ئازاد دەکرێن". ئەوانەی دەرگای زیندانیان شکاندو ئێمەیان ئازاد کرد، جامانە سوری بارزانی بوون، ئا لەو دەمەدا ئاڵای سوری شیوعییەت و جامانەی سور یەک ڕەنگیان دەنواند، ڕزگارمان بوو و دەستلەملانی ئازادی بووین.

ئەو هێزەی ئێمەی ڕزگارکرد، مەلا مستەفا خۆی ناردبووی کە ئەوسا هاتبووە ناوچەی (مەرگە) بۆ لێدانی باڵی (مەکتەبی سیاسی).

٤- لقی کەرەسپی.

پارتی تەنگیان پێ هەڵچنیبووم و بەدوامەوە بوون و (عەبدول وەهاب ئەتروشی)، کە ئەوسا لە فەرماندەکانی پارتی بوو، بڕیاری دەستگیرکردنی دابووم. پێنجوێنم جێهێشتبوو بەرەو هەڵەبجەو دوای ئەوە لە گوندی (عازەبان) خۆم گرتەوە.

ئەوسا مەکتەبی لیژنەی محەلی سلێمانی لە عازەبان بوو، هاوڕێ (ئەحمەد کەریم) لێپرسراوی حزب بوو، چەند ڕۆژێک لەلای مامەوە، پێشنیاری بۆ کردم کە بچم بۆ (قەرەداغ)و وەک بەرپرسی سیاسی لق دەستبەکار بم.

حزب لقێکی لە ناوچەی قەرەداغ دانابوو، کە (سەعیدمەتەر) بەرپرسیاری سەربازیی لقەکە بوو.

(سەعیدمەتەر) ئەفسەرێکی عەرەب بوو، یەکێک بوو لەو چواردە کەسەی کە لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا کۆتاییان بە ڕژێمی پاشایەتی هێناو پێیان دەوتن (زوبات ئەلئەحرار) سەعید شیوعی بوو، لە دوای کودەتاکەی (٨)ی شوبات لە بەغدا هەڵاتبوو، هاوڕێیانی حزب لە ڕێگای دەربەندیخانەوە ،خزاندبوویانە سندووقێکەوەو بە قاچاخ هێنابوویان بۆ سلێمانی.

لەو ماوەیەدا کە لە قەرەداغ بووم، من و سەعیدمەتەر لە ژوورێکدا دەخەوتین، هەرچەند ئازاری پشتی بهاتایە دەیگەڕاندەوە بۆئەوەی کە چۆن بۆ ماوەی بیستوچوار سەعات لە سندووقێکدا شاردوویانەتەوە.

حزبی شیوعی ناحەزو نەیاریشی هەبوون، کە هەلیان دەقۆستەوە بۆئەوەی تانەو تەشەری لێبدەن، یان ناوناتۆرەیەک بە ئەندام و چالاکییەکانییەوە بلکێنن، یاخود ناشیرین و دزێوی بکەن، ئەمەش بەشێک بوو لە ململانێی سیاسی ئەو ڕۆژگارەی کە کەرەسپی تێیدا ببوو بە قارەمان.

مستەفا ناوێک، کە خۆمان مچەی پێدەڵێین، بە خۆی و کەرەکەیەوە لەنێوان سلێمانی و قەرەداغدا هاتوچۆی دەکرد،

مانگانە کەرەسپی و خاوەنەکەی دەبووایە لە (ئەستێڵ)ەوە بچن بۆ (عازەبان)، لەوێ نامەو بەیاننامە نهێنییەکانی حزب بار بکەن و ببەن بۆ ناو شاری سلێمانی، بەپێچەوانەشەوە لە شارەوە دەرمان و نامەو هەرشتێکی کە پێویست بووایە، دەهێنرایەوە بۆ عازەبان.

کۆپانی کەرەسپی شوێنی شاردنەوەی نامەو دەمانچەو بەیاننامەی نهێنی بوو، جگە لەمانەش تەنانەت قاپە ئارەقیشی تێدا دەشاردرایەوە، بۆیە (مەلا ئەنوەر) ناهەقی نەبوو کە دەیوت: "کەرەسپی بەقەد، دە هاورێ خزمەتی گەلی ئێراق دەکات".

هاتوچوون و چست و چالاکی کەرەسپی وای کرد، نەیاران لقەکەی قەرەداغی حزب ناوبنێن لقی کەرەسپی. لەبەرئەوەی سەرلقەکەمان (سەعید مەتەر) بوو، دەزگای هەواڵگریی سەربازیی ئێراقی لە پارێزدا بوون بۆمان و چاودێریی جموجووڵیان دەکرد، دیاربوو ئەو تەتەرەی نامەکانی سەعید مەتەر دەگەیەنێتە ئەفسەرەکانی سوپای ئێراق، بەڕێز کەرەسپییە!

بۆیە ڕۆژێک لە نزیک (سەید سادق) کەرەسپی دەکەوێتە بۆسەیەکی مەحکەمی سوپاو جاشەوەو مچەی خاوەنی هەرچۆنێک بێت بە هەزار حاڵ و ناڵی عەلی خۆی قوتار

دەکات و ڕزگاری دەبێت، بەڵام هاوڕێ کەرەسپی بە ئەسیر دەگیرێت.

سەربازەکان وەکو دەستکەوتێکی بەنرخ کەرەسپی دەبەن بۆ لای فەرماندەی فەوجی سوپای ئەو ناوچەیە، چونکە کاتێک کورتانەکەی دادەدڕن، هەرچی هەیەو نییە لە نهێنی حزب دەکەوێتە دەستیان.

لە پاداشتی ئەم دەستکەوتەدا بیستمانەوە فەرماندەی فەوج ئاهەنگێکی شاهانەی بۆ کەرەسپی سازکردووە، جگەلەوەی دوو تەلیس کاو جۆیان پێشکەشکردووە، چارەکێک عارەقی مەستەکیشیان بۆ کردۆتە تەشتە ئاوەکەی بەردەمی، لەمەش زیاتر هەبوون دەیانوت: "ئەو شەوە بە هەوڵی ئەفسەرێکی پلەبەرزی هەواڵگری، ماکەرێکیشیان بۆ پەیدا کردبوو".

بەیانییەکیان لە پرخەی خەودا بووم، سەعید مەتەر ڕایچڵەکاندم و وتی: "هەستە هاوڕێ جەمال ئەوە ڕادیۆ هەواڵی سووتانی فڕۆکەکەی (عەبدولسەلام عارف) بڵاو دەکاتەوە". پێکەوە گوێمان لە درێژەی هەواڵەکە دەگرت، کە باسی ئەوەی کرد (عەمید نوری) ناوێکیش لە ڕووداوەکەدا لەگەڵ عەبدولسەلام عارف-دا تیاچووە، سەعید مەتەر بەتەواویی ماتەمینی دایگرت.

هاوڕێ سەعید داوای کرد بۆ تاوتوێی بارودۆخەکە، کۆبوونەوەی لق ئەنجام بدەین، لە کۆبوونەوەکەدا یادگاریی خۆی سەبارەت بە ئامادەسازییەکانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ گێڕایەوە، وتی: "سێ سێ و چوار چوار دەچووین بۆ (غەوزی گەیلانی)و (ئیمام موسای کازم)و سوێندمان بۆ یەکتری دەخوارد، کە خیانەت لە یەکتری نەکەین و نهێنی ئەفسەرانی ئازادیخواز بپارێزین".

دیاربوو هاوڕێ سەعید زۆر متمانەی بەو عەمید نورییە هەبوو کە لە ڕووداوەکەدا لەگەڵ عەبدولسەلام عارف فەوتی کردبوو، دەیوت "تاکە هیوا ئەو بوو کە کودەتا بەسەر بەعسییەکاندا بکات، بۆیە بۆ لەدەستچوونی، کۆڵێ خەفەتی خوارد". تۆزێکیش باسی لە ئازایەتی عەبدولسەلام عارف کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەشی وت: "کە کابرایەکی شۆڤێنی و نەتەوەپەرست و ئیسلامی بووە".

٥- سەردانی مەلا مستەفا.

لە زیندان ڕزگارم بوو، دەستمکردەوە بە کاری سیاسی لە پێنجوێن، بەڵام چەند بەرپرسێکی پارتی گرفتیان بۆ دروست دەکردین و تەنانەت هێندێک جار ڕێگرییان دەکردو دەستدرێژییان دەکردە سەرمان، بگرە دەکەوتنە ویزەی

شیوعییەکان و لێشیان دەدان. قسەم لەگەڵ هاوڕێ (ئەحمەد کەریم) کرد کە ئەوکاتە بەرپرسی (محەلی سلێمانی) بوو، وتم: "دەچم بۆ لای مەلا مستەفا شکات لە بەرپرسەکانی پارتی دەکەم".

هاوڕێ ئەحمەد وتی: "عەزیز محەمەد سکرتێری حزبی شیوعییە، بیست ڕۆژە دەیەوێت مەلا مستەفا ببینێت، ناتوانێت، ئێستا تۆ چۆن دەگەیتە لای بارزانی"؟!

وتم: "ڕێگای خۆم هەیەو سەرێکە هێناومەو نایگەڕێنمەوە".

من سەرو سەودام لەگەڵ (شێخ لەتیفی حەفید)دا هەبوو، ئەودەمەی لە پارەزان بوو، سەردانم دەکرد، هەرکات ئەزێتیان بدامایە، پەنام بۆ ئەو دەبرد.

(سەلامی عەلی ئەحەڕەش) لە پێنجوێن بەنامێ بوو، بەرپرسی پارتی لێان دابوو، سەلام و مام عەلی باوکی و (ئەنوەر جەلال و سابیری دەروێش ئەحمەد) هەموو لەوانە بوون کە بەهۆی زەبروزەنگی بەرپرسانی پارتییەوە سەروگوێلاکیان شکێندرابوو، هەرپێنجیانم بردە لای شێخ لەتیف، خۆیان هەڵمالی یەکێک پشتی مۆرببووەوە، یەکێک قاچی شکابوو، یەکێک دەستی.

وتم: "من خۆم تازە لە زیندان بەربووم، ئەمەش حاڵی

شیوعییەکانی ئەو ناوچەیەیە بەدەست بەرپرسەکانی پارتییەوەو دەمانەوێت بچینە لای مەلا مستەفا بۆ شکاتکردن".

شێخ لەتیف زۆر ڕێزی لێگرتین (حاجی حەمەی ڕاوکانی)، کە لە کۆنەوە لەگەڵ شێخ لەتیفدا بوو، هات بە پیرمەوەو بە شێخ لەتیفی وت: "حمەومین خاڵۆزامە" ئیتر ئەوەندەی تر بایەخمان پێدراو نانمان خواردو شێخ لەتیف وتی: "خۆتان بشۆن و سەرو ڕیشتان بتاشن، ئێوارە دەتانبەم بۆ لای مەلا مستەفا".

دوای ئەوەی پشوویەکی باشمان دا، شێخ لەتیف سواری جێبەکەی کردین و بردینی بۆ (سەنگەسەر)، بارەگای مەلا مستەفا لە بینای قوتابخانەیەکدا بوو، قەرەباڵغییەکی زۆر لە دەوروبەری بارەگاکە بوو. بە سەدان کەس لەملاولاوە هاتبوون بۆ بینینی بارزانی، کە ئەم عەشاماتەم بینی، بۆم دەرکەوت کە بینینی بارزانی هەروا ئاسان نییە.

شێخ لەتیف ئێمەی جێهێشت و چووە ژوورەوە، ئێمەش چاوەڕوانی ئەومان دەکرد، لەو ماوەیەدا (عەزیز محەمەد) م بینی هاتبوو بۆ چاوپێکەوتنی بارزانی، بەڵام وادەی چاوپێکەوتنەکەیان بۆ دوورخستبووەوە، بۆیە بە منی وت: "مادام تۆ دەچیتە لای بارزانی، ئەم نامەیەی بدەرێ و جگە

لە خۆی، نەیدەیتە دەست کەسی تر".

شێخ لەتیف بیست دەقەیەکی پێچوو، هاتە دەرەوە، لەدوای ئەوە بانگی ئێمەیان کردو چووینە ژوورەوە، بێگومان ئەگەر شێخ لەتیف نەبووایە، ئەم کارە هەرگیز مەیسەر نەدەبوو.

بارزانی لە ژوورێکدا کە فەرش و دۆشەکی لێڕاخرابوو، لەسەر کەوڵی ئاژەڵێک چوارمشقی دانیشتبوو. لەدوای سڵاوکردن، من کە لەوەوبەر کاغەزێکم ئامادە کردبوو، باسی ئەوەم تێدا کردبوو، کە هێندێک بەرپرسی پارتی کەوتوونەتە ویزەی شیوعییەکان و دەیانگرن و لێیان دەدەن و سوکایەتییان پێدەکەن، کەوتمە خوێندنەوەی.

مەلا مستەفا لە ناوی ئەوانەی پرسی کە ئەو جۆرە کارانە دەکەن، ئێمەش ناوی (کەمالی شێخ غەریب)و (معاون ئەحمەد سلێمان)مان هێنا، دیاربوو ئەوانیش لەو دەورە بوون، بارزانی کوڕێکی بانگکرد ناوی (خورشید) بوو، وتی: "هەر ئێستا هەردووکیانم بۆ بانگ بکە".

کەمالی شێخ غەریب خوشکەزای (سەعید قەزاز) بوو، کە لە سەردەمی پادشایەتیدا وەزیری ناوخۆی ئێراق بوو، لەدوای شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ دادگاکەی (مەهداوی) بڕیاری لەسێدارەدانی بەسەردا دا، بۆیە ڕقی لە هەموو

شیوعییەک بوو، دەیوت: "ئێوە خاڵمتان کوشتووە".

لەبەرچاوی ئێمە بارزانی زۆر لە کەمال و معاون ئەحمەد تووڕە بوو، سەرزەنشتی کردن، وتی: "من وتوومە پیاوی حکومەت و سیخوڕ بگرن، نەک شیوعی". بڕیاریشی دا کە سزایان بدات و لە کار دووریان بخاتەوە، لەدوای ئەوەشەوە ڕێنمایی دەرکرد بۆ هەموو هێزی پێشمەرگە، کە بەهیچ جۆرێک دەست نەهێننە ڕێگەی شیوعییەکان.

لەو دانیشتنەدا، بارزانی بە ئێمەی وت: "ئێوە کە گەنج و قوتابین، چیتان داوە لە حزبایەتی و بۆچی ناچن بەلای تەواوکردنی خوێندنەکەتانەوە؟ خۆ ئەگەر هەر بڕیاریشتان داوە واز لە خوێندن بهێنن، ببن بە پێشمەرگە".

لێرەدا دەمەوێت باسی ئەوە بکەم، کە من جارێکی تر لە سلێمانی چاوم بە مەلا مستەفا کەوتبوو.

لەدوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموز، ئێمە وەفدێکی هەشت کەسی بووین لە پێنجوێنەوە بۆ سەردانی بارزانی هاتبووین. بارزانی لە ماڵی شێخ لەتیفی حەفید بوو لە گەڕەکی (کانی ئاسکان)، بارزانی لەسەر قەنەفەیەک دانیشتبوو، شێخ لەتیفیش لە تەنیشتییەوە بوو، (حاجی برایمی چەرمەگا)ش لە دانیشتنەکەدا بوو، کۆمەڵێک لە ئاغاکانی پشدەریش هەر بۆ سەردانی هاتبوون.

لەبیرمە بارزانی بە ئێمەی وت: "من و شێخ لەتیف پیر بووین و توانای ئەو شاخ و داخەمان نییەو نۆرەی ئێوەیە شۆڕش بکەن".

## ٦- کانی ماسی.

لەناو ئەندامانی لیژنەی (قەزاو ناحیەکان)دا، من بە تەمەن لە هەموویان گەنجتر بووم، بۆیە لە بەینی ناوچەکاندا هاتوچۆم دەکردو لەبەرئەوەی ئەهلی خوێندنەوەش بووم، هەمیشە کتێبم پێبوو.

ئەمەش سودێکی زۆری هەبوو، چونکە لەو ناوچانەی کە سەردانم دەکردن، ئەندامانم کۆدەکردەوەو هەوڵی ئەوەم لەگەڵ دەدان کە خۆیان ڕۆشنبیر بکەن و هانم دەدان ئاگاداری ئەدەبیاتی چەپ بن.

لەوماوەیەدا گەڕابوومەوە بۆ سلێمانی و لە ماڵی برادەرو خزمانی پێنجوێنیم دەمامەوەو بە ڕۆژیش نەمدەتوانی زۆر دەربکەوم، بۆیە چایخانەیەکی بچووک هەبوو بەرامبەر (چوخمەکەی سابوونکەران) لەگەڵ برادەران لەوێ دادەنیشتین، سەرمان دەنا بەیەکەوەو باس باسی سیاسەت بوو.

ئەندامانی لیژنەی (قەزاو ناحیەکان) پانزە بۆ بیست کەسێک دەبووین، بەڵام چوار پێنجێکمان (حەمە سوەیلەو سەعەسوری جافەرانی و مەلا عەلی و مەلا ڕەئوف) دەهاتینە ئەو چایخانەیەو وەکو ئۆفیسێک وابوو بۆمان.

لەو ماوەیەدا لە سلێمانی هێندێک لەوانەی خۆیان بە نەتەوەیی دەزانی، پێیان دەوترا (کاژیک)، بە پشتیوانی هێندێک باڵی (مەلایی) پارتی، باندێکیان بۆ تۆقاندن و تیرۆری سیاسی دروستکردبوو، زیاتر لە چەتەو ڕێگر دەچوون و بگرە بە ئاشکرا لەناو شاردا سەرانەیان لە خەڵک دەسەند.

لە ناوچەی (کانی ماسی) نزیک سلێمانی بنکەیەکیان دانابوو، بۆ زیندانیکردن و ئەشکەنجەدانی شیوعییەکان و جاربەجاریش جەلالییەکانیشیان دەگرت.

مەلا عەلییەک هەبوو کادری حزب بوو، ئەویش دەهاتە چایخانەکەی سابوونکەران، یەک دوو ڕۆژ دیار نەبوو، کە هەواڵمان پرسی، وتیان "کوژراوە". لەدوای ئەوە دەنگوباسی کوشتنی شیوعییەکان بە شاردا بڵاوبووەوە، ئێمەش کە لە چایخانەکە دادەنیشتین، هەستمان کرد کەوتووینەتە ژێر چاودێرییەوەو یەک دوو کەس بە پاسکیل دوامان دەکەون و هەوڵیش دەدەن بیانوو بدۆزنەوە، بۆئەوەی بە کامێرا

وێنەی فۆتۆگرافیمان بگرن.

یەکێک لەوانەی کە چاودێرییان دەکردین، کاتی خۆی پێکەوە قوتابی بووین و (تایەرە سور)یان بانگ دەکردو برای (عەلی سور)ی (مەتعەم) بوو، لە سەردەمی پادشایەتیدا من کردبووم بە شیوعی، ناسیمەوە کەوتمە قسەو باس لەگەڵیدا، وتی: "ئێستە من لە شەقاوەکانی کانی ماسیم، من تۆم خۆش دەوێت، بۆیە پێت دەڵێم ئاگاداری خۆت بە، چونکە ناوی تۆش لەو لیستەدایە کە بڕیاری کوشتنیان دراوە، بەڵام جارێ ئێستا بۆ (ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە) دەگەڕێین".

ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە، کادرێکی بەنامێی شیوعییەکان بوو لە سلێمانی و یەکێک بوو لەو کەسە دیارانەی کە لە پێشەنگی خۆپێشاندانەکانی دژ بە (نوری سەعید)و ڕژێمی پادشایەتی بوو، جگە لەوەش لە بنەماڵەیەکی ناسراو بوو.

ویستم هەرچۆنێک بووە ئەوڕەحمان بدۆزمەوەو ئاگاداری بکەمەوە کە بەشوێنییەوەن بۆ کوشتنی، بەرەو (کونە شیوعی) ڕۆیشتم. چایخانەکەی (ئەحەی قالە)، یان (ئەحەی نازدار)یشیان پێ دەوت، کەوتبووە لای گەراجی (ئەسحابە سپی) لەناو بازاڕە بچکۆلەکەدا بوو، ناویان نابوو کونە شیوعی، من ویستم دانیشم و ئەوڕەحمان بەرەو ڕووم

دەهاتە دەرەوە، دەستم گرت و بردمە لایەکەوە، تیم گەیاند کە دەبێت ئاگاداری خۆی بێت، لەبەرچاوی من سواری گالیسکەیەکی دوو ئەسپی بوو و تێی تەقاند.

ئەورەحمان تازە زاوا بوو، بۆ شەوەکەی چووبوونە سەری و لە ماڵ دەریان هێنابوو و بردبوویان بۆ کانی ماسی و لەوێ کوشتبوویان.

با لێرەدا ئیستێک بکەم.

(فوئادی مەجید میسری) لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی لە هەمەدان دەبێت، مام جەلال فوئاد ڕادەسپێرێت هەرچۆنێکی کردووە بگەڕێتەوەو مۆری مەکتەبی سیاسی بگەیەنێتە دەست (عەبدولڕەحمان زەبیحی). فوئاد مۆرەکە لەناو پێڵاوەکانیدا دەشارێتەوە، بەڵام کە دەگاتە پێنجوێن، پارتی دەیگرن و بە زیندانی دەیبەن بۆ کانی ماسی.

ئەو شەوە فوئاد لە پەنجەرەی ژووری زیندانەکەی خۆیەوە دیمەنێک دەبینێت، کە بۆهەتاهەتایە دەبێتە بەڵگە بەسەر دەستی ڕەشی تیرۆری کانی ماسییەوە.

«لە پەنجەرەی زیندانەکەمەوە چاوم لێبوو بەدەم ئەشکەنجەدان و سوکایەتی پێکردنەوە، ئەورەحمانی ساڵحی خلەیان بە دەست و پێ بەستراویی هێنایە ناوەڕاستی حەوشەکەوەو دەبەیەک نەوتیان کرد بەسەریاو شقارتەیان

پێوەناو سووتاندیان، ئەورەحمان بەدەم قیژەو هاوارەوە دامرکایەوەو بوو بە کۆی خەڵوز".

فوئادی هاوڕێم لەم ساڵانەی دواییدا ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە.

لە ماوەی حەفتەیەکدا بیستوپێنج کادری شیوعی لە شارێکی بچووکی وەکو سلێمانیدا کوژران. لەو ماوەیەدا من شوێنی شەومانەوەو نووستنم گۆڕی و ئاگاداری خۆشم بووم، بەردەوامیش لە هاتوچووندا دەمانچەم لەگەڵ خۆم هەڵدەگرت و دەستوودامانی مشتووەکەی دەبووم.

(ڕەسوڵ ئاغا)یەک هەبوو گوایە دەیانوت "کاری بەڵێندەرایەتی دەکات" خۆی بە دۆستی حزب دەزانی و لێمان نزیک ببووەوەو یەک دوو جارێکیش لە چەند بۆنەیەکی ئەدەبیدا ئاگام لێبوو لە نزیک منەوە دادەنیشت، کابرا قسەی لەسەر بوو، دەیانوت: "پیاوی دەزگای هەواڵگریی سەربازییە".

لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا ڕۆژێکیان نامەو بڵاوکراوەی ڕێکخستنم پێبوو، لە (برایم پاشا)وە بۆ (مەڵکەنی) دەچووم، بە تیلەی چاو دوو کەسم بینی دانیشتبوون و یەکێکیان ڕەسوڵ ئاغا بوو، ویستم خۆمیان لێ هەڵە بکەم و سڵاو نەکەم، چونکە بەپەلە بووم، کە پشتم کەوتن و تێم پەڕاندن،

گوێم لە هـاڕەی میلهێنانەوەی دەمانچە بـوو، یەکسەر بامدایەوەو دەستەوکەمەر دەمانچەم لێیان هەڵکێشـا، کەچی سەیرمکرد ڕەسوڵ ئاغاو هاوڕێ ناموبارەکەکەی دایانە حیلکەی پێکەنین و وایان دەرخست گوایە شۆخیی دەکەن!

کە گەیشتمە شوێنی مەبەست لە گەڕەکی مەڵکەنی، هـاوڕێ (ئەحمەد کـەریـم)، کە خاڵی ئـەم (ئـازاو بەهاتی حەسیب قەرەداغی)یەی خۆمان دەکات، ئەودەمە بەرپرسی سلێمانی حزب بـوو، چاوەڕێی دەکـردم و زانـی کە زۆر پەشۆکاوم، لێی پرسیم و چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: "ئەو ڕەسوڵ ئاغا خوێڕییە خۆی بە دۆستی ئێمە دەزانێت، بەڵام چاک بزانە دەمانچەت لێ ڕانەکێشانایە، ئێستا فتیان کردبوویت".

شـار بەجارێ ناخۆش ببوو، کانی ماسی مۆتەکەیەک بوو لەسـەر سنگی سلێمانی و بەری نەدەدا. هاوڕێ ئەحمەد وتی: "ئەمە چەند جارێکە تۆ هەر بەرێکەوت لە کوشتن قوتار بوویت، لێرە مەمێنەو بڕۆ بۆ کلکە سماق".

## ٧- بۆ لە (هەقە) کەوتنە تەقە؟!

لەو کاتەوە کە کودەتای (٨)ی شوبات ڕوویداو بەیانی ژمارە (١٣) بۆ قڕکردنی شیوعییەکان دەرکرابوو، گوندی (کلکە سماق) ببوو بە نواو پەناگەی ئارامی ڕێکخستنەکانی

حزبی شیوعی ئێراق.

خەڵکی ئەو ناوچەیە (هەقە) بوون، ژیانی کۆمەڵایەتییان لەگەڵ شوێنەکانی تری کوردستاندا جیاواز بوو، لە ڕووی ئاینیشەوە بیروباوەڕی خۆیان هەبوو، کە بێگومان ڕەگوریشەی تایبەتی هەیە.

(مامە ڕەزا) هەر لە زووەوە لەم ناوچەیە فەلسەفەی (هەقە)یەتی پێڕەو کردووە، بۆیە خەڵکی ئەو ناوچەیە هەم بە (هەقە) ناسراون و هەم بە (مامە ڕەزایی).

ئەم ناوچەیە وەک هیچ شوێنێکی تری کوردستان نەبوو، نەریتی شێخ و ئاغای تێدا نەبوو، خەڵک هەموو یەکسان بوون و جیاوازیی ژن و پیاو نەبوو، جووتیارەکان زەوییان دەکێڵاو دەیانچاندو دوایی بەرهەمەکانیان دەکردە عەمباری گەورەوەو بە یەکسانی هەرکەسەو بەپێی پێداویستی خۆی بەسەریدا دابەشیان دەکرد. بەروبووم دەفرۆشراو پارەکەی بۆ خزمەتی خەڵکەکە بەکاردەهێنرا، ئەم سیستمە کە لە کلکە سماق و ناوچەی هەقەکان بەڕێوەدەبرا، زۆرنزیک بوو لەو سۆشیالیزمەی کە حزبی شیوعی بانگەشەی بۆ دەکرد. تەنانەت هێندێک کێشەی کۆمەڵایەتی کە لە شوێنەکانی تری کوردستان دەبووە هۆی دوژمنایەتی و شەڕوشۆڕ، لێرە بە ئاسانی چارەسەر دەکرا.

بۆ نموونە کچ و کوڕێک ئەگەر دڵیان بچووایە سەر یەک، ڕەنگە لە شوێنەکانی تری کوردستان دووچاری سەد دەردی سەر ببوونایە، بەڵام لێرە دەچوونە لای مامە ڕەزاو دەیانوت: "دەمانەوێت ببینە هاوژین و پێکەوە بژین".

لەوەش زیاتر تەنانەت هاوکارییش دەکران و ماڵیان بۆ دروست دەکردن، یان زەوییان دەدانێ، بۆئەوەی ژیانی خۆیان بەڕێوەببەن.

بێگومان ئەم چاکەخوازییەی مامە ڕەزا لای مەلاو خەڵکانی نەریتەوان و کۆنەپارێزی ئیسلامی ئەو کاتە وا بەئاسانی قبوڵ ناکرێت، بۆیە چەندین شتی ناجۆرو بێمانایان دەدایە پاڵ مامە ڕەزاو هەر بە هیممەتی دەمڕەشی ئەوانیش لە سەردەمی (نوری سەعید)دا، (مامە ڕەزا) زیندانی دەکەن و دەینێرن بۆ بەندیخانەی (ناسریە)

لە سەردەمی پادشایەتی زۆربەی بەندکراوەکانی زیندانی ناسریە شیوعی دەبن، دەشوترێت گوایا هاوڕێ (فەهد)و هێندێک لە سەرکردە باڵاکانی حزبی شیوعی لەوێ دەبن، لە ژیانی ڕۆژانەدا کە مامە ڕەزا لەگەڵ ئەواندا تێکەڵ دەبێت و دەبینێت جۆرێک لە نزیکی لە بیروبۆچوونیاندا هەیە، هاوسۆزییەک دروست دەبێت و ئەو هاوسۆزییەش دواتر دەبێت بەهۆی ئەوەی نەوەکانی مامە ڕەزا لە لێقەومانی

گەورەدا داڵدەی شیوعییەکان بدەن.

دەشڵێن لە سەرەمەرگدا (مامە ڕەزا) وەسییەتی بۆ منداڵەکانی کردووە، وتوویەتی: "لە داهاتوودا باوی حزبایەتی دێتە پێشێ، بۆ ئێوە باشترە جگە لە هەر حزبێکی تر، نزیکی شیوعییەکان بن".

ئەوکاتەی کە گەیشتمە کلکە سماق (کاکە حەمە) لە جێگای مامە ڕەزا دادەنیشت و براکانی تریشی (حەمیدو تەها) هەر شیوعی بوون، بەڕاستی کەسانێکی چاکەخوازو خوێندەوارو مرۆڤدۆست بوون.

کاکە حەمە خۆی لە کاری حزبی نەدەگلاند، بەڵام سەرەوکاری داڵدەدانی خەڵکەکەی دەکردو بە تەنگ ئەوەوە بوو بێنەوا نەبن.

کلکە سماق وەک پوورە هەنگێکی لێهاتبوو، شیوعییەکان لە بەغداو هەموو شوێنەکانی ترەوە، ڕوویان تێدەکرد. کاکە حەمە دە دوانزە نانەوای دانابوو، بە دەیان ژنی ئازا خواردنیان ئامادە دەکردو دەستە دەستە هاوڕێیانی شیوعی دەگەیشتنە جێ و ڕێکدەخران و ڕەوانەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستانیان دەکردن.

نزیکەی شەش مانگێک لەو ناوە مامەوە، تێکەڵاوییەکی باشم لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەو کوڕەکانی مامە ڕەزادا پەیداکرد، کە

ئێستاش وەکو دۆستایەتییەک بۆم ماوەتەوە.

لێرەدا بەیادی ئەو ڕۆژانەوە دەمەوێت بڵێم: "کە داخۆ ئەگەر ئەو یاساو ڕێسایەی هەقەکان پێڕەویان دەکرد، لە سەرجەم ناوچەکانی تری وڵاتدا کاری پێبکرایە، بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێستای کوردستان جۆرێکی تر نەدەبوو؟!"

یادی بەخێر (ڕەئوف زوهدی) لەسەر هێندێک قسەی لەمجۆرەی من کردم بە پرسیار، بە دەستی ڕەشی کۆنەپارێزان و بەعسییەکان لەسەر کتێبی (بۆ لە هەقە، کەوتنە تەقە) شەهیدکرا.

مامە ڕەزا لەسەر بیروبۆچوونەکانی لەسەر (هەق)ەکەی خۆی زۆری چەشتووە، بەڵام لایەنگرانیشی بێوەفا نەبوون کە لە (ناسریە) لە زینداندا دەبێت، هەقەکان لە هەموو ناوچەکانی کوردستانەوە کۆدەبنەوەو ڕوودەکەنە (کەرکوک)و لەبەردەم بینای ئەودەمەی لیوادا مان دەگرن.

هەقەکان لەم مانگرتنەیاندا کە دیمەنێکی ناوازەی خەباتی مەدەنی ئەو ڕۆژگارە بووە، خۆیان بە گوێنی باڵاپۆش دەکەن و وەک نەریتێکی ڕۆحیش داری (بەلاڵوک) بەدەستەوە دەگرن. کۆڵ نادەن تا حکومەتی نوری سەعید ناچار دەبێت مامە ڕەزا مەرەخەس بکات، بەو مەرجەی نەچێتەوە کلکە سماق و لە هەڵەبجە دابنیشێت.

٨- خەبات لە ئاوەگرد.

ماوەیەک بوو باڵی مەکتەبی سیاسی لە مەلا مستەفا جیاببوونەوەو بەرەی مەلایی و جەلالی دروست ببوو. لەودەمەدا سیاسەتی بارزانی ئەوەبوو لەجیاتی ئەوەی جەلالییەکان باڵادەست بن، قەیدی چییە با شیوعییەکان بۆشاییەکە پڕبکەنەوە، مەلا مستەفا پیاوێکی حەکیم بوو دەیزانی چی دەکات, لەوماوەیەدا من لە کلکە سماقەوە پەڕیبوومەوە بۆ (ئاوەگرد)، کە ئەگەر لەم ڕۆژگارەدا بتەوێت دووریی نێوانیان بپێویت، هەر چەند کیلۆمەترێکە.

ڕۆژی (٦)ی ئاب (عەبدولڕەحمان عارف) داوای لە (ناجی تالیب) کرد ببێتە سەرۆک وەزیرانی ئێراق. ناجی تالب لە ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بوو، لە بنەماڵەیەکی ناوداری ناسریە بوو، کاتی خۆی باوکی ئەندامی مەجلیسی ئەعیان بوو، لە بەریتانیا خوێندنی سەربازیی تەواوکردبوو.

لەم سەردەمەدا بەعسییەکان هەوای سۆشیالیزم دابووی لە کەللەیان و پێڕەوی یەکێتیی شۆرەوییان دەکرد، جۆرێک لەو سۆشیالیزمەی کە (جەمال عەبدولناسر) لە میسر لە چوارچێوەی ڕێکخراوی (ئیتحادی ئیشتراکی)دا بانگەشەی بۆ دەکرد، ببووە نموونەیەکی پەسەندکراوی ئەمان، کە

لەهەمان کاتدا ئاوێتەکرابوو بە عەرەبچێتییەکی شۆڤێنییانە.

ئەم هەوایەی جەمال عەبدولناسرو سۆشیالیزمی ئاوێتە بە عەرەبچێتی، ولاّتانی مەغریبی عەرەبیشی گرتبووەوەو لە ئێراقیشدا زۆر هەبوون لەڕووی بیروبۆچوونەوە کەوتبوونە سەر ئەو ئاوازە.

جەلالییەکان و بەشێکی حزبی شیوعی عێراق، سەرمەست بوون بەم ڕێبازە کە یەکێتیی شورەوی خۆی بە قیبلەگاهی دادەنا.

هاتنی ناجی تالیب وەک یەکێک لە هەڵگری ئەم بیروباوەڕەو دانیشتنی لەسەر کورسی سەرۆکایەتیی وەزیرانی ئێراق، وای کرد لە مانگی ئابی ئەو ساڵەدا شیوعییەکان بەیانێک دەربکەن بۆ پشتیوانی ئەم پرۆژە بەعسییانەیە.

من ئەوکاتە لە ئاوەگرد بووم، بەیانەکەیان دامێ وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی، بەلاّم ئەقڵم نەیگرت و ڕەتم کردەوە. لەوێدا لەگەڵ یەک دوو هاوڕێدا کە وەک من ناڕازیبوونیان لە هەڵوێستی حزب پێوە دیاربوو، کەوتینە گفتوگۆو چپەچپ. دیاربوو ئەم بەیانەی حزب کە لای من و چەند کەسێکی تر لەوکاتەدا لە ئاوەگرد ڕەتکرایەوە، لەزۆر شوێنی ترو لە بەغداش هەڵوێستی هاوشێوە هەبووە

بەرامبەری.

هەرواش بوو کە پێشبینیم کرد (هاوڕێ عەزیز ئەلحاج)، کە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی بەغدا بوو، کاردانەوەی وەک ئێمەومانان بوو، بۆیە فووی پیاکردو ڕادیکالانە دژی حزبی شیوعی وەستایەوە.

لەم سەروبەندەدا زەمینە ڕەخسا بۆئەوەی سویێ زامێکی مێژوویی بکولێتەوەو دابڕان و عەرەب وتەنی (ئینشقاق) لە جەستەی حزبی شیوعیدا ڕوویدات.

٩- پارە ڕفاندن.

حزبی شیوعی بوو بە دوو بەشەوە (لیژنەی مەرکەزی) بە سەرکردایەتی (عەزیز محەمەد)و (قیادەی مەرکەزی) بە سەرکردایەتی (عەزیز ئەلحاج).

هاوڕێیان لە قیادەی مەرکەزیی دەستیان کرد بە خۆڕێکخستن و پەنایان بردە بەر شۆڕشی چەکداریی و شانەو گرووپ و دەستەی چەکدارییان لە باشووری ئێراق و لەناو هۆرەکانیشدا دروستکرد. لە بەغدا چەند چالاکییەکیان ئەنجامداو تەنانەت تەقەیان لە (عەدنان خەیروڵڵا تولفاح و سەدام حسێن)یش کردبوو.

لەوماوەیەدا من گەڕامەوە بۆ سلێمانی، زۆربەی زۆری

ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی لایەنگری باڵی قیادەی مەرکەزییان دەکرد، بۆیە دەبوو جارێکی ترو بەپێی ئەو گۆڕانکارییانەی ڕوویـان دابـوو، بەخۆماندا بچینەوەو جۆرێکی تر کاری ڕێکخراوەیی بکەین. زۆربەی گەنج و قوتابی و خوێندەوارو ڕۆشنبیران و فەرمانبەران و تەنانەت هێندێک لە دەوڵەمەندەکانیش هـاوڕاو بۆچوونی ئێمەو هاوڕێکانمان بوون.

(حسێن عـارف) کە دواتـر بووە نووسەرێکی گەورەو لەم ساڵانەی دوایشدا بووە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان، گـردبـوونـەوەیـەکـی دروسـتـکـردبـوو، وەکـو کۆمەڵەیەک وابوو ناوی نابوو (گزنگ). ئەم کۆمەڵەیە بوو بە هەوێنی کۆکردنەوەی زۆربەی دکتۆرو سەرۆک فەرمانگەو پیاوانی شار لە دەوری بیروبۆچوونەکانی قیادەی مەرکەزیی.

لیژنەی گزنگ، کە حسێن عارف نۆرەی کاریگەریی تێدا هەبوو، نزیکەی (٤٠ بۆ ٥٠) کەسێکی لە ماڵی (مەحمود قادر) لە گەڕەکی (ئیسکان) کۆکردەوەو سەرکردایەتییەکی نوێمان بۆ شاری سلێمانی دروستکرد، من بووم بە ئەندامی لیژنەی محەلی و شێخ (عەلی بەرزنجی) باوکی ئەم (بەختیار عەلی) ەی خۆمان و (حسێن عـارف) کەوتینە کنەی کاروباری ڕێکخراوەیی.

جارێکی تر کەوتمەوە هاتوچۆکردن بۆ هەڵەبجەو پێنجوێن و شارباژێڕو قەلادزێ و ڕانیە، بەدوای چنینەوەی تەونی ڕێکخراوی حزبەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە بیروبۆچوونی شۆڕشگێڕانەی ئەو سەردەمەی قیادە مەرکەزییەوە.

لەم هاتوچوونەمدا هەر بە کوردستانەوە نەگیرسامەوە، بەڵکو زۆر دوورکەوتمەوەو بە بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕانەوە، بۆ کارو چالاکی چەندین جار چوومە بەغداو باشووری ئێراق و ئەوپەڕتریش ڕۆشتم و تا لە (بەسرە) گیرسامەوە.

لە کۆبوونەوەی لیژنەی محەلی سلێمانیدا نامەیەکی قیادەی مەرکەزیی خوێندرایەوە، کە باس لە خراپیی بارودۆخی دارایی حزب دەکات و دەڵێت: "هاوڕێیان چاویان زەق بووە بە نان و ڕاشی خواردن، هیممەتێک بکەن و هەرچۆنێک بووە دەست بەسەر سەرچاوەیەکی دارایی میریدا بگرن و بۆمان ڕەوانە بکەن".

کەوتینە بیرکردنەوە کە چۆن گیرفانی بەتاڵی حزب ئاوەدان بکەینەوە؟!

ڕۆژێکیان (حسێن عارف) وتی: "پارەی مدیرییەتی مەعاریف (کە دەکاتە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی ئێستا)، بیست هەزار دینارێک دەبێت، پاروویەکی چەورە بۆ

حەپەلووشی نەکەین؟!"

هەموومان بە دە پەنجە بۆمان مۆرکرد، من و شێخ عەلی بەرزنجی و حەمە کوڵەباڵ کەوتینە ڕاو تەگبیرو کنەی پارەکەی مەعاریفمان کرد. ڕۆژو سەعات و دەقەمان ژماردو لەکاتی خۆیدا کەوتین بەسەریدا.

بینای مەعاریف بەرامبەر (مزگەوتی گەورە)و لە شوێنی (کاسۆمۆڵ)ی ئێستا بوو، دوو پیکاب بەدوای یەکدا لەبەردەم دەرگای مەعاریفدا دایانچەقاند، پیکابی یەکەم ژمێریارێکی تیابوو (شێخ جەمال)ی محاسیب بوو، بیکابی دووەم، دوو جانتا پارەو چەند پۆلیسێکی تێدابوو، هەر کە دابەزین، حەمە کوڵەباڵ وەک هەڵۆ پڕی دایە جانتای گەورەی پارەکەو فڕاندی، دوو هاوڕێی تریش کە لە نانەوەی بۆسەکەدا بەشداربوون، پەلاماری پۆلیسەکانیان داو بوو بە تەقوتۆق و هەڵاو بردەو و ئەو ڕۆژەش بوو بە ڕۆژێکی تری ئەو ڕۆژانەی سلێمانی، کە دەیانوت "قڵیشایەوە"!

من و شێخ عەلی پێش ئەوەی تەقە دەست پێبکات لەماڵی هاوڕێ (ئەحمەدی موزەمید)، کە لە کۆڵانەکانی پشتی (سەرا) بوو، خۆمان سازدابوو بۆ پێشوازیکردنی پارووە چەورەکە. هەرکە حەمە کوڵەباڵ گەیشتە لامان، پارەکەمان لە جانتاکە دەرهێناو خستمانە دوو بووخچەوە. ئەحمەدی

خاوەن ماڵ تەنووری گەرم کردو جانتاکەی سووتاند، ئێمەش هەر بووخچە پارەیەکمان دایە دەستی یەکێک لەو دوو هاوڕێ ئافرەتەی حزب، کە پێشتر بۆ ئەم ئەرکە ئامادەمان کردبوون.

من و شێخ عەلی و هەردوو ئافرەتەکە بە دوو بووخچەی پارەی فەرمانبەرانی مەعاریفەوە سواری گالیسکەیەکی دوو ئەسپی بووین و حەمە کوڵەباڵیش بە گالیسکەیەکی ترەوە بەدواماندا تۆزی دەکردو لێخوڕە بۆ ماڵی (وەستا وەهاب) لە پشتی سەدەکە.

وەهاب پۆلیس بوو، ئەندامی حزبیش بوو، لە شۆڕشی نوێدا کوڕێکی قارەمانی بە ناوی (وریا)وە بە ناهەق شەهیدکرا!

هەردوو ژنەکەو من و حەمە کوڵەباڵ، ڕۆیشتین و پارەکەمان لەگەڵ شێخ عەلی، لە ماڵی وەستا وەهاب بەجێهێشت. بە (برایم پاشا)دا داگەڕاین و گەیشتینە سەرووی (سابوونکەران) لەبەر چووخمەکەدا بۆنی جگەری برژاو ئەو ناوەی تەنیبوو، حەمە وتی: "برسیمە شیشێک جگەر دەخۆم"، منیش پەڕیمەوە چایخانەکەی ئەوبەرو نان و ماستاوێکم داواکرد.

چەکداری کورد پۆلیس و ئەمن دایان بەسەر سابوونکەراندا، حەمە کوڵەباڵیان ناسییەوە، ویستیان بیگرن، حەمە وەک شێر دای لە هارەی دەمانچە، فریا نەکەوت و دووچەکداری کورد، یەکی یەدەگێک کلاشینکۆفیان لە حەمەدا بەتاڵ کردو شەهیدیان کرد. حەمە کوڵەباڵ کوردێکی قارەمانی کۆکۆییەکانی هەڵەبجە بوو.

چایچییەکە هاورێمان بوو، یەکسەر سینییە چای دایە دەستم و پاڵی پێوەنام بەرەو کۆڵانە باریکەکە، منیان نەناسییەوە، وەرگەڕایەوەو سینییەکەی لێسەندمەوەو تی: "خۆت دەربازکە".

ئیتر هێزەکانی میریی کەوتبوونە پشکنینی ناوچەکەو دابوویان بەسەر ماڵی شێخ عەلی-دا کە لەسەری فولکەکەی سابوونکەران بوو، کون و قوژبنیان پشکنیبوو، کاری ڕاستی ڕێکەوت ئەوە بوو، شێخ عەلی لە ماڵ نەبوو، دەنا بێ سێ و دوو دەیانکوشت.

منیش بە پێچاوپێچی کۆڵاندا لە سێرەی چاو خۆم لادەداو هەنگاوم دەنا تا گەیشتمەوە ماڵی (مەحمودی قالە فەرەج) لە گەڕەکی ئەقاری. لەوێ بەرپرسی هەموو شانە چەکدارەکانی قیادەی مەرکەزیی و ئەندامی سەرکردایەتیی حزب (ساڵح عەسکەری) چاوەڕێی دەکردم، باسی چالاکییەکەمان کردو

دوای ئەوە ساڵحمان بەڕێکردەوە بۆ بەغدا.

چەردەیەک لەو پارەیەمان بە هاوڕێ (فاروق نوری) و خێزانەکەیدا نارد بۆ بەغداو بەشێکیشیمان لە بەسەرکردنەوەی ماڵە شەهیدەکان و کڕینی چەکدا خەرج کرد، هێندێکیشمان لێ نارد بۆ هاوڕێیان لە کلکە سماق و شوێنی تر، بەڵام هێشتا بڕێکی باش پارە هەر مابوو.

من و (موسڵیح جەلالی) دەبوو بچین بۆ کۆنفرانسی فراوانی حزب لە بەغدا. جانتایەکی سەوزم هەبوو کردمانەوەو هەڵمانپچڕی، چی پارە مابوو لەگەڵ بەڵگەو نووسراوی نهێنیدا، سفت ڕامانخست لەناویدا، مقەبامان خستە سەرو قوماشمان بەسەردا داو بە سیریژ توووند چەسپمان کرد، وەک ئەوەی لە کارگە دروستکرابێت، ئینجا بەرگ و پۆشاک و کالەو پێتاومان تێخزاندو دامانخست و نامانەپشتی قەمەرەوە.

وا باوە ئۆتۆمبێلە تەکسییەکانی گەراج دوو کەس لە پێشەوە لای شۆفێرەوە سوار دەبن و سیانیش لە دواوە، من و موسڵیح چووینە پێشەوەو دوو نەفەریش لە دواوە سواربوون و شۆفێر وتی: "نەفەری سێیەم لەسەر ڕێگا لە ئەقاری هەڵدەگرین".

جا بۆ بەدبەختی، تۆ بزانە نەفەری سێیەم دەبێت کێ بێت؟!

ئۆتۆمبێل لە گەراج دەرچوو لە گەڕەکی ئەقاری ڕاوەستا، نـەفـەری سێیەم جانتا سـەوزەکـەی خستە سندووقی ئۆتۆمبێلەکەوە، خۆشی خزاندە دواوەو قەپات بووین و لێخوڕە بۆ (بەغدا)

دەرکـەوت جەنابی نـەفـەری سێیەم (یاسینی حاجی مستەفا)یە، یاسین شەقاوەو چەقۆکێشی پارتی بوو، کاتی خۆی لە سەردەمی قوتابێتیدا زۆرجار شەڕمان کردبوو، بەڵام تۆزێک چاوی کز بوو، بەتایبەت کە ئێمەش سەرو سمێڵی خۆمان ڕەنگکردبوو، یاسین ئەوکاتە قوتابی کۆلێژی وەرزشی بوو لە بەغدا، ئێمەی نەناسییەوە، بۆیە بەڕەحەتی گەیشتینە بەغدا، لە گـەراج خێرا تەکسییەکمان گرت بۆ گەڕەکی (بەیاع) بۆ ماڵی ساڵح عەسکەری.

هەرکە گەیشتین، هاوڕێ (ئەحمەدی دەلاک)و هاوڕێ (مەتی) پڕیان دایە جانتاکەو کە کردیانەوە تەنها هێندێک جل و کالەو دەرپێ و فانیلەی وەرزشی تێدابوو! من و موسڵیح چاومان چووە تەوقی سەرمان، توومەز یاسینە فەنی جانتا سەوزەکەی ئێمەی بـردووەو ئێمەش جانتا سەوزەکەی ئەومان هێناوە!

کە ناوی یاسینمان هێنا، ئەحمەدی دەلاک وتی: "تیاچووین، ئێستا یاسین حوکمەتمان لێ ئاگادار دەکاتەوە، هەرچی نهێنی حزبە لەو جانتایەدایە". ئەو شەوە هەرچی قیادەمەرکەزییە لە بەغدا لەتاو یاسین خەو نەچووە چاوی و یاسین نەیهێشت کەس لە ماڵی خۆیدا ڕۆژ بکاتەوە!

بەیانی چووین بۆ گەراج و لەوبەرەوە ڕاوەستابووین، یاسینمان بینی بە بۆڵەبۆڵ و جنێودانەوە خۆی کرد بە نووسینگەی گەراجەکەدا، ئێمەش خێرا هاوڕێیەکمان ناردو هەرکەس جانتای خۆی وەرگرتەوە. بێگومان ئەگەر ئێمە لە سلێمانی لەژێر جانتاکەدا پارەو نهێنییەکانمان بە مەحکەمی نەشاردایەتەوە، دەرەنجامەکان ترسناک دەبوون.

یاسینی حاجی مستەفا برای مامۆستا عومەر بوو، کە (عومەری مەچە)یان پێ دەوت، لەم ساڵانەی دواییدا بینیمەوە، باسی ئەو جانتا گۆڕینەم بیرهێنایەوە، دایمە دەیوت: "تۆ بزانە من چۆن ئەو پارووە چەورەم لەدەست خۆم داوە".

### ١٠- کوڕانی جەربەزە.

کە قیادەی مەرکەزیی ڕاگەیەنرا، بڕیاردرا لە هەموو شارەکانی ئێراقدا شانەی چەکدار دروست بکەین. ئەم شانە

چەکدارانە، دوای خۆ بەدەستەوەدانی لیژنەی مەرکەزیی و جەلالییەکان بە بەعس، هیواو ئومێدی هەموو تێکۆشەرانی کوردو عەرەب بوون، لەوانەی دژی گوتاری شۆڤێنی بوون و خەونی دیموکراسییان هەبوو.

دەردە پیریی وا دەکات هەموو شتم لەبیر نەبێت، دەمەوێت بەیادی شانەکەی (مستەفا چاوڕەش)ەوە هەموو ئەوانە لێم ببوورن کە ناویانم لەبیر دەچێت.

بیرم بێت شانەکەی مستەفا چاوڕەش لەم جوامێرانە پێکهاتبوون (ئەکرەمی حەپسە) تێکۆشەری جەربەزە، کە پاشان لە (موسڵ) لەسێدارە درا، (کەمالە کوێر، جەمالی عەلی فایز، فایەق دەرەویانی، عوسمانی نانەوا، ئیسماعیلی خەیات و جەلال چاوشین)

لەگەڵ مستەفادا بیرەوەریی زۆرمان هەیە، بەلام پێش ئەوەی پیرێتی خیانەت لە بیرەوەریم بکات، دەمەوێت بڵێم: "مستەفا باسکی بەهێزی حزب بوو و دوژمنانی حزب و شۆڕشی تەمبێ دەکرد، خۆ جەلالییەکان لە بەکرەجۆ، لەبەر ناو و ناوبانگ و ئازایەتی خۆی و هاوڕێکانی، کونە مشکیان لێ ببووە قەیسەری".

لەسەر داوای حزب و بەهۆی ئازایەتییەکەیەوە مسەفا چاوڕەشیان داواکرد بۆ بەغدا، لەوێش خۆی و هاوڕێکانی

کاری گرنگیان کردو زەبری گەورەیان وەشاند.

ڕۆژێک مستەفا وتی: "شوێنەکەمان خراپەو میریی چاوی لەسەریەتی". وا ڕێکەوت دۆستێکم کە ناوی (عەلی حسین بەگی جاف) بوو، لەوەوبەر ماڵی ئەوان پەناگەی من بوو، وتی: "ئێمە سەفەر دەکەین و پانزە ڕۆژێکمان پێدەچێت ماڵەکەمان بە تۆ دەسپێرم، بەڵام لەو گەڕەکەی ئێمەدا چەندجارێک دزیی کراوە ئاگاتان لە خۆتان بێت".

مستەفا چاوڕەش و ئەکرەمی حەپسەو جەمالی عەلی فایزو ئیسماعیلم برد بۆ ئەو ماڵەو کردمانە بنکەی چالاکی خۆمان.

شەوێکیان دز دای بەسەرماندا، ئێمەش بە تەقە هەڵمانبڕین و ڕاومانانان، خەڵکی گەڕەک ئەمەیان زۆر پێخۆش بوو، وتیان: "ماڵی عەلی بەگ ئاوابێت کە ئەمانەتی ماڵەکەی بە پیاوی وەکو ئێوە سپاردووە، ئێوە نەهاتنایەتە دەست و تەقەتان نەکردایە، دزو جەردە تالانیان دەکردین". دراوسێکان کۆڵێ سوپاسگوزار بوون و لەوەودوا ئەرکی کاسەدراوسێیەتیان، خافڵ نەدەکرد.

لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا ئەو ماڵە بووە بنکەیەک بۆ کۆمەڵێک چالاکی گرنگ، لەوانە هێرشکردنە سەر مۆڵگەی (مغاوير)ی سوپا کە پاسەوانی (فەرمانگەی ئەمن)یان

دەکرد، لە گەڕەکی ئەقاری و چەندین چالاکی تر، هەموو ئەمانەش بە سەرپەرشتی مستەفا چاوڕەش بوو.

بیرمە شەوێک لە ماڵی (مەحمود) بووین لە گەڕەکی (ئیسکان)، تەق و هوڕ پەیدابوو، مستەفا هەر زوو درکی بەوە کرد کە چوونەتە سەر ماڵی (وەستا وەهاب)، کە (شێخ عەلی)یش لەوێ بوو، پڕی دایە تفەنگ و دەمانچەکەی من و ئازا شێخ عەلییان لە دەستی جاش و ئەمن و سوپا ڕزگار کردو بگرە زیانیشیان بەوان گەیاندبوو.

بێگومان لەو ڕۆژگارەدا ئەگەر پیاوانی وەکو مستەفا چاوڕەش و هاوڕێکانی نەبوونایە، خەڵک هیچ ئومێدو ترووسکاییەکی نەبوو.

کوڕانی جەربەزە پێویستە یادیان بکرێتەوە، چونکە کەمن ئەوانەی بێ پەروا لەپێناوی بیروباوەڕدا گیانبازیی دەکەن.

١١- غازی.

لە بنکەکەی (بەمۆ) هاوڕێیەکمان هاوسەرگیریی کردبوو، بەڵام گرفتی ئەوەی هەبوو کە نەدەبوو بە زاوا. ئەودەمە لە سلێمانی بووم، بۆیە ئەم کارەم بوو بە تووشەوە، هاوڕێیەکی خۆمان هەبوو پزیشک بوو، نووسینگەکەی

لە شەقامی پیرەمێرد بوو، ناوی (ئەحمەد بامەڕنی) بوو.
پەلی زاوا زەردەم گرت و بردم بۆ لای پزیشکی هاوڕێمان، تۆزێک گفتوگۆیان کردو پزیشک وتی: "ئەمە کێشەیەکی دەروونییە"و پسوولەیەکی نووسی و هێندێک دەرمان و شتی وای تیابوو، کە وابزانم زۆربەی ڤیتامین بوو، تەنها یەکێکیان نەبێت کە شرینقە بوو.

ڕەچەتەکەم بەدەستەوە بوو لەگەڵ زاوادا بۆ ئەجزاخانە دەچووین، (موسڵیح جەلالی) لە سەری (سابوونکەران)ەوە هات، وتی: "چیتان کرد؟" وتم: "وا دەچین دەرمان دەکڕین".

ئەو دەمە ئەجزاخانەکەی (نوری عەلی) بەرامبەر سەرا بوو، چووین لەوێ دەرمان بکڕین، کە هاتمە دەرەوە، بە تیلەی چاو ئۆتۆمبێلێکی (فۆلکس واگن)م بینی (ئەودەمە فەرمانگەی ئەمنی عامەی بەغدا ئەو جۆرە ئۆتۆمبێلانەیان بەکاردەهێنا)، خەیاڵێک وەک بروسکە کەوتە سەر چاوم، وام مەزەنە کرد لە پشتی ئەو فۆلکس واگنەدا، چاوم چووە سەر چاوی کەسێک کە چاوانی لام نامۆ نەبوون.

بەخۆمم وت: "بڵێی ئەوە هاوڕێ غازی نەبێت؟!"

بە موسڵیحم وت: "شتێکی وا بەرچاوم کەوتووە".

موسڵیح وتی: "منیش بۆ ئەوە هاتم بۆ لات، سەعاتێک پێش ئێستا کە لە دوکانەکەی سمایلی حەڵواچی هاتمە

دەرەوە، یەکێکم بینی لە ئۆتۆمبێلێکی فۆلکس واگۆندا لە غازی دەچوو".

(غازی ئەنتوان) لە ئەندامانی سەرکردایەتی (قیادە مەرکەزیی) بوو، بەرپرسی کەرکوک بوو، جگە لەوەش سەرپەرشتی هەموو ئەو ڕێکخستنانەی دەکرد کە لە سوپای ئێراقدا بوو.

دوای گرتنی (عەزیز ئەلحاج)، هێزێکی تایبەتی ئەمن لە بەغداوە چووبوونە سەر غازی و لە ماڵەکەی خۆیدا گرتبوویان. بێگومان ئێمە ئاگامان لەمە نییە، بەلام ئەو ڕۆژە کە من و موسلیح ئەو خەیاڵەمان کردبوو سەبارەت بە غازی، گومانی ئەوەشمان لە لا دروست ببوو کە ڕەنگە گیرابێت.

لەو دەمەدا وا باوبوو هەموو سەری مانگ و پانزەی مانگێک لە ڕۆژێکی هەینیدا کۆبوونەوەیەک بکەین. ئەو ماوەیە لە نزیک ماڵی (حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا) کۆلانێکی باریک هەبوو دەچووەوە بۆ گەڕەکی (حاجی حان)، لەو کۆلانەدا لە ماڵی (بەکر قادر) کۆبوونەوەمان دەکرد.

بەکر هاوڕێی خۆمان بوو، پێوانەی ئاو و کارەبای ماڵانی دەخوێندەوە، سێ چوار منداڵی هەبوو، بەلام ئەو ماوەیە ژن و منداڵی بەهۆی نەخۆشییەوە چووبوونەوە ماڵە باوان

و ماڵ بۆ ئێمە چۆڵ ببوو تا بیکەینە بناوان.

ڕۆژێکی هەینی بوو لە ماڵەکەی بەکر قادر کۆبوونەوەمان هەبوو، من و موسڵیح و (شێخ حەسەن)، کە ناومان نابوو پیری موغان، لە شیوعییە کۆنەکانی (قادرکەرەم) بوو، لەگەڵ (سابیر)ی بەرپرسی (هەولێر)و هاوڕێ (ئیسحاق) ی بەرپرسی (دهۆک)ی حزب، چاوەڕوانی غازیمان دەکرد. زەنگی دەرگاکە لێیدا، لەناو ئەو پیرەدا من بەتەمەن لە هەموویان بچوکتر بووم، بۆیە چووم دەرگاکەم کردەوە.

وەک چاوەڕوان بووین بێگومان میوانەکە هاوڕێ غازی بوو، بەڵام ئەمجارە کە چاوم کەوتە سەر چاوی، بریسکەیەک بە تاریکیی مێشکمدا هات، وەک ئەوەی خانەگومانیم پێم بڵێت: "شتێک لەئارادا هەیە"، ئەمەو بارودۆخی سیاسی ئەودەمەی حزب و خەیاڵاتەکەی من و موسڵیح سەبارەت بە غازی لەناو فۆلکس واگنەکەدا، هەموویان پێکەوە بوون بە هۆکار بۆئەوەی کە غازی بە عەرەبی لێی پرسیم: "هاوڕێیان ئامادەن"؟ بڵێم "نەخێر"!

غازی مەسیحی بوو، لەوەوبەر کە دەهات بۆ کۆبوونەوە، کوڕێکی ڕێکوپێکی جوانپۆشی بۆینباغ لە مل و سەرو پۆتەڵاک تاشراو و لێوبەخەندە بوو، ئەمجارە کە دەرگام کردەوە، غازی وا نەبوو، جگە لەوەش یەکسەر دوو حەیتە

زەلامم لە پشتییەوە بینی، کە دەستیان لە گیرفانیان نابوو، بۆیە دەبوو تێبگەم کە هاوڕێی غازی خۆی نییەو لەلایەن میرییەوە گیراوەو هێناویانە بۆئەوەی شوێنی ئێمەش ئاشکرا بکات، بەڵام کابرا ویژدانی ڕێگای پێ نادات و دەیەوێت هەرچۆنێک بووە تێمان بگەیەنێت، کە ئەگەر بتوانین خۆمان دەرباز بکەین و نەکەوینە دەست ئەمن و بەو دەردەی ئەو نەچین.

غازی کە دەهات دوو شوێنی دەزانی، ئەم ماڵە، کە شوێنی کۆبوونەوە بوو لەگەڵ ماڵی (عەلی بۆسکانی)، چونکە کاتی خۆی لەگەڵ عەلی بۆسکانیدا لە (نوگرە سەلمان) زیندانی بوون.

غازی وتی: "موسڵیح لێرەیە؟" وتم: "نەخێر". غازی وتی: "کەی دێن؟" وتم: "سەعات چوار".

وتی: "کە موسڵیح هات، پێی بڵێ غازی هاتووەو سەعات چوار دێتەوە بۆ لات". فەرمووم لێکردن چایەک بخۆن، بەڵام غازی و هەردوو حەیتە زەلامەکە ڕۆیشتن، منیش لە کونی دەرگاوە سەیرمکردن و دواتریش کەوتمە دوایان و بینیم چەند ئۆتۆمبێلێکی پڕ لە چەکدار لەسەر شەقامی (ئۆرزدی) وەستاون.

هەردوو زرتەبۆزەکە غازییان سواری هەمان ئەو فۆلکس واگۆنە کردەوە، کە من و موسلیح بینیبوومان.

چوومەوە لای برادەران، وتیان: "چی بوو، بۆ غازی نەهاتە ژوورەوە"؟ وتم: "هاوڕێیان بە ڕێکەوت ڕزگارمان بووە". کە بۆم باسکردن، کەوتینە گەرمەی گفتوگۆکردن و شێخ حەسەن وتی: "کاکە تەواوە غازی گیراوە، بەڵام نەیویستووە ئێمە بەدەستەوە بدات و ئەو هاتنەشی پەیامێک بووە بۆئەوەی فریای بکەوین".

ڕێکەوتین هەرکەسە بچێت بە لایەکداو خۆی ون بکات و لەبەرچاو نەبێت، من و موسڵیح، شێخ حەسەنمان بەڕێکردو بەتەنیا ماینەوە. کەوتینە کنەی ئەوەی کە هەرچۆنێک بێت لەڕێگەی ئەو شانە چەکدارەی هەمانبوو، غازی لە دەستی میریی ڕزگار بکەین.

بۆ ئەمە جارێکی تر دەبوو پەنا ببەینە بەر شانە چەکدارەکانمان، لەو ماوەیەدا مستەفا چاوڕەش و ئەکرەمی حەپسەو هێندێکی تر، بۆ چالاکی چووبوون بۆ بەغدا.

ماڵی فایەق دەرەویانی لە تەنیشت گەرماوی (پەرخی) بوو، ئەوەش بنکەیەکی تری کاری حزبی و کۆبونەوەمان بوو. ئەو ڕۆژە من و موسڵیح لەگەڵ فایەق دەرەویانی و مەلا ڕەئوف و جەلال چاوشین و عوسمانی نانەوا

کۆبووینەوەو بەدرێژیی باسی ئەو ڕووداوەمان بۆ کردن.

لەوێدا بوو بە مقۆمقۆو هەریەکە لە ئاوازێک دەیانخوێند، یەکێکیان وتی: "جا ئەگەر غازی بگیرایە، ئەی بۆچی ئێوەی بەگرت نەداوە؟" لەولاوە وەڵامی درایەوە، کە "غازی چاو و ڕاوی لە ئەمنەکان کردووە، ویستوویەتی پەیامێک بە ئێمە بگەیەنێت کە ئاگاداری خۆمان بین".

قسە زۆر کرا. وتمان: "ئێستا ئەوەی دەیزانین ئەوەیە، کە غازی لەگەڵ ئەمنەکاندا سەعات چوار دێتەوە بۆ ماڵی بەکر قادر"، بۆیە لەسەر ئەم پلانە ڕێککەوتین.

موسڵیح نامەیەکی نووسی بۆ هاوڕێ (عامیل)، غازی ناوی حزبی هاوڕێ عامیل بوو، لە نامەکەیدا دەڵێت: "ئێمە کۆبوونەوەکەمان گواستەوە بۆ ماڵی هاوڕێ سیروان، لەگەڵ هەڵگری نامەدا وەرە، ئەو شارەزای شوێنی کۆبوونەوەکەیە".

خوا هەڵناڵگرێت لەناو هەمواندا فایەق وتی: "من نامەکە دەبەم". بێگومان ئەمە کارێکی قورس بوو، هەر لە جوامێریی و ئازایەتی فایەق دەوەشایەوە.

لەدوای سەعات سێی پاشنیوەڕۆوە من و موسڵیح لە کۆلانێکی باریکدا کە بە تەنیشت کۆلانەکەی ماڵی (ڕەشەی موختار)ەوە بوو خۆمان مەڵاس دابوو، چاودێریی ماڵەکەی

بەکر قادرمان دەکرد.

سەعات چارەکی دەویست بۆ چوار، دوو سێ ئۆتۆمبێلی پڕ لە چەکدار ئەو ناوەیان تەنی، بینیمان فۆلکس واگۆنە خۆڵەمێشییەکەش گەیشت و غازی دابەزی و هەردوو زرتەبۆزەکە لەگەڵیدا بوون و بەرەو ماڵی بەکر بەڕێکەوتن، چەند هەنگاویش دوورتریش دووانی تریان بەدواوە بوو.

بەر دەرگاکەی ماڵی بەکر بەجوانی لە من و موسڵیحەوە دیاربوو، بەبێ ئەوەی ئەوان بتوانن ئێمە چاو بکەن، چەکدارەکان لەناو ئۆتۆمبێلەکاندا هەموو لە ئامادەباشیدا بوون، دیاربوو خۆیان بۆ ڕاوی نێچیرێکی باش ناوەتەوە.

چاومان لێبوو فایەق نامەکەی دایە دەستی غازی، ئێمە لە پلانەکەماندا فایەقمان ئاگادار کردبوو، پاش ئەوەی نامەکە دەداتە غازی، ڕێنوێنی بکات بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە، کە گوایە لە ماڵی هاوڕێ سیروانەو لە فایەقیشمان گەیاندبوو کە بیانبات بەرەو برایم پاشا.

لە لای چەپی گردی سەیوان و لەولاتر نزیک مزگەوتەکە پردێک هەبوو، پلانەکە وابوو شانەچەکدارەکەمان کە کلاشینکۆفێک و سێ دەمانچەی چواردەخۆریان پێبوو، لەوبەر پردەکەوە دابمەزرێن، فایەق، غازی و ئەوانەی بەدوایانەوەن بیانگەیەنێتە پردەکەو لەوێدا خۆی ون بکات

و دەرباز بێت.

کێشەکە لەوەدا بوو ئەندامانی شانەکە کە لەوبەر پردەکەوە دامەزرابوون و هەریەکە لە: مەلا ڕەئوف، جەلال چاوشین، عوسمانی نانەواو ئیسماعیل ئەحمەد بوون، غازییان نەدەناسی، بۆیە ئێمە پێشتر بۆمان وەسف کردبوون کە غازی پیاوێکی بالآبەرزی سپیکەڵەیەو قاتێکی شینباوی لەبەردایەو قژی ڕەشەو چەند تاڵێکی سپی تێکەوتووەو بە سەروسەکوتیشییەوە دیارە مەسیحییە.

بێگومان دوو زرتەبۆزەکەی بەدوای غازییەوە بوون، ڕەشتاڵەو چوارشانە بوون، بۆیە بەئاسانی غازی لەوان جیادەکرایەوە.

لەگەڵ غازی گەیشتە سەر پردەکە، تەقە دەستی پێکردو بوو بە فەرتەنە، فایەق خۆی قوتار دەکات و جەلال چاوشین وەک هەڵۆ، غازی پەلکێش دەکات و ڕزگاری دەکات. دوو زرتەبۆزەکەی بەدوای غازییەوە بوون یەکێکیان کوژراو یەکێکیان بریندار بوو، بێگومان چەکدارەکانی تری میریی کە لە ئۆتۆمبێلەکاندا بوون، دابەزین و کەوتنە تەقەکردن.

هاوڕێ عوسمان کرێکاری بەنزینخانە بوو، ماڵی لە (سەرشەقام) بوو، من و موسڵیح کە زانیمان غازی لە خەم ڕەخسیوە، بەهەڵەداوان داگەڕاینەوە بەرەو ماڵی ئەوان.

هێندەی نەبرد غازی خۆی کرد بە ژووورداو باوەشی پیاکردین. هەر ئەو ئێوارەیە ولاخمان پەیداکردو غازیمان دایە دەست عوسمان و ڕەوانەی گوندی (دۆڵاش) کرا.

شانە چەکدارەکەی ئێمە لە یەک دابڕابوون، ئاگامان لە مەلا ڕەئوف و ئەوان نەما، بەڵام کە غازیمان ڕەوانە کرد، بە جەلال چاوشینمان وت: "ئێوەش خۆتان ون بکەن".

من و موسڵیح وتمان "ئەمشەو لەم شارەدا هەر ماڵێک بۆنی شیوعی لێبێت، ناتوانین ڕۆژی تیابکەینەوە"... هێنامان و بردمان، لەسەر ئەوە ڕێکەوتین پەنا ببەینە بەر ماڵی کەسێک کاربەدەستی میریی بێت.

(عەبدوڵلا زەنگەنە) لەو شیوعییانە بوو کە لە لیژنەی گزنگی حسێن عارفدا کاریان دەکرد، بەڕێوەبەری بانکی کشتوکاڵی بوو، من و موسڵیح خۆمان خزاندە ماڵی ئەوان، کە چووینە ژوورەوە (پەخشان)ی کچی کاک عەبدوڵلاو (عومەر عەلی شێخە)ی مێردی لەوێ بوون و لەسەر ڕۆیشتن بوون. ئەو پەخشانە، ئەم (پەخشان زەنگەنە)یەی ئێستایە، کە چالاکوانی ئافرەتانەو مێردەکەشی دواتر بوو بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی کوردستان.

لەگەڵ عەبدوڵلا زەنگەنە کەوتینە گفتوگۆو وتی: "شار خرۆشاوەو قلیشاوەتەوە، بەدوای ئێوەدا دەگەڕێن".

ئەم چالاکییە دەنگدانەوەی زۆری هەبوو، دواتر کە هێندێک لەو سەرکردانەی حزبی شیوعیمان بینییەوە کە لە زینداندا بوون، دەیانوت: "دوای ئەو چالاکییە بەعسییەکان دەستیان لە ئەشکەنجەدانمان هەڵگرت".

دەمێنێتەوە بڵێم، کە لەسەر پردەکە تەقە دادەمەزرێت و غازی ڕزگار دەکرێت، چەکدارەکانی میریی مەلا ڕەئوف بریندار دەکەن.

لەسەر کارێزەکەی (مامەیارە) هێندێک لە چەکدارەکانی (بەکرەجۆ) خەریکی سەیران و سەفا دەبن، کە تەقە دەست پێدەکات، دەشڵەژێن و دەچن بەپیرییەوە، بەبرینداریی مەلا ڕەئوف دەکەوێتە دەستیان و هەرچەند پیان دەڵێت: "من شیوعیم"، سودی نابێت و بە برینداریی ڕادەستی چەکدارانی میریی دەکەن. مەلا ڕەئوف لە زینداندا مایەوە، هەتا دەرفەتی گفتوگۆ ڕەخساو لەگەڵ دیلی تردا ئاڵوگۆڕ کراو ئازادکرا.

١٢- کۆنفرانس.

لەو سەروبەندەدا (عەزیز ئەلحاج) لەلایەن میرییەوە دەستگیر کرابوو، بەدوایدا زۆربەی سەرکردەکانی قیادەی مەرکەزیش کەوتنە دەستی بەعس، عەزیز ئەلحاجیان هێنایە سەر تەلەفزیۆن و سوکایەتییان پێکرد.

نائومێدییەکی زۆر باڵی بەسەر ڕێکخستن و ڕیزەکانی حزب و تەنانەت بەسەر هەڵگرانی بیری چەپی شۆڕشگێڕییدا کێشابوو.

هەوڵێکی زۆرمان دا بۆئەوەی خۆمان کۆ بکەینەوەو ئەوەی ماوەتەوە شتێکی لێدروست بکەین، هەرچی ئەو هاوڕێیانەمان کە بەر پەلاماری بەعس نەکەوتبوون لە بەغداو موسڵ و ناوەڕاستی ئێراق و باشوورو تەنانەت لە هۆڕنشینەکانیشەوە کۆمان کردنەوەو هێنامان بۆ کوردستان.

ئەگەرچی دەردە پیریی وا دەکات ناوی زۆر هاوڕێ و هاوخەباتم لەبیربچێت، بەڵام با لێردا ئەوە بنووسم، کە (شێخ حەسەنی قادرکەرەم) لە جوامێرانی ئەو ڕۆژگارە بوو.

ئەو هاوڕێیانەی کە لە ناوچەکانی ئێراقەوە دەهاتن، من پێشوازییم لێ دەکردن، دەستە دەستە لە سلێمانییەوە دەمناردن بۆ گوندی (دۆلاش)ی ناوچەی قەرەداغ، چونکە لەوێ هێزێکی چەکداری بچووکی حزبمان هەبوو.

(ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە) لە ئەندامانی حزب بوو، لەو دەوڵەمەندانەی تری وەکو (عەلی بۆسکانی و حەمەی حاجی ساڵحی حەمامچی) بوون، کە یارمەتی حزبیان دەدا.

چوومە ماڵی ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە، بۆئەوەی هاوڕێ (ئیبراهیم عەلاوی) وەربگرم و ڕەوانەی دەرەوەی بکەم.

مانگی گەلاوێژی (١٩٦٩) لە گوندی (ئەستێل) ی ناوچەی قەرەداغ کۆنفرانسی حزبی شیوعی (قیادە مەرکەزیی) بەستراو پاش پێنج ڕۆژ لە گفتوگۆی چڕوپڕو هەڵسەنگاندنی بارودۆخی وڵات لە ڕۆژی پێنجەمداو لەژێر زەبری هێرشی ڕژێمدا کۆتاییمان بە کۆنفرانسەکەمان هێناو سەرکردایەتییەکی نوێمان لەم ناوانە پێکهێنا:

١- موسڵیح جەلالی- سکرتێر.

٢- ئیبراهیم عەلاوی- جێگر.

٣- ئەبو محێسن (بەهجەت)، بەرپرسی هێزە چەکدارەکانی زۆنگاوەکانی باشوور.

٤- خزەیر عەباس (ئەبو جەعفەر).

٥- محەمەد ئەمین پێنجوێنی (جەمال)، بەرپرسی لقی کوردستان.

٦- عەبدولجەبار ئەلزەهاوی (ئەبو عەلی)، هێزی پێشمەرگە.

٧- غازی ئەنتوان- بەرپرسی کەرکوک و هێزی عەسکەری.

٨- عاسم خەفاجی- بەرپرسی چاپەمەنی و پەیوەندییەکان.

ئێوارەی ڕۆژی پێنجەمی کۆنفرانسەکەمان نامەیەکمان لە (حەمەی سەید عەلی حافز)ی بەرپرسی پارتی لە قەرەداغەوە بۆ هات ،داوامان لێ دەکات لە (قۆپی داری زەرد) ئامادەبین.

ئێمە زانیبوومان هێرشی سوپاو جاش لە گەرمیان و سلێمانییەوە دەستی پێکردووە بۆ سەر قەرەداغ و بەرەبەرە کار ڕوو لەوەیە چواردەورمان بگیرێت، بەتایبەت (شێخ جەعفەر بەرزنجی (پارتی بوو)، کە دواتر بوو بە پارێزگاری سلێمانی، ئەودەمە ئامر بەتالیۆن و فەرماندەی هێزەکەی گەرمیانی پارتی بوو، هەر زوو خۆی ڕادەستی میریی کردبوو و دەرفەتی بە سوپاو جاش دابوو بەرەو قەرەداغ پێشڕەویی بکەن.

دوای کۆنفرانس کەوتینە خۆمان، هاوڕێیانی عەرەبمان بڵاوە پێکرد، ئەوانەش کە نەیاندەتوانی بەرگە بگرن لە ڕێگەی دەربەندیخانەوە ڕەوانەمان کردنەوە. شەش هاوڕێی تریشمان لە گوندی ئەستێڵ بەسەر هاوڕێ (کاکەوڵا)دا بەجێهێشت و پێمان وت: "ڕەوانەی ناوشاریان بکات بۆ لای دۆستەکانی خۆمان".

لەگەڵ موسڵیح جەلالی و ئەبوعەلی-دا چەکدارەکانمان گردکردەوەو بەرەو قۆپی داری زەرد بەڕێکەوتین. کە گەیشتینە جێ، (حەمەی سەید عەلی حافز)ی فەرماندەی

هێزی قـەرەداغ نزیکەی بیست کەسێک دەوریـان دابـوو، ئـەوانـەی ناسیمنەوە، فەرماندەی بەتالیۆن: (نەجمەدین حەسەن، خالید ڕەباتی، ڕەحیم دۆینە) بوون. فەرماندەی هێزەکە وتی: "ئەمشەو بەرەو بەرزنجەو شارباژێڕ پاشەکشە دەکەین، دەبێت پێش خۆرکەوتن لە عەربەت پەڕیبینەوە، بە شاخەکانی بەرزنجەدا بەرەو شارباژێڕ شۆڕبووبینەوە".

حـەمـەی سـەیـد عـەلـی مـن و موسڵیح و ئەبوعەلی جیاکردەوەو وتی: "با هێزەکەتان لە نزیکی ئێمەوە بێت و ئەوانەش کە جێگەی باوەڕتانن، با لە نزیک خۆتان بن، با لەگەڵ یەکیشدا لە پەیوەندیدا بین، چونکە زانیاریمان هەیە لەکاتی پاشەکشەدا هێندێک لەناوماندا هەن دەیانەوێت دەست بوەشێنن و بـەرەو بەکرەجۆ ڕابکـەن و خۆیان ڕادەستی جەلالییەکان بکەن".

لە گەرمەی ئەم قسانەدا بووین، تۆپێک دای بە تەنووری نانکردنکەدا، کە چەند مەترێک لێمانەوە دوور بوو، ئەم ڕووداوە هەموانی پەشۆکاندو بێ ورەی کردین و دەستمان بە پاشەکشە کرد.

هـەمـوو ئـەوانـەی لـە بـەری گەرمیان و قـەرەداغـەوە شکابوون لەگەڵ ئێمەدا کەوتنە سەر یەک ڕێچکە، فڕۆکەکان لە ئاسمانەوە بۆردوومانیان دەکردین، لە قەرەداغیشەوە تۆپخانەی میریی دەیکوتاین، بە فەلاکەت لەسەر چیای

(پۆشانەوە) شۆڕبووینەوە بۆ دیوی شارەزوور.

لە نزیکی زەڕایەن جاش ڕێگەی پێگرتین، تەقوتۆق کراو بریندارێ لێکەوتەوە، یەکێک لەوانە هاوڕێیەکی عەرەب بوو، کە سەربازی هەڵاتوو بوو، ماوەیەکی کەم بوو تەقلی ئێمە ببوو، قۆناغێک ڕێمان کرد تا تراکتۆرێکمان بینی پێشمەرگە خۆیان پیاهەڵواسیبوو، بریندارە عەرەبەکەمان خستە ناو تراکتۆرکەوەو وتمان: "لە بەرزنجە لێتان وەردەگرینەوە".

لەناکاودا وتیان: (ئازاد قەرەداغی) بریندارە، (سەعە سوری جافەرانی و فایەق دەرەویانی) وتیان: "ئازاد خزممانە"و چوون بە هانایەوە، لەوسەرەوە کە هاتنەوە ئازادیان دابوو بەسەر هێسترێکدا، دیاربوو برینەکەی سوک بوو، ئەو زوو منی ناسییەوە، چونکە لە ئامادەیی پیشەسازیی هاوڕێی خوێندن بووین.

ئازاد بەسەر هێسترەکەوە وتی: "گوێتم بەرێ قسەیەکت پێ بڵێم"، لیی چوومە پێشەوەو چرپاندنی بە گوێمداو وتی: "ئاگاتان لەو عەرەبانە بێت کە لەگەڵتاندان، هێندێک لەگەڵ جاشەکان ڕێکەوتوون کە بیانفڕێنن و بیانفرۆشنەوە بە حکومەت".

تاریک و ڕوونی بەیان بوو، بە هەر دەردی سەرییەک بێت، هێزەکەمان پەڕییەوە بۆ بەری شارباژێڕو لە گوندی (حاجی مامەند) جێگیر بووین، ئاگاشمان لێبوو هەلیکۆپتەر

بە شەستیر بەربووە ئەو گرووپانەی کە لە دواوە بەجێمابوون.

لەم سەروبەندەدا دوو هەواڵمان پێگەیشت.

هەواڵی یەکەم:

ئەو شەش هاوڕێیەی کە دابوومانە دەست (کاکەولا) لە گوندی (جێشانە)ی نزیک شاخی (هەزارمێرد)، کەوتوونەتە بۆسەی چەکدارانی سەر بە میریی، ئەوانیش ڕادەستیان کردوون و میریش بەو مەرجە مەرەخەسی کردوون کە لە ڕۆژنامەی (الثورە)ی زمانحاڵی حزبی بەعس و ڕۆژنامەی (النور)ی جەلالییەکاندا، زنجیرەیەک وتار بنووسن و هێرش بکەنە سەر شۆڕش و بارزانی و بە خائین و پیاوی شای ئێران لەقەڵەمی بدەن و (قیادەی مەرکەزی) حزبی شیوعیش وەک بەکرێگیراوی بارزانی وەسف بکەن.

لەو هاوڕێیانەی پاش دەستگیرکردنیان بە دڵی سەرانی بەعس وتاریان نووسی و ئازادکران ناوی (هومام ئەلمەرانی و عیسام ئەلخەفاجی و غازی ئەنتوان)م لەبیرە، ئەو دووان سیانەی تر، دیارە بەخت یاوەریانە، کە من ناویانم بیر نەماوە تا تۆماریان بکەم!

هەواڵی دووەم:

ناخۆشتربوو لە هەواڵی یەکەم، لەبەرئەوەی پێیان ڕاگەیاندین، هاوڕێ عەرەبەکەی خستمانە ناو تراکتۆرەکەوە،

لە ڕێگا چەند کەسێک بۆئەوەی کلاشینکۆفەکەی لێبدزن، کوشتوویانە!

جابا لەیادم نەچێت، لەو کۆنفرانسەی لە گوندی ئەستێڵ بەستمان، دەرکەوت یەکێک لە ئەندامەکانمان پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتیی حزبی بەعسدا هەیەو زانیارییەکی زۆری حزب و شۆڕشی بۆ گواستوونەتەوە. دوای لێکۆڵینەوە، پاش ئەوەی تۆمەتەکانی سەلماند، بە بڕیاری کۆنفرانس بەتۆمەتی سیخوڕیی سزادرا.

دەردە پیریی زۆر بیرەوەریم لێ دەشارێتەوە، بەڵام شتیش هەیە باش لەبیرمەو دەبێت بیبەمە ژێر گڵ، لەو کۆنفرانسەدا بۆمان دەرکەوت هەبوون هاوڕێی خەبات بوون و بە ناوی جیاوازیی بیروڕاوە دەمێکبوو خۆیان فرۆشتبوو بە بەعس، ئەمە ناخۆش نییە، ناخۆش ئەوەیە لەوانە تیایاندایە تا ئێستاش لە ڕیزی پێشەوەن، با بەردێکی لەسەر دانێم!

ساڵەهایە
ئاگر ئەکەینەوە
شەوارە بووین، بەدەوریاندا ئەتلێینەوە!
بە نمێک باران، تەپ و دووکەڵ
کوژایەوە...
کوژایەوە!
پزیسکێکی کەوتە کای کۆن...!
بڵێسەی هەڵگیرسایەوە...!
شەختەو سەهۆڵ توایەوە...!
چرۆو خونچە، گەشایەوە
هەزار ساڵە
بەدوای چەکوشەکەی کاوەدا
دەخولێینەوە، دەڕۆین و دەگەڕێینەوە،
خوێناوی دڵ دەخۆینەوە

١- دانیشتن.

موسڵیح ماوەیەک هاتەوە بۆ سلێمانی، دوای ئەوە چوو بۆ کەرکوک، پاشان دەنگی نەماو ئەوەندەم زانی لە بەغدا بووە بە بەڕێوەبەری گشتی، ئەم کەینوبەینە دیاربوو چۆن کرابوو!

من بەتەواوەتی پشتم لە کاری حزبی کردو لەماڵەوە دانیشتم و منداڵێکیشمان ببوو، دەبوو لە سلێمانی سەرقاڵی ژیانی خێزانیی بم. لە خوار گەڕەکی برایم پاشا خانوویەکم بە کرێ گرتبوو بە دوو دینار، بێگومان بۆ منێک کە ئەو دەمە هیچ ئیشوکارێکم نەبوو، قورس بوو بتوانم کرێ بدەم، ئەگەر کۆمەک و هاوکاریی عەلی بۆسکانی و ئەکرەمی ساڵحی ڕەشەو حەمەی حاجی ساڵحی حەمامچی نەبووایە، کە هەرجارەو یەکێکیان کرێکەیان بۆ دەدام.

ئیتر بەڕاستی خەریک بوو باری سەختی گوزەران تەنگیان پێهەڵدەچنیم، ڕۆژێکیان (محەمەد مستەفای پارێزەرو حەمەسدیقی پارێزەر) کە کاتی خۆی ئەوانیش لە حزبی شیوعیدا بوون و تەنانەت جارێکیان لە ماڵی حەمە سدیق کۆنفرانسێکمان بەستبوو، وتیان: "کاکە ئیشێکمان

بۆ دۆزیویتەوە لە مەسلەحە"، کە ئەوە ئاژانسی پاسی هاتۆچۆکردنی گشتیی ناوشاری سلێمانی بوو و پێیان دەوت: "مەسلەحە".

وتیان: "لەوێ کارمەندێکی کارەباییان دەوێت"، منیش خۆم لەبەرئەوەی لە ئامادەی پیشەسازیی لە بەشی کارەبا بووم، شارەزای ئەو بوارە بووم، کاریان ڕاست بێت بەهۆی ئەوانەوە لە بەشی چاککردنەوەی پاسەکانی مەسلەحە دامەزرام و مانگی حەوت دینار مووچەکەم بوو.

فەرمانگەکە ناوی (بەرژەوەندیی گواستنەوەی سەرنشینان) بوو، ئەو دەمەش (فەرەج سەعید) بەڕێوەبەری بوو، کە خەڵکی پێنجوێن بوو. لەبەرئەوەی بەڕێوەبەر ئەندامی لقی پارتی بوو، لەو دەمەشدا بەیانی یانزەی ئازار دەرکرابوو، پارتی لەگەڵ میریدا جۆر بوو، پارتی لەو فەرمانگەیە دەستڕۆیشتوو بوو.

لەم ماوەیەدا کوڕەکەم تەندروستی زۆر خراپ بوو، دایکی لە شیر کەوتبوو، دەبوو شیری بۆ پەیدا بکەم، بۆ ئەمەش لە نەخۆشخانەی شیرەکە لە سەرەیەکی درێژدا دەوەستام، تاوەکو هێندێک شیرم دەستبکەوێت، کە ئەوکاتە بێ بەرامبەر دەیانبەخشی. دوای چاوەڕوانییەکی زۆر شیرەکەم بردەوە، بەڵام کوڕەکەم ئەم شیرەی پێ

نەدەکەوت و بارودۆخی تەواو خراپ بوو، ناچار دەبوو بیبەینە لای پزیشک.

دکتۆر (محەمەد باقر) هەبوو، ئەویش شیوعی بوو، هەرچۆنێک بوو لەگەڵ دایکیدا کوڕەکەمان پیشانداو ئەویش چارەسەری بۆ نووسی و وتی: "دەبێت جۆرە شیرێکی تایبەت بخوات". کێشە لەوەدا بوو من لەوکاتەدا پارەی ئەوەم نەبوو ئەو پێویستییانە بکڕم، بۆیە دکتۆر باقر پێنج دیناریشی دامێ و بەهۆی ئەوەوە کوڕەکەم هاتەوە سەر خۆی و تەندروستی بەرەو باشتر چوو.

بەو جۆرە گوزەراندم، تاوەکو دەرووییەکی ترم لێکرایەوە، پاش ماوەیەک لە کارمەندی کارەباییەوە کرام بە (چاودێر)، ئەمەش لە ئیشەکەی پێشووتر باشتربوو، چونکە مووچەکەم کەمێکی تر زیادی دەکرد.

چاودێرەکان لەبەردەرکی سەرادا ئۆفیسێکی بچووکیان هەبوو، دیوارەکانی جامخانە بوو، چاودێریی کات و ژمارەی پاسەکانیان دەکرد. منیش پاش کەمێک کرام بە سەرپەرشتی چاودێرەکان، کارەکەم لەوێ بوو، لەبەرئەوەی خەڵک دەیانناسیم، زوو زوو بە سڵاو و گفتوگۆکردنەوە غافڵ دەبووم، کەسایەتیی شار لە نووسەرو سیاسەتوان سەردانیان دەکردم.

پاش ماوەیەک بەڕێوەبەر بانگی کردم و وتی: "کاکە من و تۆ هاوشارین، من لەسەر داوای ئەم و ئەو تۆم هێناوەتە ئێرە، بەو مەرجەی واز لە کاروباری حزبی بێنیت و کارت بەسەر شیوعییەکانەوە نەبێت".

وتم: "وازم لە هەموو شت هێناوە، بەڵام خەڵکەکە دەمناسن و وەکو دۆست و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی سەردانم دەکەن". من وتم و ئەو گوێی نەگرت. ئاخری وەک سزادانێک لەو کارە لایدام و کردمی بە (جابی)، واتا ئیتر دەبوو لە پاسەکاندا، تکت بۆ سەرنشینەکان ببڕم.

منیش ناچاربووم کارەکە بکەم، لەو ماوەیەدا هێندێک لە خزمەکانم کە لەناو پاسەکاندا دەیانبینیم، زۆریان پێ ناخۆش بوو، هەیان بوو خواپێداو و پەنەکەوتەبوون، دەیانوت: "کاکە مووچەکەت چەندە، مانگانە دەتدەینێ، بەڵام ئەم کارە مەکە".

فایەق دەرەویانی و برادەرێکی تر کە لەوەوبەر لە حزبی شیوعیدا بوون، لەگەڵ پارتیدا ڕێکەوتبوون. فایەق کە منی دەبینی بەو حاڵەوە، زۆری پێ ناخۆش بوو، هەوڵی زۆری لەگەڵدا دام کە تازە بارودۆخەکە گۆڕاوەو کارکردن لەگەڵ پارتیدا خەباتێکی نیشتمانی و کوردانەیە.

ئیتر ئـەوان چـووبـوون و لـەلای پارتـی باسی منیان کـردبـوو، کـاک (ئیدریس بـارزانـی) وتـبـووی: "مـن خۆم دەیناسم و کەسێکی باشە".

ئیتر ئەوان کارەکەیان ڕێکخستبوو، کە کاک ئیدریس ببینین، من و فایەق و سەعەسورو سێ بـرادەری تری کەرکوک و گەرمیان، شەش کەسێک دەبووین، چووین بۆ سەردانی ئیدریس بارزانی.

ئەودەمە کاک ئیدریس لە (دیلمان) بوو، چاوەڕوانمان دەکـرد کاک ئیدریس ببینین، بردیانینە شوێنێکی تایبەت و پـاش کەمێک چـاوەڕوانـی کـاک ئیدریس هـات و کاک مەسعودیشی لەگەڵدا بوو، باسی ئەوە کرا، کە ئێوە خەڵکی تێکۆشەرن و ئەگەرچی شیوعی بوون، ئێستا دەتوانن بە شێوەیەکی تر درێژە بە خەبات بدەن.

نموونەی (فاخر مێرگەسوری)یان هێنایەوە (فاخیر ئەندامی لقی کوردستانی حزبی شیوعی بوو، چووبووە ناو پارتی)یەوە، وتیان: "خۆ ئەویش شیوعی بووە، ئەوەتا ئەو ئێستا خەریکی کارو چالاکییەو باسی ئەوەش کرا، ئەگەر کەسی وەکو ئێمەومانان کار بکەین لە پارتیدا، باشترە لەگەڵ فاخیر میرگەسوریدا بین.

کاک ئیدریس یەکی سەد دیناری داینێ بۆ مەسرەفی

ڕێگا، بێگومان بۆ ئەوکاتە سەد دینار زۆر بوو.

لەڕاستیدا من دوودڵ بووم و خۆم بۆ ساغ نەدەکرایەوە، هەروا بە مۆلەق مامەوەو هاتمەوە سلێمانی.

چوومەوە سەر کار، بەڵام فەرەجی بەڕێوەبەرم کە زانی بێ پرسی ئەو چووم کاک ئیدریسم بینیوە، ئەوەندەی تر ڕقی لێ هەڵگرتم.

ئەوکاتە وەک وتم، کاک فەرەج ئەندامی لق بوو، (عەلی عەبدوڵڵا)ش هەم ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، هەم پارێزگاری سلێمانیش بوو، بەڕێوەبەرەکەم زۆری پێ ناخۆش بوو کە من بەبێ پرسی ئەو، بەبێ ئەوەی پارتی ئاگادار بکەمەوە، لە پشتی ئەوەوە چووم بۆ لای کاک ئیدریس.

ئەم جۆرە لێپرسینەوەیە لە کاری حزبیدا هەبوو، بەڵام ئیتر بەڕێوەبەر ئەمەی کرد بە بیانوو، بەڕادەیەک، من دەرفەتم بۆ نەمایەوەو هاتمە سەر ئەو خەیاڵەی هەر بەجارێ واز لە ئیشەکە بهێنم.

### ٢- پیرۆزبایی لە بارزانی.

وەک وتم لەسەر ئەو سەردانەی کە چووم بۆ لای کاک ئیدریس، لەلایەن بەڕێوەبەرەوە سەرزەنشت کرام و

ئەوەندەی تر ڕقی لێهەڵگرتم، بەڵام ئەمجارەیان سەردانێک بۆ لای بارزانی لە سەرزەنشت زیاتری لێکەوتەوەو بگرە تاوانیشم خرایە پاڵ.

من و حەمەسدیقی پارێزەرو ئەکرەمی عیزەت نەجیب و شێخ حەسەنی قادرکەرەم بۆ پشتیوانی و پیرۆزبایی لە بەیانی یانزەی ئازار، ویستمان سەردانی بارزانی بکەین و پرس و ڕاشی لەگەڵ بکەین بۆ هێندێک کاروباری تر.

ئێمە لە (چۆمان) بووین، لەوێ هەندێک لە ئاغاکانی پێنجوێنیشم بینی، کە دیاربوو هەر بۆ سەردانی بارزانی هاتبوون. لەو بەینەدا ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاین، ئەوە بوو، هێندێک وەک بڵێی چاودێریی ئێمەیان دەکرد، لەبیرمە دەمەو ئێوارە بوو، دەچووین بۆ دوکانێک بۆئەوەی فڵچەو دەرمانی ددان شتێ بکڕین، شێخ حەسەن کە پیاوێکی دنیادیدە بوو، وتی: "ئاگادارم کەسانێک بەدوامانەوەن"، لەڕاستیدا نەمانزانی ئەوانە مەبەستیان چییە، بەڵام لام وابوو لەو دەمەدا دەرکەوتنی شیوعی لە نزیک بارەگای بارزانی هەستەوەرییەکی هەبوو، پەیوەندی بە ئێرانەوە هەبوو.

بەهەرحاڵ ئەو ئێوارەیە (شەکیب عەقراوی) هات بۆ لامان و بۆ سبەینێ چووینە لای بارزانی لە (حاجی هۆمەران).

خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ دیداری بارزانی و مەجلیسەکە گەورە بوو، ئێمە هەرچوارمان لە ڕیزێکدا دانیشتبووین، بارزانیش لە سەرووتر بوو، وا باوبوو بارزانی لە تەنیشت خۆیەوە جێگای کەسێکی بە چۆڵی بەجێدەهێشت بۆئەوەی کە میوان ویستی شتی تایبەتی لەگەڵدا باس بکات، لەو جێیەدا دابنیشێت. کوڕێک هات وتی: "بایەکێکتان بچێتە خزمەتی".

بارزانی شێخ حەسەنی باش دەناسی و لە بارودۆخی جیاجیادا بینیبووی، لەبەرئەوەی نوێنەری حزبی شیوعی ببوو، من و شێخ حەسەن هەستاین و چووینە لای بارزانییەوە دانیشتین.

ئێمە لەوەوپێش ڕێکەوتبووین کە حەسەن بەناوی هەرچوارمانەوە قسە بکات، مەبەستیش لە سەردانەکە، جگە لە پیرۆزباییکردنی بەیانی ئازارەکە، ئەوە وەک دەستکەوتێکی مێژوویی بوو لەو کاتەدا، ئەوە بوو کە حزبی بەعس بە شێخ حەسەن و ئەکرەمیان وتبوو: "ئەوان دەیانەوێت کەسانی نیشتمانپەروەرو سەربەخۆو خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی و ناسراو ببنە ئەندامی مەجلیسی وەتەنی و مەجلیسی تەشریعی".

بارزانی لە وەڵامی ئەمەدا وتی: "من ئێوە دەناسم، لە

منەوە سەرپشک بن، ئەوان هەر خەڵک دادەنێن، ئێوەبن باشترە"، بەڵام وتی: "دوای من سەرێک لە کاک ئیدریس بدەن".

شێخ حەسەن سەبارەت بەمە، پرس و ڕای لەگەڵ بارزانی کردبوو، بارزانیش لاریی نەببوو، وتبووی: "بێگومان لەجیاتی کەسانی تر ئێوەمانان کە شیوعی بوون و مێژوویەکتان هەیەو نیشتمانپەروەرن، لەو شوێنانەدابن باشترە". بە کوردییەکەی بارزانی گڵۆپی سەوزی بۆ هەڵکردین، کە ئەگەر بمانەوێت بەشداریی لە مەجلیسی وەتەنی و تەشریعی و ئەو دەستەو دامەزراوە هاوجۆرانەدا بکەین.

دوای بینینی بارزانی هاتینەوە چۆمان، هاوڕێکانمان پەلەی گەڕانەوەیان بوو، زوو ڕۆیشتن و من و ئەکرەم ماینەوە، ئەکرەم وتی: "حەز دەکەم وەکو هاتووین دکتۆر مەحمودو شێخ محەمەدی هەرسین ببینین". ئەوکاتە ئەوان ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوون، ئیتر ئەو شەوەش ماینەوە.

ناوچەکە ئەوەندە قەرەباڵغ بوو، شوێنمان دەست نەکەوت، شەو لە چایخانەیەک نووستین و بەیانی سەردانەکانمان تەواو کردو گەڕاینەوە بۆ هەولێرو شەو لە ئوتێل ماینەوە، بەیانی کە لە خەو هەستاین وتیان: "کۆمەڵێک مەلا خۆیان

تەقاندۆتەوە، ویستوویانە بارزانی تیرۆر بکەن".

ئەم سەردانەمان بۆ لای پارتی، هەروا بەئاسانی تێنەپەڕی، چونکە لیژنەی مەرکەزیی حزبی شیوعی و قیادەی مەرکەزیش کە دوای وازهێنانی ئێمە بۆ جەماعەتی (نەجم) تەخت ببوو، کەوتنە بەیان دەرکردن لەسەرمان و وتیان: "ئەمانە حزبی شیوعییان تێکداو جیابوونەوەو دواییش خیانەتیان لە قیادە مەرکەزیی کردو ئێستاش بوون بە پیاوی پاراستن و نۆکەری مەلا مستەفا".

٣- هەوڵی تیرۆرکردنم.

لە هەولێرەوە گەڕامەوە بۆ سلێمانی، بێگومان فەرەجی بەڕێوەبەرم ئەمجارەش سەرزەنشتی کردم و وتی: "کاکە کە تۆ دەوامت پێ ناکرێت و ئەوەندە سەرکێشی، هەر بەجارێ واز لە کارەکە بێنە باشترە". وتم: "دواموچەم وەردەگرم و ئیتر وازدەهێنم".

بەیانییەک تاریک و ڕوون دەچووم بۆ سەر کارەکەم، چونکە وەک وتم، لەو ماوەیەدا ببووم بە (جابی)، دەبوو زۆر زوو بچمە ناو پاسەوە، لەسەر شەقامی ئۆرزدییەوە بەرەو خوار دادەگەڕام، لە دوکانی مستەفای خەیات ڕەت بووم، چوار کەس کە دەموچاویان هەڵبەستبوو، دوان لە

پێش و دوانیش لە دوامەوە، دایانمە بەر فیشەکی دەمانچە، گەرماوگەرم بوو نەمدەزانی چەند گوللەم پێوەیە، بەڵام ئەوەندەمزانی کە خەڵتانی خوێن بووم، بە هەزار حاڵ خۆم گەیاندە شەقامی (پیرەمێرد)، کە دەرگایەکی سەرای سلێمانی لەسەر ئەو شەقامەیەو خۆم کرد بە سەرادا، پۆلیس بەرەوپیرم هاتن و خرۆشان وتیان: "تەقە بووە"، وتم: "تەقە لە من کراوەو بمگەیەننە نەخۆشخانە". چاوم ڕەشکەو پێشکەی دەکرد، ئەفسەرێک هات و لەگەڵ دوو پۆلیسدا خستمیانە پشتی موسەلەحەیەکەوەو فڕاندمیان بۆ نەخۆشخانە.

ئەو بەیانییە لە بەختانی من دکتۆر (ئەسفەندیار)ی کوڕی (ئەحمەد شوکری) شاعیر ئێشککگری شەو بوو، هات بە فریامەوە. لەگەڵ دکتۆردا ئاشنایەتیم هەبوو، بۆیە زۆر بە تەنگمەوە هات و وتی: "خێرا دەبێت عەمەلیاتت بۆ بکەین". پێویستیان بە خوێن بوو، وتم: "براو کەسوکارم لێرەیە، بەڵام هەر پێنجوێنییەکتان بینی داوای خوێن بکەن دەتانداتێ"، لەو بەینەدا خەریک بوو لە خۆم ئەچووم، حەمە سدیقی پارێزەر گەیشتە سەرم و چرپاندی بە گوێمدا، وتی: "کێ تەقەی لێکردوویت"؟ وتم: "خۆت دەزانیت"!

دوای ئـەوە، من لەهۆش خـۆم چـووم، کاتێک بەئاگا هـاتمـەوە عەمەلیاتیان بـۆ کـردبـووم و چـوار گوللەیان لـە جەستەم دەرهـێنـابـوو، سـەرم هەڵبڕی چـواردەورم کەسوکارو خزمانی پێنجوێنی بوون لە دەورم.

پاشان بۆ ڕۆژی دوایی ئەفسـەرو پۆلیس و لێکۆڵەرەوەی دادگا هاتن بۆلام، باسی چۆنێتی ڕووداوەکەیان لێکردم و کە داخۆ من کێ تاوانبار دەکەم و مەبەست لە کوشتنم چی بووە؟ پێم وتن: "من کەسێکم هیچ کێشەیەکی کۆمەڵایەتیم نییەو دوژمندار نیم، بەڵام ڕووداوەکە سیاسییە". بێگومان ئـەوان منیان نـاسییـەوەو وتـیشـم: "ئـەوانـەی تەقەیان لێکردووم، ناتوانم کەسیان بناسمەوە، چونکە دەموچاویان هەڵپێچابوو".

بێگومان ئەودەمە پارتی باڵادەست بوو، بۆیە پۆلیس و دەزگـا فەرمییەکان کە منیان دەناسی، زۆر لەسەری نەڕۆیشتن، دەیانزانی ئەمە بەهۆی جیابوونەوەو ململانێ ناوخۆییەکانی حزبی شیوعییەوە بووە.

لە لیژنەی مەرکەزیی حزبی شیوعی جەلال دەباغ هاتە لام و وتی: "ڕاستە ئێمە ململانێمان هەبووە، بەڵام دەمانەوێت دڵنیات بکەین کە بەهیچ جۆرێک ئەم کارە دەستی ئێمەی تێدا نەبووەو نابێت گومانی ئەوە بکەیت ئێمە تەقە لە کەسێکی

وەک تۆ بکەین، کە ڕۆژانێکی درێژ هاوسەنگەرمان بوویت".
مایەوە ئەوانەی کە ئەوەدەمە خۆیان بە قیادەی مەرکەزی دەزانی و هەر لە کۆنیشەوە لە من و هاوڕێکانم پەست بوون و ئێمەش هەر زوو دەمانزانی ئەوانن کە بە خوێنی سەرمان تینوون، پەنجەی تاوانیان بۆ درێژبکرێت.

ڕووداوی لەوە ناخۆشتر لەو ڕۆژگارەدا، کە ئازاری برینەکانی خۆمی بیربردمەوە، تاوانێکی ترسنۆکانە بوو کە ئەوەشیان مۆری ئەو دەستەیەی پێوەبوو کە باسم کردن.

بێگومان دوای عەمەلیاتەکەم لە نەخۆشخانە دۆست و هاوڕێکان لێم کۆبوونەوەو (جەلالی ڕابیعە)، کە هاوڕێیەکی شیوعی کرێکارو بەرپرسی کارگەی جگەرە بوو، دانرابوو بە خۆی و دەمانچەیەکەوە، بۆئەوەی پاسەوانی من بکات، شەو و ڕۆژ جەلال وەکو برا بەسەرمەوە بوو، لێم دوور نەدەکەوتەوە، مەگەر ئەوکاتانە نەبێت کە بۆ پێداویستییەک دووربکەوێتەوە.

جەلال زۆر بە منەوە ماندوو ببوو، شەو و ڕۆژ ئێشکگر بوو، لە نەخۆشخانە بەیانییەک زوو، لەبەرئەوەی شەو نەنووستبوو، چووەوە بۆ ماڵەوە سەرخەوێک بشکێنێت، نامەردانە زەفەریان پێهێنابوو، تەقەیان لێکردبوو و کوشتیان.

ئیتر من خەریک بوو برینەکانم سارێژ دەبوو، ئەوەی باش بوو لەو چوار فیشەکەی پیانەوە نابووم، هیچیان لە لەشما نەمابوونەوە، یەکێکیان لە گۆشەی ڕانمەوە چووبووە دەرێ و سێ گوللەکەی تریش یەکێکیان ڕیخۆڵەی بریندار کردبووم، بەڵام هەموویان لەمدیوەوە بۆ ئەودیو لە لەشم دەرچووبوون. دکتۆر ئەسفەندیار چارەسەری بۆ نووسیم و وتی: "ئیتر دەتوانیت لە نەخۆشخانە بچیتە دەرەوە".

٤- هاوکاری.

دوای نەخۆشخانە، ماوەیەک چوومەوە پێنجوێن، هەتا بەیەکجاریی برینم سارێژ بوو و چابوومەوە، پاشان چوومەوە بۆ سەر کارەکەم لە مەسڵەحە. خوا هەڵناگرێت فەرەجی بەڕێوەبەر هەڵوێستێکی جوانی هەبوو وتی: "دەتوانیت لە کارەکەت بەردەوام بیت"، وتیشی: "خۆت دەزانیت ئەوە هاوڕێکانی خۆت وایان لێکردیت".

ماوەیەک لە ماڵی حەمە مستەفای پارێزەردا بووم، لەو ماوەیەدا جگە لەو، ئەکرەمی ساڵحی ڕەشەو عەبدوڵڵا زەنگەنەو حەمەی حاجی ساڵحی حەمامچی و عەلی بۆسکانی و ئیسماعیلی حەڵواچی، کە ئەوان هەموو بارودۆخی ئابوورییان باش بوو، پیاوانە کۆمەکیان کردم

و لەڕووی داراییەوە پشتیان بەرنەدام، هەتا بارگەو بنەم پێچایەوەو ڕوومکردە بەغدا.

یادی بەخێربێت لە بەغدا غەفوری میرزا کەریمم بینییەوە، چونکە جەماعەت ئەویشیان لە سلێمانی دەرپەڕاندبوو، گوایە پەیوەندی بە میرییەوە هەیە!

لەڕاستیدا غەفور هەمیشە پیاوێکی ساغ و نیشتمانپەروەر بوو، بەڵام کاتی خۆی کە لە (نوگرە سەلمان) زیندان ببوو، دۆستایەتی لەگەڵ هێندێ لە بەعسییەکان پەیداکربوو، لەم ڕۆژگارەشدا ئەوان حوکمی ئێراقیان دەکرد.

غەفور وتی: "بەتەمای چیت لە بەغدا". وتم: "خۆت دەزانیت من شاعیرم و دەستی نووسینم هەیە، ئەگەر لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) کارێکم بۆ پەیدابکەیت خراپ نییە".

غەفور خۆی لە ڕۆژنامەی هاوکاری دەینووسی، زانی کە بارودۆخی گوزەرانم خراپەو ژن و منداڵیشم هەیە، پێنج دیناری دامێ، ئیتر بەهۆی ئەوەی هێندێک خزمی ژنەکەم لە بەغدا بوون، بە هەر حاڵێک بێت خۆمان دامەزراند.

ئەوکاتە (حیلمی عەلی شەریف) سەرەوکاری ڕۆژنامەی هاوکاری دەکرد، غەفور پیاوانە بردمی بۆ لای حیلمی و ئەویش زۆر ڕێزی لێگرتم و ڕێکەوتین کە لە هاوکاری دەست بکەم بە نووسین.

لە ڕۆژنامەکە سیستمێکیان هەبوو، لە بەرامبەر هەر پارچە نووسینێکدا پارەیەکیان بۆ نووسەرەکەی تەرخان دەکرد، منیان بەوشێوەیە دامەزراند.

ئەوکاتە تازە باس و خواسی خۆماڵیکردنی نەوت لەئارادا بوو، یەک دوو وتارم لەو بارەیەوە نووسی و حیلمی زۆر بەدڵی بوو، ئیتر وردە وردە نووسینم بڵاو دەکردەوەو بە پارەی ئەو نووسینانەش ئاهێکم بە بەردا هاتەوە.

خوا هەڵناگرێت حیلمی زۆر خاتری منی دەویست، ئەگەر هەر هیچ نووسینێکیش نەبووایە دەیوت: "شیعرێک بنووسە، بۆئەوەی شتێکت بۆ حساب بکەم". لە بەرامبەر هەر نووسینێکدا دە دیناری بۆ خەرج دەکردم.

خەریک بوو دەبووژامەوە لە گەڕەکی (ئەعزەمیە)ی بەغدا خانوویەکم بە کرێ گرت، ماڵ و منداڵم گواستەوە ناوی، کەلوپەل و جل و پێویستیمان کڕی و یەک دوو جارێکیش بۆ دڵنیایی سەردانی پزیشکم کردو بە تەواوی برینەکانیشم سارێژ ببوون.

لەو ماوەیەدا لە گۆشەنیگای چەپێکی پێشکەوتووخوازەوە، لە ڕۆژنامەی هاوکاری چەندین وتارو بابەتم نووسی، یادی بەخێر (شەهید ئارام) ئەو دەمە ئەویش لەوێ دەینووسی، زۆرکات وا ڕێدەکەوت لەسەر یەک مێز دادەنیشتین، ئارام لەسەر ئەزموونی

(چین و ڤێتنام) دەینووسی، منیش لەسەر خەتی سێیەم و بزووتنەوە چەپەکانی (کوباو ئەمریکای لاتینی).

ئارام بایەخی بە ئەزموونی ڤێتنام و چین دەدا، لەو ڕوانگەیەوە کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی نزیکە لە کۆمەڵگای کوردییەوە، کە هێشتا کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵییە، هەرچی حیلمی عەلی شەریف بوو سەرسام بوو بە ئەزموونی (کۆری)و تەنانەت دەیوت: "کورد دەبێت حزبێکی هاوشێوەی ئەوەی ئەوان دابمەزرێنێت".

ئەوکاتە باو باوی چەپ بوو، ئیتر ئەم جۆرە بۆچوونانە لەئارادا بوون و تەوەری سەرەکی گفتوگۆ فکرییەکان ئەم بابەتانە بوون، من خۆم تەنانەت لە شیعرو نووسینە ئەدەبییەکانی ئەو سەردەمەشدا، کاریگەریی ئەزموون و ئەدەبی ئەمریکای لاتینیم لەسەر بوو.

(بابەکر پشدەری) پارێزگاری سلێمانی بوو، جارجارە سەردانی حیلمی عەلی شەریفی دەکرد، من لەوێ بابەکرم ناسی، پاش ماوەیەک بابەکر هاتەوە، وتی: "کاکە من ئیشم پێتەو داوای کەسانی مارکسی و پێشکەوتووخوازی بێلایەن و نیشتمانپەروەریان کردووە، بۆئەوەی ببن بە ئەندامی مەجلیسی تەشریعی، منیش ناوی تۆو حەمەسدیقی پارێزەرو حەمەی مستەفام پێشنیار کردووە".

لە ئەعزەمییەوە ماڵم گواستبووەوە بۆ گەڕەکی (ئەلقاهیرە)، ئەگەرچی گەڕەکەکە تۆزێک میللی بوو، بەڵام هێندێک خانووی تیابوو چوار پێنج هۆدەیەک بوو.

ڕۆژێکیان لورەلوری ئۆتۆمبێلی پۆلیس و چەند ئۆتۆمبێلێکی تر گەڕەکیان خرۆشاندو لەبەر ماڵی ئێمەدا بوو بە ڕۆمەڵغەزا، چوومە دەرەوە بینیم بابەکر پشدەرییە، وتی: "کاکە ئێمە ژێر ئەرزت بۆ دەگەڕێین وا لەسەر ئەرز دۆزیمانیتەوە". وتم: "خێر"، وتی: مەسەلەی مەجلیسی تەشریعی بووە بە ڕاست و بەیانی لە "مەجلیسی وەتەنی ئێراق مەوعیدمان هەیە".

من کە ئەمەم بیست، تۆزێک هەڵوێستەیەکم کرد، پێشوەخت لە سەردانەکەماندا بۆ لای بارزانی ڕێگەی ئەمەی پێدابووین و چرای سەوزیشی بۆ هەڵکردبووین، بەڵام بۆ دڵنیابوونی زیاترو بۆئەوەی تۆمەتم پێوە نەلکێنن، پێم باش بوو سەردانێکی (عەزیز محەمەد)یش بکەم، کە ئەوکاتە سکرتێری (حزبی شیوعی ئێراق) بوو.

ئەو دەمە حزبی شیوعی لەبەرەی نیشتمانیدا بوون، لەگەڵ (بەعس) هاوپەیمان بوون و بارەگایان لە بەغدا بوو، لە ڕێگەی (ساڵح حەیدەر)یەوە دیدارەکەم بۆ ڕێکخرا، کە چووم بۆ لای کاک عەزیز، (کەریم ئەحمەدو جەلال دەباغ و

بەهادین نوری)ش لەوێ بوون.

کەوتینە قسەو باس و وتم: "بۆ پرس و ڕا هاتووم سەبارەت بە مەسەلەی بوون بە ئەندم لە مەجلیسی تەشریعی".

عەزیز محەمەد وتی: "پرسیان بە ئێمەش کردووەو چەند کەسێکمان پێشنیاز کردووە، پێشمان باشە تۆ وەکو کەسێکی بێلایەن ببیتە ئەندام لەگەڵ برادەرانی ئێمەش هەماهەنگی بکەن و چی باشە ئەوە بکەن".

### ٥- چۆن بووم بە ئەندامی مەجلیسی تەشریعی؟

پێکهێنانی مەجلیسی تەشریعی بەشێک بوو لە جێبەجێکردنی بەیاننامەی (١١)ی ئازاری (١٩٧٠)، بەڵام دامەزراندنی ئەو دوو ئەنجوومەنە دواکەوتبوو، ساڵی (١٩٧٤)یش شۆڕش هەڵگیرسایەوە، بۆیە پارتی نوێنەری نەبوو.

حزبی شیوعی سیانزە ئەندامیان هەبوو لەوانەی بیرم بێت (ئەحمەد دڵزاری شاعیر، شێروان عەلی ئەمین، ئەحمەد حامی نووسەر، ئیبراهیم سۆفی (ئەبو تارا)، ئەبو حیکمەت ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی ئێراق)، کەسانی بێلایەنی وەکو ئێمەومانانیشی تێدابوو، کە سەر بە هیچ

لایەنێک نەبوون.

ئەمە یەکەمین خولی مەجلیسی تەشریعی بوو لەدوای بەیاننامەی یانزەی ئازار، بۆیە دانانی ئەنجومەنەکە ئەمجارە بە هەڵبژاردن نەبوو، ئەندامەکان لەلایەن دەوڵەتەوە دەستنیشان دەکران. ئیتر ئەوە بوو چووینە مەجلیسی وەتەنی، بۆئەوەی بزانین ئایا کێ دەبێتە ئەندام و کێ نابێت.

سێ کەس لە ئوفیسی تایبەتی (سەدام حسێن) دیاری کرابوون بۆ ئەوەی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە خۆیان بەربژێر کردووە، ئەوانەش هەریەکە لە (هاشم ئەلحدیسی و خالید ئەلکوبەیسی و غانم عەبدولجەلیل) بوون، ئەمانە چەند پرسیارێکیان لێدەکردین و دیاربوو خەڵکیشیان هەڵدەسەنگاندو دواتریش ئەم چاوپێکەوتنە بۆ یەکترناسین بوو، پاشان ناوەکانیان خوێندەوە، ناوی منی تێدا بوو.

سەیر لەوەدا بوو ئەوانەی ناویان نەخوێندرایەوەو قبوڵنەکرابوون، بکرێن بە ئەندامی مەجلیس، هەر لەوێدا کەوتنە دروشم لێدان و تۆمەت بەخشینەوە، یەکسەر تاوانباریان کردین بەوەی کە جاش و خۆفرۆشین، لەکاتێکدا ئەگەر ناوی خۆیانی تێدا بووایە بێگومان ئەم قسانەیان نەدەکرد.

جا لێرەدا با شتێک بڵێم، بۆ ئەوە نا بەرگریی لە خۆم بکەم و پەرێزی خۆم پاک بکەمەوە، چونکە وەک لەمەوبەر باسم کرد، ئەگەر جەنابی مەلا مستەفاو دواییش عەزیز محەمەد ڕازی نەبوونایە، من قەت خۆم لە قەرەی ئەو کارە نەدەدا.

شتێکی تریش کە هاندەر بوو، ئەوەبوو خەڵکی زۆرباش و نیشتمانپەروەر، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە بەعسەوە نەبوو، ببوونە ئەندامی مەجلیسەکە، لەوانە: (شاکیر فەتاح، عەلائەدین سەجادی، موسا سەمەد، شێخ کاوەی شێخ لەتیف، زەکی عەمادی، سامیە شاکر، محەمەد حەوێز، خەتیب شێخ محەمەد قەرەداغی... هتد)

ئیتر دەبوو ماڵم بهێنمەوە هەولێر، بەوپێیەی ئەندامی مەجلیسی تەشریعیم و بارەگای مەجلیسەکەش لە هەولێرە.

ئەوسا (مەلا ئەحمەد بانیخێڵانی) بەرپرسی حزبی شیوعی بوو، لە هەولێر سەردانێکی ئەوم کردو زۆر دۆستانە پێشوازیی لێکردم و بە سوعبەتیشەوە، وتی: "ها هاوڕێ ئاخری هاتیتەوە بۆ لای خۆمان". مەبەستی ئەوەبوو کە وازم لە قیادەی مەرکەزیی هێناوە.

لەبیرمە یەکەمین کۆبوونەوەی مەجلیسی تەشریعی لە

قوتابخانەیەکدا کرا بەرامبەر ئەم بینایەی ئێستای (پەرلەمانی کوردستان)، کە کاتی خۆی لە سەردەمی بەعسدا بۆ مەجلیسی تەشریعی دروستکرا.

قوتابخانەیەکی دواناوەندیی هەبوو، یەکەمین کۆبوونەوە لەوێ کرا، دوایی پاش چەند ساڵێک ڕووسەکان بینای مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزییان دروستکرد، کە ئێستا جێگای حکومەت و پەرلەمانی هەرێمی کوردستانە، بەڵام لە قوتابخانەکەشدا کارەکان بە ڕێکوپێکی دەچوون بەڕێوەو وەکو پەرلەمانێک وابوو، هەرکەس و لیژنەیەک شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو.

لە یەکەمین کۆبوونەوەی مەجلیسەکەدا (بابەکر پشدەری) بوو بە سەرۆک و (ئیحسان هەیبەتوڵا موفتی)، کە حاکمێکی خەڵکی (ئاکرێ) بوو، بووە جێگرو (ئیسماعیل ڕەسوڵ)یش بوو بە سکرتێری ئەنجومەنەکە.

دوای چەند کۆبوونەوەیەک، لیژنە تایبەتمەندەکان دیاریکران و من بووم بە سەرۆکی لیژنەی ڕۆشنبیریی و لاوان، دواتریش ناوی (ئەمین عامەکان) هێنرایە مەجلیس و لەوێ دەنگی لەسەر درا.

دووانزە ئەمانەی عامە هەبوو، کە هەریەکەیان بە پلەی وەزیر بوون. بێگومان ئەو قۆناغەی لە ڕۆژنامەی

(هاوکاری) دەمنووسی، بۆ من قۆناغێکی گرنگ بوو، بۆیە دەبوو بە وتارێک ماڵئاوایی بکەم، پێش ئەوەی ببمە ئەندامی مەجلیسی تەشریعی.

## ٦- هەڵگیرسانەوەی شۆڕش.

هەر ئەو ساڵەی مەجلیسی تەشریعی دانرا، جارێکی تریش شەڕ هەڵگیرسایەوەو شۆڕش بەرپابوو.

ئاگادار کراینەوە کە (سەدام حسێن) لە بینای (مەجلیسی وەتەنی) لە بەغدا کۆبوونەوەیەکی گەورە دەکات. جگە لە ئەندامانی مەجلیسی تەشریعی و مەجلیسی تەنفیزیی و ئەمین عام و وەزیرەکان، چەند کەسایەتییەکی کوردیش بانگکرابوون، لەنێوانیاندا زاتی وەکو: (مەسعود محەمەد، کەمال مەزهەر، فوئاد عارف و ئەحمەد زرنگ)و کەسانی تر.

سەدام لەو کۆبوونەوەیەدا هێرشی تووندی کردە سەر شۆڕشی کوردو سەرکردایەتییەکەی و وتی: "ئێمە بەیاننامەی یانزەی ئازارمان ڕاگەیاندووەو مافی کوردمان زامنکردووە لە ئێراقدا، بەڵام ئەوانە دەستیان لەگەڵ بێگانە تێکەڵاو کردووەو بە پشتیوانی ئێران و ئەمریکاو ئیسرائیل لە پشتەوە خەنجەری ژەهراویی لە ئێراق دەوەشێنن". شتەکانی بەستەوە بە بارودۆخی نێودەوڵەتی و ململانێی

بلۆکی خۆرئاواو سۆڤیەتەوەو قسەی زۆری کردو هێرشێکی توونديشی کردە سەر مەلا مستەفا.

ئەودەمە (عوبێدوڵلای کوڕی مەلا مستەفا) وەزیر بوو، خۆی لە دانیشتنەکەدا ئامادە بوو، هەستایە سەر پێ و جوامێرانە وەلامی سەدام حسێنی دایەوەو بەرگریی لە بارزانی کرد، کۆبوونەوەکە تێکچوو.

سەدام کۆبوونەوەکەی جێهێشت و ڕێستێک بۆ قاوە خواردنەوە وەرگیرا، دوایی دەبوو (نەعیم حەداد) قسە بکات.

من و کاوەی شێخ لەتیف گفتوگۆمان دەکرد، عوبەیدوڵلا هات، کاوە پێی ناساندم، ئەو زۆر توڕە بوو لەسەر ئەوەی باسی مەلا مستەفا بە خراپی کراوەو جنێویشی بە سەدام حسێن دا، وتی: "ئەمانە درۆزنن و خەڵک تەفرە دەدەن".

عوبەیدوڵلا لەگەڵ کاوە قسەی کردو وتی: "لە چ ئوتێلێکن؟"، دیاربوو ژمارەی کاوەی لابوو، وتی: "بەیانی قسە دەکەین و پێکەوە نان دەخۆین". دوایی زانیمان دەزگای ئەمنی بەعس لە پارێزدا بوون بۆی، لەسەر ئەو هەڵوێستەی بەرامبەر سەدام، هەرکە لە کۆبوونەوەکە چۆتە دەرەوە، فڕاندوویانەو سەرونگومیان کردووەو شەهیدیان کردووە.

ئیتر دوای ئەوە لوقمان و سابیریش کە هەردووکیان کوڕی مەلا مستەفا بوون، شەهیدکران و هەموو بارزانییەکانیش کەوتنە بەر ئاگری شۆڤێنییەتی بەعس.

با بەسوێی یادی قڕکردنی (بارزانییەکان)ەوە باسی ئەوە بکەم کە من چۆن لە دوو شیعرمدا بە ناویشانی (من عاشقم)و (هەپی پێرزدەی تویو) کۆتەڵی خۆم بە وشە هۆنیوەتەوەو چۆنیش ئەو شیعرانە کە لەکاتی خۆیدا بڵاوکراونەتەوە، بوون بە وێردی سەر زمانی کچان و کوڕانی شۆڕشگێڕی کوردستان.

پاش دەیان ساڵ کە ئاوارەی هاندەران بووم لەنێوان سنووری هۆڵەنداو ئەڵمانیادا، کوڕێکی بادینی باوەشی پیاکردم و وتی: "مامۆستا کاتی خۆی من لە زانکۆ ئەو شیعرانەی تۆ بۆ بارزانییەکانت نووسیبوو، کردم بە شانۆیی، لەسەر ئەوە گرتیانم و پانزە ساڵ حوکمی زیندانیان دام، پاش چەند ساڵێک کەوتمە بەر بڕیاری لێخۆشبوونی گشتی و مەرەخەس کرام، مامۆستا لەژێر ئەشکەنجەدا دەموت: "باشە شاعیرەکە شیعرەکەی نووسیوە، ئازادە، بۆچی من زیندانی دەکەن کە شیعرەکەیم کردووە بە شانۆیی؟ دەیانوت: شاعیر شێتە، چی وتووە با بیڵێت، تۆ بۆ ئاوها کردووتە بە شانۆیی"، ئەو کوڕە بە هەزار حاڵ لێم بووەوە،

ئەگەرچی کە دەبوو من داوای لێبووردن لەو بکەم، کە بەهۆی شیعری منەوە ئازاری چەشتووە.

خولی یەکەم کە وەک وتم، بە دانان بوو، بەڵام خولی دووەم بە هەڵبژاردن بوو، بۆ خولی دووەمیش خۆم هەڵبژاردو دەرچووم و هەشت ساڵ ئەندامی مەجلیسی تەشریعی بووم، یاسای مەجلیشی تەشریعی وابوو، هەرکەس کە دەبوو بە ئەندام لە هەر وەزیفەیەکی میریدا بێت، لە وەزیفەکەی خۆیدا دەمێنێتەوە. واتا دەکرا لە وەزیفەی حکومیشدا بیت و ئەندامی مەجلیسی تەشریعیش بیت.

بێگومان ناتوانم بڵێم بەعس ڕاستگۆ بوو لەوەدا مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزی وەک نوێنەرایەتی کورد کاری خۆی بکات، بەڵام بەگشتی لە هەردوو ئەو خولەدا کە من ئەندام بووم لە پەنای بەعسدا، ئێمە کاری گرنگمان کرد. با هەندێکیان باس بکەم:

لەو ماوەیەدا ئێمە بەسەر شارەکاندا دەگەڕاین، لە پارێزگارو قایمقام و مودیر ناحیەکانمان دەپێچایەوە، ئەگەرچی پارێزگار سەرۆک کۆمار دایدەنا، بەڵام ئێمە مافمان هەبوو خەڵک پێشنیار بکەین و مافی لێپێچینەوەشمان هەبوو.

لەسەر ڕاپۆرتی خەڵک پارێزگاری سلێمانی و هەولێرو

دهۆکمان بانگ دەکرد بۆ مەجلیسەکە، وەکو پەرلەمانێک ڕەخنەمان لێدەگرتن و لەسەر داوای خەڵک لێپرسینەوەمان لێدەکردن. بەڕێوەبەری ئەمنی شارەکانمان دەگۆڕی، لەبەرئەوەی بەشێوەی ناشیاو لەگەڵ خەڵکدا جوڵاونەتەوە.

با تێبینییەک بنووسم:

دەزانم مێژوو ڕەحم بە کەس ناکات، ڕەنگە خەڵک لەو سەردەمەدا من و کەسی تریان بە خائین و نیشتمانفرۆش لەقەڵەمدابێت، بەڵام وا نەبوو ئێمە لەوێدا ملمان لە چەقۆ دەسوو و خەباتمان دەکرد.

وشەی کوردیمان پاراست، قەڵغانی زمان بووین و پەرەمان بە کلتوورو فەرهەنگ دا. شەقاممان ڕاخست و قوتابخانەو شانۆو نەخۆشخانەمان دروستکرد، ئینجا لەناوجەرگەی دوژمندا تۆزێک کوردبوونمان هێشتەوەو وەکو خۆشم ئەوەی لەدەستم هات، بە نهێنی و لەژێر پەردەوە بۆ شۆڕشم کرد.

ئێمە خۆمان ویژدانمان ئاسودە نەبوو کە خەڵک لە بەرەی شۆڕشدا بوو، ئێمەشیان بە پیاوی ڕژێم دەزانی، بەڵام ئێستا دەزانین کە قوتابخانەو نەخۆشخانەو شانۆمان دروستکرد، شەقاممان ڕاکێشا، گوڤارو ڕۆژنامەی کوردیمان دەرکردو پەرەمان بە فەرهەنگ و کلتووری کوردی داو لەسەر ئەرز

شتمان بوونیات ناو نەمانهێشت زمانی خوێندنی کوردی بپووکێتەوەو زمانی عەرەبی شوێنی بگرێتەوە، کاری باشمان بۆ میللەتی خۆمان کرد. ئیتر چیمان پێدەڵێن با بیڵێن.

ئێمە مەڕ بووین لە پێستی گورگدا، بەڵام خەڵکی تر هەبوون دەرکەوت گورگ بوون، لە پێستی مەڕدا بوون!

## ٧- چۆن بووم بە ئەندامی پەرلەمانی ئێراق.

دوو سێ مانگێکم مابوو هەشت ساڵی ئەندامێتی مەجلیسی تەشریعی بەڕێ بکەم، بەندو باوی هەڵبژاردنی مەجلیسی وەتەنی ئێراق هاتەئارا.

لەو دەمەدا بەپێی یاسای ئێراقی نەدەبوو لە دوو ئەنجومەندا ئەندام بیت، بۆیە من هێشتا ئەندامی مەجلیسی تەشریعی بووم و خۆم هەڵبژارد بۆ ئەندامێتی مەجلیسی وەتەنی.

دەبوو من لە پارێزگای سلێمانی خۆم هەڵبژێرم، پارێزگای سلێمانیش کرابوو بە سێ ناوچەی هەڵبژاردنەوە.

یەکەم: سلێمانی و دەوربەری بە قەرەداغیشەوە.

دووەم: چوارتاو پێنجوێن و دەربەندیخان و کەلار.

سێیەم: دوکان و ڕانیەو قەڵادزێ و چەمچەماڵ.

من لەبەرئەوەی پێنجوێنیم، دەبوو لە ناوچەی دووەم خۆم هەڵبژێرم.

پارێزگای سلێمانی یانزە کورسی هەبوو، کێبڕکێیەکی زۆریش لەنێوان نوێنەرەکاندا هەبوو، ئەوانەی خۆیان نامزەد کردبوو بۆ ئەندامێتی، زوربەیان لەو سەرۆک خێڵ و موستەشارو فەرمانبەرانە بوون کە پەیوەندییان لەگەڵ حزبی بەعسدا هەبوو.

لەناویاندا پیاوی ئاینی و خانەدان و کەسانی نیشتمانپەروەرو بێلایەنیش هەبوون، لەو دەمەدا ئەگەرچی حزبی بەعس خۆی پشتیوانی لە هێندێک دەکردو مەبەستی بوو ببنە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی، بەڵام سندووقی هەڵبژاردنیش حوکمی خۆی هەبوو.

بۆ نموونە من لەو ناوچەیەی خۆم هەڵبژارد سیودوو هەزار دەنگم هێناو بەعسیش پشتیوانم نەبوو، ڕەنگە هیچ پێشیان خۆش نەبووبێت کە ئەو هەموو دەنگەم هێناوە.

من باسی ساڵی (١٩٨٤) دەکەم، کە چوار ساڵە ئێراق لەگەڵ ئێراندا لە شەڕدایەو شۆڕشی کوردیش لە گوڕوتینی خۆیدایە. لەم ساڵەدا (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) لەگەڵ بەعسدا کەوتبوونە گفتوگۆوە، بۆیە بارودۆخی ئەم ناوچەیەی کوردستان تاڕادەیەک ئارام بوو، پەیوەندیکردنیش لەنێوان

پێشمەرگەو خەڵکدا، لەلایەن دامودەزگاکانی بەعسەوە تارادەیەک چاوپۆشیی لێدەکرا.

هەڵوێستی شۆڕشی کورد بەرامبەر بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی ئێراق ئەوەبوو، بایکۆتی بکەن و خەڵک بەشداریی پرۆسەی دەنگدان نەکەن، بەڵام لەبەرئەوەی میریی زۆری لە هاوڵاتییان دەکرد بەشداریی پرۆسەی دەنگدان بکەن، هێندێک لە بەرپرسەکانی شۆڕش کە قسەیان بۆ خەڵک و ڕێکخستنەکان کردبوو، وتبوویان: "ئەگەر هەر ناچاربوون بچن بۆ هەڵبژاردن، دەنگ بدەن بەو کەسانەی جاش و بەعسی نین".

لەڕاستیدا خەڵکی زۆر لە نیشتمانپەروەرو کۆنە شیوعی و خزم و ناسیاو دەنگیان بە من دا، بەڵام بەشێکی زۆری دەنگەکانم بەهۆی پشتیوانیی بەرپرسانی پێشمەرگەوە بوون، کە لای خەڵک قسەی خێریان بۆ کردبووم. لەوانەی کە دوایی بیستمەوە، بیرم مابێت هەریەکە لە کاک (مەلا بەختیار)و کاک (بەکری حاجی سەفەر)و کاک (مستەفا چاوڕەش)و کاک (جەمال جەلال)و زۆری تریش بوون. هەر ئەمەش لەدواییدا خەریکبوو سەرم بە فەتارەدا بدات.

بووم بە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی و هێشتا هیچ نەببوو، ڕاپۆرتیان لێدابووم و لیژنەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دروستکردم.

بەعسییەکان و سەرۆک جاشەکان لەوانەی کە دەنگیان نەهێنابوو، ڕاپۆرتیان دابوو بە دەزگا ئەمنییەکان، کە گوایە من نوێنەری (کۆمەڵەی ڕەجدەران)م و موخەڕبین پشتیوانییان کردووم، بۆیە دەنگی زۆرم هێناوە.

لە ئەنجومەنی نیشتمانی بۆ لێکۆڵینەوە لیژنەیەک پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی (مونزر ئەلشاوی)، کە سەرۆکی لیژنەی یاسایی ئەنجومەن و لەهەمان کاتیشدا وەزیری دادی ئێراق بوو.

ئەودەمە (نەعیم ئەلحەداد) سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی ئێراق بوو، مونزیر ئەلشاوی بانگی کردم بۆ ژوورەکەی نەعیم ئەلحەداد بۆ لێکۆڵینەوە. بیرمە کە بە دالانەکەدا هەنگاوەکانم هەڵدەنا بۆ ئەو ژوورە، وەکو ڕۆژی ڕووناک لێم دیاربوو، هێندە نابات بە هەنگاوی زۆر لەوانەی کە ئێستا دەینێم و خێراتر بەرەو ژووری سێدارە دەچم.

هەورامی خۆمان پەندێکیان هەیە دەڵێن: "دۆستی دایکت ئاقڵ بێت" باش بوو مونزیر ئەلشاوی پیاوێکی زۆر ئاقڵ بوو، زۆر ڕۆشنبیر بوو، لە فەڕەنسا خوێندبووی و ماوەیەکیش لە زانکۆی (سۆربۆن) مامۆستا ببوو.

ئەو لیژنەیەی بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ من دیاری کرابوون، شەش کەس بوون، هەموویان ئەندامی (مەجلیسی قیادە)

ی سەورە بوون. لەپێشدا (نەعیم ئەلحەداد) بانگی کردم بۆ سەرکردایەتی (قیادەی ئەلقەومی حزبی بەعس) نزیکەی نیو سەعاتێک بە گیرو گازی هێنام و وتی: "بەڵگەی خراپت لەسەرە".

وتم: "من کابرایەکی شاعیرو نووسەرم، پەیوەندی کۆمەڵایەتی باشم هەیەو جگەو لەوە سەربەخۆم و خەڵک دەزانن نیشتمانپەروەرم، ئەگینا وەکی تر نە کەس و نە هیچ لایەن و نە تەنانەت هیچ خێڵێکیشم لەپشتەوە نییە". دیاربوو کابرا باوەڕی پێکردم، وتی: "بەهەرحاڵ تۆ سەرۆکی لیژنەکەت مونزیر ئەلشاوییەو ئەو بڕیار لە چارەنووست دەدات".

خواو ڕاستان چارەنووسم کەوتە دەستی سەرۆکی لیژنەکەو پیاوە ئاقڵەکە، مەبەستم لە مونزیر ئەلشاویە.

ئەو لە لێکۆڵینەوەکەیدا بەڵگەی گرنگی بەدەستەوە بوو، وتی: "ئوستاز فایلەکەت قەبارەی گەورەیە، ئەوە قسەی فلانی و ئەوە شایەتی ئەوی تر کە بەشێکن لە شۆڕشی کورد، بەڵام من تۆم خۆش دەوێت دەزانم لەبەر ڕاستگۆیی خۆت تووشی ئەم گرفتە بوویت، دەزانم کەسانێک کە خەڵک متمانەیان پێ ناکەن و لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانیدا دەنگیان نەهێناوە، دەیانەوێت ملت بکەن بە پەتدا، دەزانم

ئەمە لەم وڵاتـەی ئێمەو لەناو حزب و شوێنی دیکەشدا هەیە، بۆیە من وەزیری دادم و ئەم بێدادییەم قبووڵ نییە، برۆ وەک شاعیرو ڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەر مەرەخەس بە".

کاری ڕاست بێت پیاوی ئاقڵ، ڕاپۆرتی دا بە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نیشتمانی و سەرۆکایەتی کۆمارو گەردنمی لە پەتی تەنگی سێدارە ئازاد کرد.

## ٨- لەگەڵ کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان.

لەناو بازاڕی پێنجوێندا (بەکری حاجی سەفەر) دوکانێکی مریشک فرۆشتنی هەبوو، (جەمال جـەلال)یش دوکانی پێویستی کارەبایی هەبوو، ناوبەناو سەردانم دەکردن، ئەوان هاوڕێی دێرین بوون و متمانەمان بە یەک هەبوو، دەشیانزانی من قیادە مەرکەزیی بووم و لایەنگری بیری چەپ و دادی کۆمەڵایەتیم، بۆیە جارجارە بیروبۆچوونی سیاسیمان ئاڵوگۆڕ دەکرد.

ئـــەوان هــەردووکـیــان لـە کـــادرە سـەرەتـایـیـەکـانـی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوون، بەکری حاجی سەفەر داوای پەیوەندیکردنی لێکردبووم، باسی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی بۆ کردم و نامەو بڵاوکراوەکانی بۆ هێنام و دەمخوێندەوە.

ڕۆژێکیان جەمال جەلال بانگی کردم بۆ دوکانەکەی خۆی و چامان خواردەوە، پاشان نووسراوێکی دامێ کە وەک لێکۆڵینەوەیەک وابوو، هەڵسەنگاندنی بۆ بارودۆخی سیاسی ئێراق و کوردستان بوو، ڕەخنەی لە پارتی و شیوعی و قیادەمەرکەزیی گرتبوو، لەدوایشدا باسی بایەخی دروستبوونی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان دەکردو وەک کۆمەڵەیەکی مارکسی لینینی و پێداگریی لەسەر ئەوەش دەکرد، کە دروستبوونی کۆمەڵە، پێداویستییەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییە.

کە نووسراوەکانی کۆمەڵەم خوێندەوە، سەیرم دەکرد لەگەڵ بیربۆچوونەکانمدا نزیکە، بۆیە هەر زوو پەسەندم کردو بووە جێگای بایەخم و بڕیاریشم دا کە بۆ سەرخستنی چیم لەدەستهات دریخی نەکەم، بەڵام بە بەکری حاجی سەفەرم وت: "کە جگە لە مام جەلال و کاک نەوشیروان، نابێت کەسی تر بەم پەیوەندییەی من بزانێت".

ڕۆژێکیان بەکری حاجی سەفەر هات بۆ لام، وتی: "لە هەڵەبجە کۆبوونەوەیەکمان هەیەو ناوێرم بڕۆم، چونکە لەلایەن پیاوانی ئەمنەوە چاودێریی دەکرێم".

بەکر جارێ نەچووبووە شاخ و کاری نهێنی دەکرد، ئەودەمە من بەڕێوەبەری (ناحیەی گرمک) بووم.

ئۆتۆمبێلێکی ڕانج ڕۆڤەری میریم پێبوو، کە ئەوسا تازە هاتبوو، پۆلیسێکیش یاوەرم بوو، بەکرم هەڵگرت و ڕۆیشتین بەرەو هەڵەبجە.

زۆربەی کات من خۆم ئۆتۆمبێلەکەم لێدەخوڕی و پۆلیسەکە لە پێشەوە لامەوە دادەنیشت، ئەمجارە پۆلیسەکە لێی دەخوڕی و من لە پێشەوە دانیشتبووم و بەکریش لە دواوە، کە گەیشتینە هەڵەبجەو لەبەردەم ئەو ماڵەی شوێنی کۆبوونەوەکە بوو، پۆلیسەکە خێرا دابەزی تا دەرگا بۆ من بکاتەوە، ئەوانەی لە ماڵەکەدا بوون بۆ کۆبوونەوە، کە پۆلیسەکەو بەکریان بینیبوو، هەریەکەو بەلایەکدا تێیان تەقاند، چاوم لێبوو بە سەربان و بنباندا ڕایان دەکردو ئەگلان بەسەر یەکدا، تومەس ئەوان واتێگەیشتوون، کە بەکر لەلایەن میرییەوە گیراوەو پۆلیسی هێناوە، بۆئەوەی ئەمانیش دەستگیر بکەن. تا بەکر هاواری لێ نەکردن، کە نەترسن و بگەڕێنەوە، تاقیان لەو ناوە نەمابوو، نەگەڕانەوە.

لەو دەمەدا بەکر سەرقاڵی کاروباری ڕێکخستن بوو، ئیتر هەموو جار بە ئۆتۆمبێلەکەی میریی دەمهێناو دەمبرد، بۆ سەیدسادق و سلێمانی و خەڵکی دەبینی و کۆبوونەوەی پێدەکردن، منیش هێندێک لە هاوڕێ شیوعییە کۆنەکان و گەنج و جووتیارو کەسانی باشم پێناساندن و ئەوانیش

بوون بە ئەندامی ڕێکخستن، جارێکیش بردم بۆ هەولێرو لەوێش چەند کەسێکم پێ ناساند.

بەکر پەیوەندی کرد بە شاخەوە، بەڵام پێش ئەوە وەستا (لالۆ پێنجوێنی) پێناساندم، ئەویش لە کادرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بوو، پیاوێکی تێکۆشەر بوو، بۆ ماوەیەکی درێژ زۆربەی کارە نهێنییەکانمان لەڕێگەی ئەوەوە ئەنجام دەدا، لالۆ پێنجوێنی لە دوای ڕاپەڕین، وەک پێشمەرگەیەکی نموونەیی خەڵاتی (بلە)ی وەرگرت.

جەمال جەلال هێشتا نەچووبووە شاخ، ڕۆژێک خزمێکی خۆی نارد بۆلام، وتی: "کوڕێکی پێنجوێنی گیراوە سەر بە ڕێکخستنەو جەمالیش لەترسا ڕایکردووە بۆ سلێمانی و لە گەڕەکی تووی مەلیک لە ماڵی خوشکەکەی خۆی شاردۆتەوەو داوای کردووە سەردانی بکەیت".

کە چوومە ئەوێ، جگە لە جەمال، (عەبدولی حەمەی سەعی)ش لەوێ بوو، ئەویش لە بنەماڵەیەکی ناوداری پێنجوێن و لە کادرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بوو.

جەمال وتی: "ئێمە لەلایەن ئەمنەوە ناسراوین و ناتوانین بمێنینەوە، دەبێت دەربازمان بکەیت بۆ دەرەوەو ببین بە پێشمەرگە".

«کوێخا قادری کۆڵێتان" لە شیوعییە کۆنەکان بوو،

پیاوێکی نیشتمانپەروەرو تێکۆشەر بوو، کاتی خۆی ئەویشم بە بەکری حاجی سەفەر ناساندبوو، ئاگادارم کردەوە کە کارێکی نهێنی هەیەو دەبێت چەند برادەرێک بەرین بۆ شاخ، کوێخا جوامێرانە لەخزمەتدا بوو.

جەمال و هاوڕێکەیم سواری ئۆتۆمبێل کردو یەک دوو فەرمانبەریشم لەگەڵ خۆمدا هێنا، گورزێک وێنەی سەدام حسێنیشم ئامادە کردبوو، جەمالم خستە پێشی ئۆتۆمبێلەکەوە، وتم: "گەیشتینە هەر بازگەیەک، دوو وێنەیان بدەرێ و دواییش کە چوویتە شاخ لای برادەران ئۆباڵی ئەم پرۆپاگەندەیەت بۆ سەدام حسێن بخەرە ئەستۆی من".

باش بوو وێنەکانی سەدام بوون بە چاوبەست و لە سەیدسادق و شانەدەری تێپەڕین و لە هیچ بازگەیەک داوای ناسنامەیان نەکرد، نزیک کۆڵێتان و چەوتان بووینەوە، دەمەو ئێوارە بوو، بە کاک عوسمانی شۆفێرم وت: "لە پێچێکدا ڕابوەستەو بۆنیتی ئۆتۆمبێلەکە هەڵبدەرەوە، خۆت سەرقاڵکە وەکو ئەوەی کێشەیەکمان هەبێت".

سەری هەموو بەرزاییەکان ئەوسا ڕەبایەی سوپای لێبوو، بۆیە بە جەمال و عەبدولم وت: "بە هێمنی دابەزن و لەناو دارو دەوەن و پێچ و لۆچی چیاکەدا خۆیان ون بکەن، هەتا دەگەنە شوێنی مەبەست".

بەیانییەکیان زوو زەنگی دەرگا لە خەو هەڵیساندم، کە کردمەوە کابرایەکی بەتەمەنی عەینەک لەچاو بوو، وتی: "من لای بەکری حاجی سەفەرەوە هاتووم و شتێکیشی خستە دەستمەوە، کە بە تێپ وەکو چوکلێت پێچرابوو، کە کردمەوە نامەی بەکر بوو داوای کردبوو متمانە بەو پیاوە بکەم و لەمەودوا لە ڕێگەی ئەوەوە پەیوەندی بکەین. ئەو دەمە بەکر ببوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەک و لە نامەکەشیدا نووسیبووی کە "من لە پارەزان و لە ماڵی مامەی تەتەرەوە ئەم نامەیە دەنێرم".

ئیتر بەو شێوەیەو بە هاوکاریی وەستا (لالۆ) ئەوەی پێمان کرا کردمان و هێندێکیشی بۆ باسکردن نابێت. گرنگ ئەوەبوو لە سۆنگەی بەرژەوەندیی نیشتمانییەوە، بۆ ویژدانی خۆم لەو کارانەدا بەشداربووم.

ماڵیشی ئاوابێت وەستا لالۆ لە کتێبەکەیدا (نیو سەدە تێکۆشان) زۆر بەوەفاو ئەمانەتەوە بەشداریی منی لە خەباتی ئەو ڕۆژگارەدا بۆ مێژوو تۆمار کردووە.

### ٩- بەرگریکردن لە سلێمانی.

ڕۆژێکیان لە مەجلیسی وەتەنی بە ئێمەی نوێنەرەکانی شاری سلێمانییان وت: "کۆبوونەوەتان هەیە لەگەڵ

فازیل ئەلبەراکدا". ئەم کابرایە ئەودەمە سەرۆکی دەزگای موخابەراتی ئێراق بوو، بکوژو ببڕ خۆی بوو.

ئەم کۆبوونەوەیە بۆ ئەوە بوو دەستکاریی ئەندازەو نەخشەی کۆنی سلێمانی بکرێت، بە ناوی ئەوەی کە بکرێت بە شارێک بۆ گەشتوگوزار، لە ڕەگوڕیشەوە کلتوورو شوناسە کوردییەکەی هەڵبتەکێنرێت.

لەوەوبەر ئەم پرسە لە مەجلیسی وەتەنی باسکرابوو، بەعس ئەگەرچی ئەم پرۆژەیەی بە ناوی پێشخستن و خزمەتی سلێمانییەوە هێنابووە پێشەوە، بەڵام مەبەستی سیاسی خۆی هەبوو.

کۆبوونەوەکە لە بینای قیادەی قەومی حزبی بەعس بوو، جگە لە (فازل ئەلبەراک) چەند بەرپرسێکی تر بەشداریی کۆبوونەوەکە بوون، لەوانە (عەبدوڵڵا سەلوم ئەلسامەرائی) بەرپرسی باکوورو ئەندامی قیادەی قوتری و (نەعیم ئەلحەداد) و (عەلی حەسەن ئەلمەجید) برازای سەدام، کە تازە ببووە بەڕێوەبەری (ئەمنی عام) بەشداربوون.

فازل ئەلبەراک دەستی بە کۆبوونەوەکە کردو وتی: "من بە ناوی سەدام حسێنەوە ئەم کۆبوونەوەیە دەکەم، ئەو لەبەر سەرقاڵیی منی ڕاسپاردووە گفتوگۆتان لەگەڵدا بکەم سەبارەت بە بارودۆخی کوردستان و ئەو پرۆژەیەی سلێمانی".

ئـەو قسـەی زۆری کـرد، نـوێنـەرانـی سلێمانی لە ئەنجومەنەکەدا زۆر بوون، من و (شێخ محەمەد قەرەداغی) ناسراو بە (خەتیب)و وتاربێژو پێشنوێژی مزگەوتی گەورەی سلێمانی بەتووندی دژی پرۆژەکە وەستاینەوە، ئەندامانی تر هیچیان قسەیان نەکرد، جگە لە (ناجی جاف)، کە پشتیوانی قسەکانی منی کرد.

من وتم: "ئەم پرۆژەیە جگە لەوەی زیانی بۆ سلێمانی دەبێت، هەموو شوێنەوارە کلتوورییی و ڕەسەنەکەی دەسڕێتەوە، ناڕازیبوونێکی زۆری خەڵکی شاری لێدەکەوێتەوەو هەرگیز بەمە قایل نابن و پاشان بۆ ئێوەش و وەک دەسەڵاتیش زیانی هەیە، ئەوەندەی تر خەڵک دژتان دەوەستنەوەو دەچنە بەرەی پێشمەرگەوە".

وتم: "من لە گوندی بناوەسووتە باخێکی دارگوێزم هەبوو، دەیان ساڵە بە داهاتەکەی ژیاوین، ئێستە کە ئێوە ئەم دارگوێزانەتان سووتاندووەو سەدان هەزار باخی واتان وێرانکردووە، خەڵک لە بەرو داهاتەکەیان بوون و زیانیان لێکەوتووە، سەرچاوەی ژیانیان نەماوەو بێکار کەوتوون".

نموونەی سیاسەتی داگرتنی گوندەکان و دروستکردنی موجەمەعەکانم بۆ باسکردن، کە چۆن خەڵک تێیدا بێ نەواو بێکارو کاسبین، بەهۆی ئەوەشەوە زۆربەی گەنجەکان

چوونەتە دەرەوە، دژی ئێوە بوون بە پێشمەرگە.

سەرە هاتە سەر خەتیب و ئەویش قسەی باشی کرد، نموونەی بە قورئان و فەرمودەی ئاینی هێنایەوە، باسی ڕووخاندنی مزگەوت و تەکیەو خانەقاکانی کرد. لەگەڵ خەتیب پێکەوە نووسراوێکمان لەسەر سلێمانی نووسیبوو، خۆشم بەجیا لەسەر بارودۆخی کوردستان نووسراوێکم نووسیبوو، هەردووکیمان پێشکەش کرد.

لەو دوونووسراوەدا بەدرێژیی باسی زیانەکانی پرۆژەکەم کردبوو، دەستیشم نەپاراستبوو، دوای کۆبوونەوەکە نووسراوەکەم دا بە فازڵ ئەلبەراک کە بیگەیەنێتە سەرۆکایەتیی کۆمار.

بیرمە دواتر وێنەیەکی ئەو نووسراوەم دا بە (دکتۆر کەمال مەزهەر) تا وەک بەڵگەیەک لای ئەو بمێنێت. ڕووشۆرێکی نووسراوەکەشم دا بە (حەمەسەعی جاف)، پاش خوێندنەوەی پێی وتم: "جا ئەمە هەر ئەوەی کەمە لە کۆتاییدا ناو و ئیمزای مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی بۆ زیاد بکرێت".

ئەمە بە ئاسانی تێپەڕ نەبوو، جارێکی تر هەوڵیان دا لیژنەی لێکۆڵینەوەم لەسەر دروست بکەن، سەیر لەوەدا بوو هێندێک لە ئەندامانی ئەنجومەنەکە لە نوێنەرانی

سلێمانی ڕاپۆرتیان لەسەر نووسیبووم و داواشیان کردبوو، لە ئەندامێتی ئەنجومەن دەربکرێم و پاشان سزای توونید بدرێم.

(فازل ئەلبەراک) پیاوێکی خوێندەوار بوو، لە مۆسکۆ بڕوانامەی دکتۆرای هێنابوو، ئاگام لێبوو کە قسەم دەکرد بەوردیی گوێی گرتبوو سەرنج و تێبینیشی تۆمار دەکرد.

دوایی بیستم لە سەروبەندی ئەوەدا کە لیژنەی لێکۆڵینەوەم لەسەر دروست بکەن، هێندێک قسەی ئەو گەردنمی لە پەتی سێدارە ڕزگارکردبوو کە وتبووی: "ئەم کابرایە شاعیرو ڕۆشنبیرەو وەکو ئەندامەکانی تر نییە، دەچێتە ناو خەڵک و ئاگای لە کێشەو گرفتەکانیان هەیە، هاتووە بە ئاشکرا ئەم قسانەی لای ئێمە باسکردووە، بۆیە پێویست ناکات لەسەر ئەو قسانە تۆمەتباری بکەین و سزای بدەین".

لەسەر ئەمە ڕۆژێک نەعیم ئەلحەداد سەرۆکی مەجلیسی وەتەنی و لە هەمان کاتیشدا ئەندامی قیادەی قەومی حزبی بەعس، بانگی کردم بۆ ژوورەکەی خۆی و وتی: "ئەمجارەش ڕزگارت بوو، بەڵام پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت: یەکەم و دووەم تێدەپەڕن، بۆیە ئاگادارت دەکەم سێیەمجار سەرت دادەنێیت".

١٠- پلەوپایەی ڕۆشنبیریی.

خولێکم لە مەجلیسی وەتەنی تەواو کردو بارودۆخەکەش بە جۆرێک بوو، نەمویست بۆ خولێکی ترخۆم هەڵبژێرمەوە، ئەگەرچی بەپێی یاسا دەمتوانی خۆم هەڵبژێرمەوە.

لە کۆتایی ئەو خولەشدا زانیارییان لەسەر ئەندامان وەرگرت و بڕیاربوو ئەوانەی کە لەوەوبەر فەرمانبەری میریی نەبوون، دایان بمەزرێنن.

منیش خولیای ئەوەم بوو لە پێنجوێن و سلێمانی کار بکەم. دەرفەتێک ڕەخسابوو ببوومە بەڕێوەبەری ناوچەی (گەرمک) لە پێنجوێن. هەوڵێکیش هەبوو بمکەنە قایمقامی سلێمانی، بۆ ئەمەش لە بەغدا خولێکی تایبەتی بەڕێوەبردنم بینی و لە خولەکەشدا سەرکەوتوو بووم.

نزیکەی ساڵ و نیوێک زیاتر لە گەرمک مامەوەو ئەوەی لەتوانادا بوو لە کەم و زۆر کردم.

لە سەروبەندی کاروباری قایمقامییەتەکەی سلێمانیدا چاوەڕوانی دەرچوونی بڕیاری دەستبەکاربوونم دەکرد، (محەمەد ئەمین شەمی)، کە خەڵکی دهۆک بوو (ئەمین عامی ڕۆشنبیریی) بوو، لە هەولێریش پێش ئەوەی ببێتە پارێزگاری سلێمانی، یەکێتیی نیشتمانی هەوڵی کوشتنیان دابوو، وتی: "بەتەماین لە سلێمانی بەڕێوەبەرایەتییەک بۆ

ڕۆشنبیریی بکەینەوە"، پێشنیاری بۆ کردم ببمە بەڕێوەبەرو واز لە قایمقامییەتەکە بهێنم.

زۆری هاندام لە قایمقامیەتییەکە پەشیمان ببمەوە، وتی: "نووسراوێک بۆ وەزارەتی ناوخۆ بکەو دەستبەرداری بە، سەرقاڵی کاری بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی بە، کە لەگەڵ تواناکانی خۆتدا گونجاوەو شارەزاییت تیایدا هەیە".

لەڕاستیدا من خۆشم سەرم لەوە دەخورا بە کاری ڕۆشنبیرییەوە سەرقاڵبم و لەو بوارەدا خزمەتێک بکەم.

ئەمین عام خۆی کاروباری دامەزراندنەکەمی ڕێکخستبوو، بانگ کرام بۆ هەولێرو لەوێ بە وەکالەت دامەزرام بە بەڕێوەبەری ڕۆشنبیریی و جەماوەریی و کە هاتیشمە سلێمانی بۆ دەستبەکاربوون، کرامە بەڕێوەبەر.

ئیتر دەبوو سەرقاڵی کاروبار بم، بۆیە ماڵم گواستەوە بۆ سلێمانی و لە تەنیشت بینای قایمقامیەتی ئێستای سلێمانی و بەرامبەر باخی گشتی خانوویەکم بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکە پەیداکرد، کە ئێستاش ئەو خانووە ماوە.

بەهۆی پەیوەندیی هاوڕێیەتیم بە هونەرمەندو نووسەران و ڕۆشنبیرانەوە، لەگەڵ دامەزراندنی بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریدا زۆربەیان بەپیر ئەو چالاکییانەوە هاتن کە دەمانویست بەڕێوەیان ببەین.

یەکەمین لیژنەی ڕۆشنبیریمان پێکهێنا کە ئەم بەڕێزانە بوون (دڵشاد مەریوانی، ئەنوەر قەرەداغی، فوئادی حەمەومین ئاغا، شێخ حەسیب قەرەداغی، جەلال عەزیز، هێرۆ گۆران، ئازاد عەبدولواحید، حسێن جومبوش).

لێرەدا دەمەوێت ڕازێک بنووسمەوە.

ساڵی (١٩٧٥) بەهۆی نسکۆی شۆڕشەوە خەڵکەکە تەواو مۆراڵیان لەدەست دابوو، بارودۆخی کلتووریی و ڕۆشنبیریی هەر بە جارێک خراپ ببوو. کە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی کرایەوەو منیش بەڕێوەبەری بووم، توێژی هونەرمەندو نووسەرانیش سامیان لێم نەبوو، هەماهەنگییەکی باش دروست بوو. ئێمە کۆڕو کۆبوونەوەکان، شانۆو پێشانگاو نمایشاگاکانمان کرد بە سەنگەر، لەوێ نووسەرو هونەرمەندان گوزارشتیان لە خۆیان دەکرد.

پارەکە هی دەوڵەت بوو، ئێمەش بۆ کاروباری کلتووریی خەرجمان دەکردو بە هێمنیش لەسایەی ئەوەدا کە بەڕێوبەرایەتییەکە سەر بە میرییە، ڕۆحی بەرەنگاربوونەوەو نیشتمانپەروەریمان دەبووژاندەوە.

من لە تەمەنی گەنجی و پیریدا زۆر کارم کردووە، ویژدانی خۆم ڕازی کردووە، بەڵام ئەگەر تۆ لێم بپرسیت درەوشاوەترین قۆناغی ژیانت کامە بووەو لە کام قۆناغدا

زۆرترین خزمەتت کردووە، لە وەڵامدا دەڵێم: "ئەودەمەی بەڕێوەبەری ڕۆشنبیریی و جەماوەریی سلێمانی بووم، کە لە ڕۆژانی نائومێدیی و بێنەواییدا توانیم ورەو مۆراڵی نەتەوەکەم دژی داگیرکەر بەرزبکەمەوە".

لەو ماوەیەدا جگە لە چالاکی هونەریی و ئەدەبی و ڕۆشنبیریی، یادی شاعیرانی وەک: گۆران، بێکەس، قانع، موفتی پێنجوێنی و... هتدمان کردەوە، یادەکان سێ ڕۆژی دەخایاندو هەموویان لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکراو دوایی هەمووشیمان دەکردە کتێب و چاپمان دەکردن.

نووسەران، شاعیرو هونەرمەند، شانۆکارو شێوەکار هەموو دەرفەتیان بۆ کرایەوە، بۆئەوەی کار بکەن. لەو سەروبەندەدا کە بەڕێوەبەری ڕۆشنبیریی بووم، دۆست و دوژمن شایەتی دەدەن کە کۆڕو کۆبوونەوە هونەریی و ئەدەبییەکان بە جۆرێک گەرم ببوون، کە دەبوونە هەتووان بۆ زامی بێنەوایی ئەو ڕۆژگارەو ورەو مۆراڵیشیان بەرز ڕادەگرت.

ئەگەر ڕۆژێک بە بێلایەنانە لێکۆڵینەوە بۆ ئەو قۆناغە بکرێت، دەردەکەوێت کە لەو دەمەدا هونەرو ئەدەبی بەرگریکردن لە چ برەوێکدا بووە.

ئینجا ڕۆژگار هات و ڕۆیشت، ئەم یادەی کە ئێستا بۆ

سلێمانی دەکەنەوە، ئەو دەمە من دامهێنا، وەکو ئێستەش ساڵانە نەدەکراو بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ساڵی (١٩٨٤) یادی دووسەد ساڵەی سلێمانیمان کردەوە. چەند ڕۆژێکی خایاندو چەندین لێکۆڵینەوە لەلایەن پسپۆڕو مێژوونووس و ئەدیبانەوە پێشکەشکراو خەڵکێکی زۆریش بەشدارییان تیادا کرد.

ئێستا ڕەنگە تۆی خوێنەر لێم بپرسیت: چۆن هونەرو ئەدەب گەشەیان دەکرد، لەکاتێکدا زەبرو زەنگی بەعس لەوپەڕیدا بوو، چاوی ڕەقیب بۆ چاودێریی بەسەر وردو درشتەوە بووە؟!

با من وەڵامێکی کورتی ئەو پرسیارە بدەمەوە، ئەودەمە بارودۆخی سیاسی ئاڵۆز بوو، خەڵکی کوردستان تورە بوون و دەزگاو دامەزراوەکانی حوکمی زاتییان بە کارتۆنی دەزانی، بۆیە کاتێک خەڵکی ڕۆشنبیرو هونەرمەند مامەڵەیان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیرییدا دەکرد، میریی ئەمەی پێ خۆشبوو، بۆیە کەمێک چاوپۆشیی دەکرد. پاشان خۆ هەموو جار کارەکان بە ئاسانی تێنەدەپەڕین، لەو ماوەیەدا لەسەر شیعر، چیرۆک، شانۆیی و پێشانگا خەڵک دەستگیرکران، تەنانەت کەسانی تریش شەهیدکران. ئەمە جگە لەوەی خۆم چەندجار لەلایەن ئەمنەوە لێکۆڵینەوەم

لەگەڵدا دەکرا، بەڵام بەگشتی دەتوانم بڵێم "لەو قۆناغەدا ڕەوتی ڕۆشنبیریی ببووە جێی ئومێدو تروسکایی ڕۆژانی تاریک بوو".

وەکو لەمەوبەر باسم کرد، لەسەر ئەم چالاکییانە زۆر کات دووچاری لێپرسینەوە دەبووم، هەرجارەی بە بیانوویەکەوە دەرباز دەبووم، بەڵام ئیتر ئەوەندە ڕاپۆرتیان لێدام و ئەوەندە بانگیان دەکردم بۆ ئەمن، تا بەجارێ کەوتنە گومانەوە لەسەرم و لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی سلێمانی لایانبردم و گواستمیانەوە بۆ ئەمانەتی عامەی ڕۆشنبیریی لە هەولێر. لەوێش پلەکەم هەر بەڕێوەبەر بوو، بەڵام هیچ ئیشوکارێکم نەبوو.

گومانەکانی دەزگا ئەمنییەکان لەسەرم، ڕاست بوون، بەڵام بەڵگەیان نەبوو بۆ تاوانبارکردنم، ئەگینا من لەو دەمەدا لەژێر پەردەی ئەو فەرمانگەیەدا زۆر کاری نهێنیم دەکرد.

ژوورێکم کردبوو بە گەنجینە، دەمانچەیەکی کاتم و ئامێرێکی چاپ و ڕۆنیۆیەکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە ژوورەکەدا بوون. "گیلاسی عومەری عەلی ئەمین" ئەودەمە لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی ژمێریار بوو، کاروباری گەنجینە ئیشی ئەو نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ماڵە پێشمەرگە

بوون و دەمزانی ئیشی نهێنی دەکات، کلیلی ئەو ژوورەم لای ئەو دانابوو و کردبووشم بە بەرپرسی گەنجینە.

بە ئۆتۆمبێلی بەڕێوبەرایەتییەکەش دەچوومە پێنجوێن، ئەودەمە پەیوەندیم بە (لالۆ پێنجوێنی)یەوە هەبوو، بەیان و بڵاوکراوەی نامەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانم دەهێنا بۆ سلێمانی و لە ڕێگای خۆیەوە دابەشم دەکردو هێندێکجاریش لە سلێمانیشەوە نامەو نووسراوی نهێنیم دەگواستەوە بۆ دەرەوە.

بیرمە جارێکیان لە سلێمانییەوە هەندێک نووسراوی نهێنیم برد بۆ (ئازاد جوندیانی). ئازاد ئەوسا گەنجێکی خوێندەوارو چالاک بوو، فەرمانبەر بوو لە ڕۆشنبیریی هەولێرو پێشتر من لە ڕێگەی (دڵشاد مەریوانی)یەوە ناسیبووم.

## ١١- سەری بەرزی دڵشاد مەریوانی.

دڵشاد مەریوانی جگە لەوەی شاعیرێکی ناسک و ئەدیبێکی بەسەلیقە بوو، کەسێکی ساغ و نیشتمانپەروەر بوو. من دڵشاد مەریوانیم بە وەستا لالۆ ناساندو ئیتر دڵشاد لەبەرئەوەی وەکو من سەرقاڵ نەبوو، زۆربەی کاتی تەرخان کردبوو بۆ کاری ڕێکخستن و بووە کادرێکی چالاکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و دواتریش کرایە بەرپرسی من.

یەکێک لەو چالاکییانەی کە دڵشاد پێوەی سەرقاڵ بوو، خۆئامادەکردن بوو بۆ هەوڵی کوشتنی (شیخ جەعفەر بەرزنجی) پارێزگاری سلێمانی.

بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە، نازانم تا چەند لەوە نزیکبوونەوە شوێن و کاتی چالاکییەکە دیاری بکەن، بەلام بەهۆی ئەوەوە کە یەکێک لە گرووپەکە خیانەتی کردبوو، زانیارییەکانی بۆ ئەمن گواستبووەوە، دڵشاد ئاشکرابوو، هەواڵەکەش گەیشتبووە دەمی پارێزگاری سلێمانی. بۆیە ئیتر دڵشاد نەیدەتوانی لە شاردا بمێنێتەوەو ماوەیەک خۆی شاردەوەو چووە شاخ.

کە یەکێتیی نیشتمانی دەستی کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ بەعسدا، دڵشاد مەریوانی قسەی لەگەڵ کاک (نەوشیروان مستەفا) کردبوو هاتەوە ناو شار. من، بۆئەوەی دڵشاد کێشەی بۆ دروست نەبێت، بردم بۆ لای شێخ جەعفەری پارێزگارو پاشان بردم بۆ لای بەرپرسی مونەزەمەی بەعس لە سلێمانی، ئەوکاتە هەرکەس لە شاخ دەهاتەوە، دەبوو خۆی بە میریی بناسێنێت، ئەوانیش نووسراوێکیان بۆ دەکرد.

دڵشاد خۆی پیاوێکی سەرکێش بوو، بە ئاشکرا زۆرجار قسەی دەکرد، شەوێکیان لە یانەی مۆزەفین ژووێکمان

هەبوو، ناوبەناو کۆدەبووینەوە، کۆمەڵێک نووسەرو ئەدیب بووین، دڵشاد بە دەنگی بەرز کەوتبووە باسکردنی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و چالاکییەکانی (هەڵۆی سور)و کارێکی دەکرد نەیدەکردەوە، وای لێهات مەجلیسەکە لەترسا ئەو ناوەیان بەجێهێشت و دوایی منیش پەلیم گرت و وتم: "کاکە تۆ خەمی خۆت نییە، بەزەییت بە ئێمەدا بێتەوە".

ماوەیەکیش دڵشاد مامۆستای دواناوەندیی بوو، بایەخی دەدا بەوەی گەنجان فێری ڕێنووسی لاتینی بکات و بانگهێشتی بۆ ئەوە دەکرد کە ڕێنووسی کوردی بە یەکجاریی بکرێت بە لاتینی و پیتی عەرەبی بەکار نەهێنرێت.

ئەگەرچی خۆم دڵشادم برد بۆ لای شێخ جەعفەری پارێزگار، بۆئەوەی سەبارەت بەو هەوڵەی دڵشاد بۆ کوشتنی، هیچی لە دڵدا نەمێنێت، بەڵام ئەو هەر کۆنەقینێکی هەبوو، کۆمەڵێک نووسەرو ئەدیبی سلێمانیش بۆ خۆبردنە پێشەوەو ڕووپامایی شێخ جەعفەریان پڕ دەکردو دژی دڵشاد هانیان دەدا، بەڵام ئەوەی سەری دڵشادی خوارد، شتێکی تر بوو.

پاش ماوەیەک لە گەڕانەوەی، دڵشاد نامەیەک دەنووسێت بۆ شاخ، لەو نامەیەدا باسی ئەوە دەکات کە ئەو لە شارو لە هەرکوێیەک بێت، نەک زیانی بۆ شۆڕش نابێت، بەڵکو

دڵسۆزانە کار دەکات و شتی لەم بابەتە.

ڕووشۆرێکی ئەو نامەیە دەگاتە دەست ئەمن، چۆن و بەشێوەیەک و لەڕێگەی کێوە ئەم نامەیە ئاشکرا دەبێت، ئەوەیان من نایزانم، بەڵام نابێت نەشڵێم ئەم ماستە مویەکی تێدا نەبووە، بۆئەوەی ببێتە گوریس و لە ملی دڵشاد بئاڵێت!

بەهۆی ئەو نامەیەوە لەلایەن بەعسەوە دڵشاد دەستگیرکراو دواییش شەهید کرا.

لێرەدا شتێک باس دەکەم، ئەگەرچی زۆر نیگەران و غەمبارم دەکات کە دەیگێڕمەوە، بەڵام زۆر گرنگە وەک شایەتییەک لەسەر جوامێریی و ئازایەتی دڵشاد مەریوانی باسی بکەم.

لەدوای ڕاپەڕین ڕۆژێک کەسێک هات بۆلام، وتی: "بەڵگەیەک هەیە دەمەوێت ببینیت، تەنها ببینیت، ئەگینا وەکی تر نە بەڵگەکەت دەدەمێ و نە هەرگیز باسیشم بکە".

ئەو بەڵگەیەی میوانەکە هێنابووی، ڤیدیۆیەکە کە لەکاتی گرتنی فەرمانگەی ئەمنی بەعس لە ڕاپەڕیندا لە سلێمانی بەدەستکەوتووە. لە ڤیدیۆکەدا دڵشاد مەریوانی دەردەکەوێت بە دەست و چاوبەستراویی، بە باڵابەرزەکەیەوە عەریفێکی عەرەبی ڕیوەڵەی لاواز پێی دەڵێت: "سەردانەوێنە".

دڵشاد پێی دەڵێت: "من هەمیشە سەرم بەرزە"، ئینجا سێ فیشەک دەنێت بە کەللەی سەرییەوە.

وا ئەمجارەش
ئەم ئەستێرە خڕەی زەوی
سووڕایەوە...
وەرزێکی نوێ هاتە بەرکار
هەرچی غەم و زام و ژانە
لوولەکراو، پێچرایەوە!
وا ئەمجارەش
چاوی کزی نێرگزی، نازتۆراو!
پشکوت و هەم ڕازایەوە...
بەفر و بەستەڵەکی زستان
بەزەبری برووسکە و باران.
توایەوە...
نەریتی... گوڵ ڤرتاندن
هێلانەی کەوبارِ... شێواندن
بەمیرات بۆمان مایەوە.

۱ - سەرەتای ڕاپەڕین.

کە ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١) ڕوویدا، ماڵم لە هەولێر بوو، دوای هەفتەیەک لە ڕزگارکردنی هەولێر ڕۆژێکیان (سەعدوڵلا پەرۆش) هات بۆ ماڵەوە بۆلام و وتی: "کاک کۆسرەت ڕەسوڵ سۆراغی تۆی کردووەو پێش ئەوەی هەولێر ڕزگار بکرێت کاک نەوشیروان ڕایسپاردووە بتبینێت".

کاک کۆسرەتم بینی، وتی: "کاک نەوشیروان پێی وتووم ئاگات لە حەمەمین بێت و چیشی پێویست بوو بۆی بکە"، سوپاسم کردو باسی بارودۆخی نوێی ڕاپەڕینمان کردو وتم: "من لە ماڵی خۆمدام و سەرقاڵی شیعرو ئەدەبم وەک کوردێکیش شاگەشکەم بەم ئازادییەی بەدەسمان هێناوە".

لەو ماوەیەدا سەردانی (عەزیز محەمەد)یشم دەکردو ئیتر برادەران لە شیوعی و پارتی و یەکێتی هاتوچوون لەنێوانماندا هەبوو، کۆڕی گفتوگۆی سیاسیش گەرم بوو.

کاک نەوشیروان هاتبووە سلێمانی، کەسێکی ڕاسپاردبوو بۆئەوەی سەردانی بکەم، من کاک نەوشیروانم لەو کاتەوە دەناسی کە سەرەوکاری دەرکردنی گۆڤاری ڕزگاری دەکرد.

ئێمە وەکو شیوعی چاپخانەی خۆمان هەبوو، ئەوسا چاپ وەکو ئێستا نەبوو، پیتەکان یەک یەک لە کانزا دروستکرابوون و دەلکێنران بەیەکەوەو بەهۆی زۆربەکارهێنانیشەوە هێندێک لەو پیتانە سوابوون.

سەرقاڵی چاپکردنی بەیاننامەو بڵاوکراوەی حزبی بووین و پێویستیمان کەوتبووە چاپخانەکەی گۆڤاری ڕزگاری، (بورهان قانع) لەویَ کاری دەکردو هاوشاری من بوو، بۆیە خاتری دەویستم و کاری بۆ مەیسەر دەکردم.

ئەمجارە کە کاک نەوشیروانم بینی، ئەگەرچی سروشتە سادەکەی خۆی نەدۆڕاندبوو، بەڵام ئێستا ئیتر ئەو سەرکردەیەک بوو. گفتوگۆیەکی دوورو درێژمان کردو من سوپاسم کرد، کە کاک کۆسرەتی ڕاسپاردبوو لە ڕاپەڕیندا ئاگاداری من بێت و ئەویش ستایشی ئەو کارانەی منی کرد، کە بەنهێنی بۆ شۆڕش کردوومن.

دوای سەردانەکەی کاک نەوشیروان گەڕامەوە هەولێر، برادەرێکم هەبوو خەڵکی سلێمانی بوو، ناوی کاک (حەکیم) ە، پیاوێکی خوێندەوارو چاک بوو، لەناو بازاڕی هەولێردا دوکانی چاپەمەنی و فۆتۆکۆپی و ئەو بابەتانەی هەبوو، زۆربەی کات من لەلای ئەو دادەنیشتم. دوکانەکە ببووە نێوەندێک بۆ کۆبوونەوەی نووسەرو ئەدیب و ڕۆشنبیران.

لەو سەروبەندەدا هێندێک چالاکوانی پارتی کرێکارانیش دەهاتنە ناو بازاڕو زۆرجاریش ڕێیان دەکەوتە ئەو دوکانەی من لێی دادەنیشتم.

سەردانی من بۆ دوکانەکەو هاتنی ئەو چالاکوانانەی (پەکەکە) بۆ ئەوێ جۆرێ لە ئاشنایەتی لێکەوتەوەو دواتر ئەوان سۆراغی منیان کردبوو، هەڵیانسەنگاندبووم، بۆیە ڕۆژێک کە چووم بۆ دوکانەکە، کاک حەکیم وتی: "ئەم دوو برادەرە هاتوون قسە لەگەڵ تۆدا بکەن".

ئەو دووانە یەکێکیان زازاکی بوو، ئەوی تریشیان کرمانجی بوو و خەڵکی ڕۆژئاوا بوو، ناوی (ئازاد) بوو، دوایی زانیم کە لە بنەماڵەیەکی تێکۆشەرو ناوداری ڕۆژئاوان و برای هونەرمەندی سترانبێژ (جوان حاجۆ) بوو. ئەوسا پەکەکە بەهۆی ئازادیی و بارودۆخی ڕاپەڕینی باشووری کوردستانەوە وردە وردە دەهاتنە ناو خەڵک و لە ڕێگای دوکانی خەیات و فۆتۆگرافەرو چاپەمەنییەوە پەیوەندییان دروست دەکرد، ئازاد لەبەرئەوەی خەڵکی ڕۆژئاوا بوو، جگە لەوەی فێری هەندێک وشەی سۆرانی ببوو، وشەی عەرەبیشی بەکاردەهێناو باشتر لە یەک دەگەیشتین.

لێرەدا دەمەوێت سەرنجێک بۆ مێژوو تۆمار بکەم، بۆئەوەی ئەگەر ڕۆژێک لێکۆڵەرەوەیەک ویستی کار لەسەر

ئەم بابەتە بکات، سودی لێوەربگرێت.

کورد گلەیی ئەوە لە خۆیان دەکەن کە لە چوارپارچەدان و یەکگرتوو نین، بەڵام جگە لە هاوسنووریی لەنێوان پارچەکاندا، کەم ڕێکەوتووە بارودۆخێکی وەها فەراهەم بێت و ئازادییەکی وەها هەبێت، کە کرمانجی و زازاکی و سۆرانی و هەورامی و دیالەکتیکی تر تێکەڵ بن و ڕاوبۆچوون ئاڵوگۆڕ بکەن.

لەدوای ڕاپەڕین دەرگا کرایەوەو لە چاکەکانی ئازادیی ئەوەبوو خەڵکی پارچەکانی تر هاتنە باشوورو قسەو گفتوگۆ کراو ڕاو بیروبۆچوون ئاڵوگۆڕ کرا، شێوەزارو دیالەکتیکەکانیش لێکتر نزیکبوونەوە.

ئەو دەمە کە خەڵک بە کرمانجی باکوور، یان ڕۆژئاوا قسەیان دەکرد، زۆر قورس بوو لێک بگەین، ئێستا وا نییەو هاتوچوون و پەیوەندی و میدیا زۆر لێکتر گەیشتنی نزیککردۆتەوە، هەمیشە وایە ئازادیی و سەقامگیریی سیاسی، شتی باشی لێدەکەوێتەوە.

دانیشتنەکەی ئەو جارە لەگەڵ دوو هاوڕێکەی پەکەکەدا، دانیشتنێکی تری لێکەوتەوە، یەکەمجار لەماڵی خۆمان بەڕێوەچوو لە هەولێر.

لەو دانیشتنەی ماڵی خۆماندا هەڤاڵ ئازاد حاجۆو هاوڕێ زازاکییەکەی هێندێک لە ئەدەبییاتی پەکەکەو کتێبەکانی (عەبدوڵڵا ئۆچالان)یان بۆ هێنام و منیش کەوتمە خوێندنەوەیان و ئەقڵم گرتی.

جاری سێیەم لەگەڵ ئەو دوو برادەرە لە ماڵی خۆمان دانیشتین، ئەمجارە ئەوان بە فەرمی داوایان لێکردم تەڤلی ڕێکخستنەکانی پەکەکە ببم.

وای لێهات ماڵی ئێمە بوو بە پورەهەنگ، بۆ دانیشتن و کۆبوونەوەو بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی (عەبدوڵڵا ئۆچالان)و پەکەکە. جار هەبوو لە دانیشتنەکانی ماڵی ئێمەدا، بیست تا سی کەس ئامادە دەبوون، من زۆرێکم بۆ ئەو کۆبوونەوانە داوەت دەکرد لە شاعیرو نووسەرو ڕۆشنبیران و هێندێکیش لە شیوعییە کۆنەکان. خەڵکی وەکو (مومتاز حەیدەری و تاریق جامبازو فەوزی ڕەشید) و خەڵکی تریش، لەوانە کوڕێکی قەڵادزێی کە خزمی خۆم بوو، ناوی (چالاک سۆفی) بوو.

٢- کوردستانی نوێ:

بەهۆی باس و خواسی ئەدەبییەوە ئەو دەمە کە لە هەولێر بووم لەگەڵ (بەدران حەبیب) هاوڕێ بووم، وتی:

"ئەرسەلان بایز حەز دەکات لەگەڵ هێندێک نووسەرو ڕۆشنبیر کۆببێتەوە، یەکێتی بەتەمای دامەزراندنی ڕۆژنامەیەکە".

نزیکەی بیست کەسێک لەگەڵ ئەرسەلان دانیشتین و گفتوگۆ زۆر کراو قسە هاتە سەر ئەوەی کە ڕۆژنامەکە ناوبنێن، هەرکەسەو پێشنیاری ناوێکی دەکردو لەسەر کاغەزێک دەینووسی، من پێشنیاری کوردستانی تازەم کردو بەدرانیش پێشنیاری ناوی کوردستانی نوێی کرد بۆ ڕۆژنامەکە، ئیتر ئەرسەلان وتی: "من هەموو پێشنیارو سەرنج و تێبینییەکان کۆدەکەمەوەو دەیبەم بۆ مام جەلال".

## ٣- سەردانی ئاپۆ لە دەشتی (بیقاع).

ڕۆژێکیان هەر ئەو دوو برادەرە هاتن بۆماڵەوە، وتیان: "سەرۆک ئاپۆ حەز دەکات بتبینێت و بچی بۆ دەشتی بیقاع لە لوبنان، خۆشت کێت پێ باشە دەتوانیت وەکو شاندێکی باشوور لەگەڵ خۆتدا بیانبەیت".

لە ماوەی ڕابردوودا ئەوان ناسیاوییان لەگەڵ مومتاز حەیدەری و تاریق جامبازو ئەو چالاک سۆفییەی کە وتم خزمێکی قەڵادزێیمە، پەیداکردبوو، لەگەڵ حەکیمیشدا کە خاوەنی دوکانی چاپەمەنییەکەی هەولێر بوو.

دە پانزە ڕۆژێکی خایاند، هـەردوو هـەڤاڵ هاتنەوە وتیان: "وادەی بەڕێکەوتنمان هاتووە بۆ بیقاع، ئەوەی سەرنجم دا ئەوان لەو ماوە کەمەدا کە ڕاپەڕین لە باشوور ڕوویـدابـوو و ئـازادییـەک دروسـت ببـوو، پەیوەندیەکی باشیان دروستکردبوو، لەو ماوە کەمەدا لە هەموو شوێنێک پێگەیەکیان دانابوو، ئەمە خەسڵەتێکی زیرەکانەی کوردی بوو، پەکەکە سودیان لێوەرگرتبوو.

جابا باسی ئـەوە بکەم چـۆن بـەرەو بیقاعی لوبنانی چووین.

سەرەتای سەفەرەکەمان لە زاخۆوە دەستی پێکرد، لە زاخۆ ناحیەیەک هەیە پێی دەڵێن (دەرکار)، ئەوان زۆربەیان سەر بە عەشرەتی (سندی)ن و واری ئەوان بەرەو سنووری کوردستانی باکوورە.

لەوەوپێش "عومەر سندی" سەردانی ئاپۆی کردبوو لە بیقاع، بۆیە ماڵەکەی مام عومەر ببووە ویستگەیەک بۆ ئەوانەی لە باشوورەوە دەچوون بۆ لای ئاپۆ.

شەوێک لە ماڵی مام عومەر ماینەوە، بەیانی بە چیای (بێ خێر)دا هەڵزناین، بە پێ ڕۆیشتین تا لە پێ کەوتین، ئینجا لە ئاو پەڕینەوەو نزیکبووینەوە لە (قامیشلۆ).

لەوێ پیادەڕەویی پڕووکانبووین، وادەی ئەوە هات سواری ئۆتۆمبێل بین، پێیان وتین: "نابێت بڵێین ئێمە خەڵکی باشوورین"، ئەودەمە ئەوان لەگەڵ سورییەکاندا ڕێکەوتبوون، کە ئەوان تەنها مامەڵە لەگەڵ کوردی باکووردا دەکەن، واتا خەڵکانێک ڕێکدەخەن دژی تورکیا بێت و نابێت کوردی سوریاو ئێراق بکەن بە یەکەکە.

بە منیان وت: "ئەگەر تووشی هەرچی بوون، بڵێ من خەڵکی سلۆپیم، چونکە سەروسەکوتت لە کوردی سلۆپی دەچێت".

بەهەرحاڵ گەیشتینە نزیک قامیشلۆ، ئەوان لەگەڵ حکومەتی سوریادا پەیوەندییان هەبوو، کاغەزیان بۆ ئێمە کرد بە شەمەندەفەر چووینە دیمەشق.

ئەوان لەوێ ڕێپێدراو بوون و بنکەیان هەبوو، لەوێوە بە ئۆتۆمبێل بەرەو دەشتی بیقاعی لوبنانی بەڕێکەوتین، ئەودەمە باشووری لوبنان سوپای سوریی تێیدا حاکم بوو.

تۆ سەیری ئەم دەردی کوردبوونەکە چۆنە، زۆرجار خەڵک بە من دەڵێن باشە تۆ پیاوێکی ئاقڵی چۆن لەگەڵ ئەم پەکەکەیە هەڵتکردووە، وەڵام نادەمەوە گوێ لەم چیرۆکە بگرەو دەزانیت ئەوان چۆن لەناو تەونی جاڵجاڵۆکەدا ڕێگایان بۆ خەونی کورد دۆزیوەتەوە.

لەسەر سنووری نێوان سوریاو لوبنان دایانبەزاندین و یەک دووانێکی خۆیان پێشمانکەوتن، وتیان: "لێرەوە بەرەو ئەو دۆڵە دەبێت بە ڕاکردن بڕۆین، نەوەکو کامێرا وێنەمان بگرێت". بەڕاکردن بە دۆڵەکەدا شۆڕبووینەوە، پاشان بە چیایەکی سەختدا هەڵزناین، کە داگەڕاینەوە بۆ خوارەوە، ئەوە ئیتر پانتاییەک بوو چواردەوری بە زنجیرەچیایەک گیرابوو، دەشتاییەکە دەکەوتە نێوەندی چیاکانەوە. بیقاع نیشتمانی پەکەکەو زێدی ئەودەمەی ئاپۆ بوو.

بارەگاکەی لەسەر شێوەو شێوازی پیتی ئێچی ئینگلیزی دروستکرابوو، لەو بارەگایە دەچوو کە "ماو" لە سەردەمی شۆڕشی چینیدا دروستی کردبوو.

شێوازی بیناکە لەسەر شێوەی پیتی ئێچ بوو، لایەکی کتێبخانەو شوێنی پێشوازیی میوان بوو، لاکەی تری شوێنی نانخواردن و چێشتخانە بوو، لە ناوەڕاستیشدا تەوالێت و حەمام و گەنجینە هەبوو. شوێنی نووستنی ئێمە لە دەرەوەی پیتی ئێچەکە بوو.

کە لە دیمەشقەوە هاتین، جگە لە ئێمە شاندەکەی باشوور، چەند کەسێکی ترمان لەگەڵدا بوو، کە ئەوانە لە شوێنی جیاجیاوە هاتبوون، ئەوانیش وەک ئێمە هاتنە بیقاع بۆ لای ئاپۆ.

پاش گەیشتنمان بۆ بارەگاکە، پاش کەمێک ئاپۆ هات و بەخێرهاتنی کردین. ئاپۆ پیاوێکی تیکسمڕاوی سەرو سمێڵ ڕەش، دوو چاوی تیژو سەرو سیمای سەرکردەیەکی سەربازیی هەبوو، دەستێک جلی سەوزی سەربازیی لەبەردابوو، لە دانیشتن و هەڵسوکەوتیشدا هەر لە فەرماندەیەکی سەربازیی دەچوو، نەک کەسێکی سیاسی و دیبلۆماسی، لەگەڵ ئەوەشدا سیمای نەرمونیانی دەنواند، بەڵام وەکو خانەخوێیەکی بەویقار.

پاش بەخێرهێنانمان، هەرکەسە خۆی ناساند، بێگومان لەوەوپێش ئەو دەیزانی ئێمە کێین و هەموو زانیارییەکی لەبارەمانەوە هەبوو، بەڵام ئسوڵ وایە لە مجۆرە دیدارانەدا هەرکەس خۆی باسی خۆی بکات.

پاشان ئاپۆ وتی: "ئێوە لە ڕێگای دوورەوە هاتوون و ماندوون، ئەمشەو پشوو بدەن و بەیانی بە درێژیی قسە دەکەین".

پاش نان و چا خواردن، بردیانین بۆ شوێنی حەوانەوە.

ئەوان لەو بەشەدا کە شوێنی نووستن بوو، چەند ژوورێکیان هەبوو، کە دیاربوو بۆ میوانداریی بوو، هەر ژوورە سێ چوار قەرەوێڵەی تێدابوو، تەوالێتی تایبەتی هەبوو و نوێن و کەلوپەلی ژوورەکە پاکوتەمیز بوون.

٤- شێوازی ژیان لە بیقاع.

من جگە لە سەردانی یەکەم، چەندین جاری تر چوومەوە بۆ بیقاع، جاری یەکەم زستان و تەڕوتووشی بوو، بە بەهارو هاوینیش چووم, لە هەموو سەردانەکانمدا یەک شێوازی ژیانی تایبەت و بەدیسپلینم بینی، هەرگیز نە دەنگەدەنگێک، نە قرەقرو دەنگ بەرزکردنەوەیەک، نە شتێکی وا سەرنجم بۆ ئەوە ڕابکێشێت کە ناڕێکییەک هەیە. ئەوانەی لێرە بینیم، هەرگیز لە شۆڕشی باشووردا نموونەیم نەبینیوە.

ئاپۆو هەموو ئەوانەی لەو کەمپەدا بوون، کە ئەوکاتە (٨٥٠) کەس بوون، بەیانییان سەعات شەش لە خەو هەڵدەستان، سەعاتێک مەشقی سەربازییان دەکرد، بە تورکی سرودی ئەنتەرناسیونالیان دەچڕی، لە مەشق و ڕاکردندا ئاپۆ خۆی لە پێش هەموویانەوە بوو، پاشان نانی بەیانییان دەخواردو پشوویەکیان دەداو لە دەوری سەعات (١٠)و نیودا لە هۆڵێکدا کۆدەبوونەوە، نزیکەی سەعاتێک بە کوردی و سەعاتێک بە تورکی، ئاپۆ موحازەرەی پێدەوتنەوە، پاشان نانی نیوەڕۆ دەخوراو دوای پشوویەک بەهەمان شێوە سەعات چوارو پێنج کۆدەبوونەوەو هەڵسەنگاندن بۆ چالاکییەکان دەکراو شێوازی ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتنیان پێڕەو دەکردو پاشان ئاپۆ موحازەرەی پێدەوتنەوە.

کۆبوونەوەکان لە شوێنێکدا بوو، لە دەرەوەی بارەگاکەی ئاپۆ، وەکو شانۆی ڕۆمانی دروستکرابوو، بۆئەوەی لە زستانیشدا بتوانرێت کۆبوونەوەی تێدا بکرێت سەری گیرابوو، جێگای هەزار کەسێکی تێدا دەبووەوە.

ئێمە پانزە ڕۆژێک لەوێ بووین، هەندێک ئێوارە لەو شانۆیە چالاکی تریش دەکرا، وەک شانۆگەریی و ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ و گۆرانی، هێندێک بابەتی کۆمێدیش پێشکەش دەکران، بەڵام نەمزانی ئەوانە بەهۆی ئەوەوە بوو ئێمە میوان بووین، یاخود کاتی تریش ئەو جۆرە چالاکییانەیان هەبوو.

بەدەوری ئەم هۆڵەدا چادر هەڵدرابوو، ژووری بچووک دروستکرابوون، ئەوە شوێنی گەریلاکان بوو، شوێنی کچان بەجیا بوو. بەدەوری ئەوانیشدا قوتەی پاس و چاودێریی دامەزرابوو، بە هەموو ئەم شوێنەشیان دەوت "ئەکادیمیای سەربازیی".

لەناو ئەوانەدا کە لەوێبوون، کەسانێکی زۆر هەبوون، دەرچووی زانکۆکانی ئەنقەرەو دیمەشق بوون، هەندێکیش لە ئۆروپاوە هاتبوون، زوربەشیان کوردی باکوورو ڕۆژئاوا بوون و کوردی پارچەکانی تریشیان تێدابوو. کەسانێک هەبوون لە ئازەربایجان و ڕوسیاو ئەرمینیاوە هاتبوون.

٥- لەگەڵ ئاپۆ.

وەک وتم یەکەمجار کە ئاپۆمان بینی، ئەو ڕۆژە بوو کە گەیشتین، دەمەو ئێوارەیەک بوو، هەر قسەی سەرپێی کرا، جاری دووەم کە لەگەڵمان دانیشت بەدرێژیی گفتوگۆ کرا.

سەرەتا ئاپۆ قسەی کرد، باسی پەکەکەی کرد کە لە چ بارودۆخێکدا دروست بووە، پاشان بەدرێژیی بیروبۆچوونی ڕێکخراوەکەی باسکرد. لێرەدا دەمەوێت بۆچوونەکانی لە چەند خاڵێکدا کورت بکەمەوە.

- خەبات دەکەین بۆ ڕزگارکردنی هەموو پارچەکانی کوردستان.
- پشت بە هێزو توانای تایبەتی خۆمان دەبەستین و بەم ڕێگایەش سەردەکەوین، نەک بە پشتیوانی وڵاتان.
- تورکیا ڕژێمێکی نەتەوەپەرستی فاشی سەربازییە، بۆیە ئێمەش دەبێت بە بیروباوەڕێکی بەهێزو دیسپلین و مەشقێکی سەربازیی توندەوە ڕووبەڕووی ببینەوە.
- باوەڕمان وایە هەر ناوچەیەک لە کوردستان، دەبێت لە ڕووی ئابوورییەوە پشت بە خۆی ببەستێت و سیسمی خۆبژێویی پێڕەو بکات.
- لای ئێمە بەرژەوەندیی تایبەت و موڵکداریتی تاکەکەسی نییە، پارەو مووچە نادەینە کەس و خەباتێکی

سۆشیالیستییانەی پەتی پێڕەو دەکەین.

سەبارەت بە ئەزموونی باشووریش وتی: "ئەوە دەرفەتێکی مێژوویی گرنگەو ئێمە بەهەموو توانایەکەوە پشتگیریی لێدەکەین و دەبێت ئێوەش ڕێگە نەدەن کڕین و فرۆشتنی پێوە بکرێت". هەروەها داواشی کرد کە ئێمە گەڕاینەوە، ئەم بیروباوەڕانە لەناو خەڵکدا بڵاوبکەینەوە، کۆبوونەوە بکەین و ڕێکخستن دروست بکەین.

ئێمە هەمووومان قسەمان کرد، ڕاوبۆچوونی خۆمان وت و پێشیان وتین ئازادین لەوەی چی دەڵێین. مومتاز حەیدەری قسەی کرد، تاریق جامبازو چالاک، کە کوڕێکی کۆنە شیوعی خوێندەوار بوو، حەکیمیش قسەی خۆیان کرد.

من لەو دانیشتنەدا وتارێکی درێژم دا، دوایی خۆیان بە کاسێت لە کوردستاندا بڵاویان کردەوەو کردیشیان بە سیدی، ئەو وتارە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو، بوو بەهۆی ناساندنی منیش لەناو پەکەکەدا.

لە وتارەکەدا بە درێژیی باسی مێژووی خەباتی باشوورم کرد هەتا ڕاپەڕین، باسی بارودۆخی نێودەوڵەتی و ناوچەیی و ئەزموونی نوێی هەرێمی کوردستانم کرد، کە دیاریش نییە بە کوێ دەگات, سەرسامیشم دەربڕی

بە بیروبۆچوونی پەکەکەو ئەم شێوازە ژیانە سەربازو فکرییەو بەو دیسپلینە کە نموونەیم لە ئەزموونی خەباتی باشووردا نەبینییەوە، لەبەرئەوەی لە قسەکردندا هێندێک وشەی کرمانجیم بەکاردەهێنا باشتر دەمتوانی مەبەستەکە بگەیەنم.

بەدرێژیی پانزە ڕۆژ کە لە بیقاع ماینەوە، هەموو بەیانی و ئێوارەیەک ئاپۆمان دەبینی، هەرجارە لەسەر چەند بابەتێک گفتوگۆمان دەکرد، بەڕاستی ژیانی ئاپۆ خۆی هەمووی گفتوگۆی فکری و باس و خواس بوو.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لەو ماوەیەدا، ئەوەبوو کە ئەو لە هۆڵی نانخواردنەکە لەگەڵ ئێمە نانی دەخوارد، خواردنی جیاوازی نەبوو، ئەو خەڵکە چی بخواردایە، ئەویش هەرئەوەی دەخوارد، تەنانەت بۆ ئێمەش خواردنی تایبەت نەبوو.

خواردن لە ئەکادیمیای سەربازیی جۆراوجۆر بوو، ڕۆژێک نیسک و ڕۆژێک برنج و جارجارە مریشک و گۆشتیش لە ژەمەکاندا هەبوو. ئەوان لەوێ جگە لەوەی ڕانەمەڕی خۆیان هەبوو، شوێنی بەخێوکردنی تایبەتی مریشکیشیان هەبوو.

لە ڕۆژی شانزەیەمدا ئاپۆ وتی: "پێنجوێنی، ئێوەی خەڵکی باشوور حەز بە خواردنەوە دەکەن"، وتم: "من نەک حەزی پێدەکەم، خۆم شەرابیش دروست دەکەم". وتی: "چۆن دروستی دەکەیت؟". وتم: "خۆمان ڕەزی ترێمان هەیە".

وتی: "لای ئێمە خواردنەوە یاساغە، هێندێک جار کە شیوعییەکانی ئێرە خواردنەوەم بۆ دێنن، پیان دەڵێم من بۆم نییە بخۆمەوە، بۆیە ئەرکی هێنانی ئەم جۆرە دیارییە مەکێشن".

یەکێکی بانگکرد وتی: "ئەم میوانانەم بۆ دەبەیت بۆ ماڵی فلان کەس لە حەڵەب". دوای ماڵئاواییکردن، هەر ئەو شەوە بردیانین بۆ حەڵەب، بۆ ماڵی (عومەر موختار). خانە خوێکەمان کە شێوەی لە سەدا سەد لە عومەر موختار دەچوو، دەوڵەمەندێکی بەناوبانگی حەڵەب بوو، کاتی خۆی کە ئاپۆ لە تورکیاوە ڕایکردبوو، ماوەیەکی زۆر لەوێ مابووەوەو لەوە وە ئاشنایەتی لەگەڵ پەکەکە پەیداکردبوو، جێگای متمانەی ئەوان و ئاپۆ بوو.

کابرا کوردێکی ساغ و دەوڵەمەندێکی دەستکراوە بوو، بردینیانە ڤێللایەکی گەورە لە دەوری حەڵەب، هەر لەوێ جلوبەرگی نوێی ژێرەوەیان داینێ و خۆمان شت و کەوتینە

خـواردنـەوە، خانەخوێکەشمان ئـەربـاب بـوو. دوو سێ شەوێکمان بە تێروپڕیی لەوێ گوزەراندو پاشان گەشتی ناو حەڵەبی پێکردین.

بۆ هێندێک ماڵی بردین، کە ناسیاوی خۆی بوون، ئەودەمە خەڵکی ئەوێ زۆر بە پەرۆش بوون بزانن لە باشوور چی دەگوزەرێت، لەگەڵ ڕۆشنبیراندا دانیشتنی بۆ ڕێکخستین، ئەوان بەو جۆرە کۆبوونەوانە دەڵێن (کۆبوونەوەی گەل).

پاش زنجیرەیەک کۆبوونەوە لەگەڵ چین و توێژی جیادا، گەڕاینەوە بۆ بیقاع، یەک دوو ڕۆژێک لەوێ ماینەوەو بردیانین بۆ دیمەشق.

لەگەڵ جۆرەها خەڵک کۆبووینەوە، من نەمزانیبوو کە نزیک دیمەشق دوو سێ دێ هەیە هەموویان کوردن و بە کرمانجی قسە دەکەن.

لەوێ پرسیم کە داخۆ ماڵی عەرەب لەناویاندا هەیە؟ وتیان: "تەنها یەک دووانێک هەیە". لەوێش کۆبوونەوەی بەسودمان کرد، تەنانەت لە مزگەوتەکان کۆبوونەوەمان دەکـرد، مـەلاو مەلاژنیش ئامادە دەبـوون. خەڵکی ئەوێ هەموو هەواداری پەکەکە بوون، بۆیە زۆریان پێخۆشبوو ئیمەیان دەبینی، بەتایبەت کە دەیانزانی میوانی ئاپۆین، پاشان لە قامیشلۆش چەند کۆبوونەوەیەکی هاوشێوەمان

کردو لە هەر دانیشتنێکدا بەپێی ئاستی رۆشنبیریی خەڵکەکە قسەمان دەکرد.

### ٦- لە رێگای گەڕانەوەدا.

گەشتەکەمان بیست رۆژێک زیاتری پێچوو، لەو ماوەیەدا لایەنگرانی پەکەکە لە هەولێر خۆپیشاندانیان کردبوو، (عەزیز ئاکرەیی)یش کە ببووە پەکەکە، پێشیان کەوتبوو، دەسەڵاتدارانی هەولێریش ترسابوون، کەوتبوونە خەڵک گرتن، چووبوونە سەرماڵی ئێمەو تالآنیان کردبوو، ئەوەی بردبوویان بردبوویان، ئەوی تر لە کەلوپەلی ماڵەکە هەموویان تێکشکاندبوو. لە ماڵەکەدا تەنها تەلەفزیۆنێکمان بە ساغی مابوو، ئەویش دراوسێیەکمان لەو هێزەی سەندبوو کە هێرشیان کردبووە سەر ماڵەکەمان، پاشان کاری راست بێت بۆی گەڕاندینەوە.

ماڵ و منداڵ بەناچاریی چووبوونە ماڵی چالاک سۆفی خزمم، کە گەڕاینەوە بەناچاریی ماوەیەک لە ماڵی چالاک ماینەوە تاوەکو بارودۆخ تۆزێک ئەهوەن بووەوە.

لەوەوبەر ماڵی خزمێکی خێزانەکەم کە خەڵکی بەسرا بوون، لە هەولێر ماڵێکیان کڕیبوو، بەو نیازەی بێنە کوردستان، لەبەرئەوەی ماڵی خۆمان هیچی تیا نەمابوو،

چووینە ئەوی. ئەودەمە کوڕو کچێکم لە زانکۆ خوێندکار بوون، دەبوو هەوڵی ژیانێکی ئاساییان بۆ بدەم، بۆیە لەو ماڵە تۆزێک بە خۆماندا هاتینەوە.

٧- پارتی ئازادی کوردستان.

هەرکە هاتمەوە، هەڤاڵانی پەکەکە لێم کۆبوونەوە، ئەو ماوەیە سەرقاڵی ئەوە بوون لە باشوور پارتێکی نوێ دروست بکەن، ئیتر هەوڵەکانمان بۆ ئەو مەبەستە چڕکردەوە

بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی دامەزراندندا لە هەولێر بە هەرکەسیان وتبوو، نەیوێرابوو بەشداریی بکات.

بەمەبەستی بەشداریی کۆنگرەکە دەبوو بچینە چیای (کۆڕەک)، لە (سۆران)ەوە بەڕێکەوتین بۆ ناوچەی (برادۆست)، لە (سیدەکان)ەوە هەڵزناین بەو شاخانەداو دەمەو بەیانێکی مانگی چوار بوو، گەیشتینە خواکورک، لەو وەرزەدا لەوێ هەر بەفرو سەرمابوو.

کە من گەیشتم، کۆنفرانسەکە دەستی پێکردبوو، لەڕاستیدا کەسم نەدەناسی، تەنها کەسێک لەوێ ناسیم، ئەو (ڕێبوار ڕەشید) بوو، کە خەڵکی سلێمانی بوو، دوایی بوو بە سەرۆکی کۆنگرەی نەتەوەیی.

ڕێبوار لە سویدەوە هاتبوو، دوو سێ کەسی تریش خۆیان پێناساندم، وتیان: "خەڵکی سلێمانین"، بەڵام ئەوانەی لەوێ بوون، هەموو منیان دەناسی، زۆریش ڕێزیان لێگرتم.

حەفتەیەک لە خواکورک مامەوە، ڕۆژێک پێش کۆتاییهاتنی کۆنگرەکە وتیان: "پێمان خۆشە تۆش ڕاوبۆچوونی خۆت بڵێیت و سەرنج و پێشنیاریشتمان گوێ لێبێت".

ئەوەی لەو چەند ڕۆژەی بەشداربوونم لە گفتوگۆکانی ناو کۆنگرەکە لێی تێگەیشتم، ئەم چەند خاڵە بوو:

• ئەوان دەیانوت بزووتنەوەی چەپ و سۆشیالیزم لە جیهاندا شکستی هێناوەو یەکێتیی شورەوی هەڵوەشاوەتەوەو لە زۆر وڵات و شوێنی تریشدا سۆشیالیزم لە پاشەکشەدایە، بۆیە پێویستە ئێمە لە چیاکانی کوردستانەوە ئەم بزووتنەوەیە زیندوو بکەینەوەو بە جیهاندا بڵاوی بکەینەوە، چونکە لە ئایندەدا تەنها ئەم بزووتنەوەیە سەردەکەوێت و پرۆلیتاریا دەسەڵات دەگرێتە دەست.

• ئەوان هەموو حزبە کوردستانییەکانیان بە کۆنەپارێزو ئاغاو دەرەبەگ و عەشایەر دەزانی، پێیان وابوو ئەو حزبانە خائینن، چونکە مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا دەکەن، بۆیە پێویستە هیچیان نەمێنن.

من ڕاوبۆچوونی خۆم لە چەند خاڵێکدا کورت کردەوە، کە بەمجۆرە بوو:

• کورد گەلێکە خاکەکەی داگیرکراوە، پێویستە خەبات بۆ ڕزگارکردنی بکات، هەر پارچەیەکی کوردستان بتوانێت خاکی خۆی ڕزگار بکات، دەبێت کوردی پارچەکانی تر، پشتیوان و هاوکاری بن.

• شۆڕشی پرۆلیتاریا لە کۆمەڵگایەکی وەک کوردستاندا سەرهەڵنادات، ئەمەیان خەیاڵە تۆ بتەوێت لەم شاخانەوە شۆڕشێکی پرۆلیتاریایی ڕابگەیەنیت و بە جیهاندا بڵاوببێتەوە.

پاشان بۆم باسکردن کە من هەموو تەمەنم لە خەبات و تێکۆشاندا بەسەر بردووە، مارکسی بووم، شیوعی بووم، بەڵام کەوتنی شورەوی و پاشەکشەی ئەم بیروبۆچوونانە هۆکاری خۆی هەیە، بۆیە ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لەم کۆمەڵگایانەدا، خەبات بۆ ڕزگاری کوردستان و دادوەریی کۆمەڵایەتی بکەین، وتیشم من ئەمە ڕێبازمەو بە نووسین و بە کردار هەوڵی بۆ دەدەم.

کوڕێک هەبوو ناوی (ماهیر وڵات) بوو، سەرەوکاری کۆنگرەکەی دەکردو پایەدارێکی گەورەی پەکەکە بوو، دواتر وازی هێناو چوو بۆ مۆسکۆ. ئەو ماهیرە هاتە لام

و لایەنگری بۆچوونەکانی من بوو، ڕۆژێک پێش ئەوەی کۆنگرەکە تەواو بێت، گفتوگۆیەکی درێژمان کرد.

وتم: "ئەوە ڕاست نییە کە ئێوە هەموو سەرکردایەتیی کوردو سەرۆک حزبەکان بە کۆنەپەرست و بەکرێگیراو سەیر دەکەن و پێتان وایە دەوڵەتانی داگیرکەر هەڵیاندەسوڕێنن و دەتانەوێت لەناویان ببەن و خۆتان جێیان بگرنەوە، بەو فەلسەفەیەش خۆتان باوەڕتان پێیەتی، حزب دروست بکەن، ئێوە پێویستە لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی نەتەوەیی هاوبەش مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا بکەن".

وتم: "ڕاستە خەڵکی خراپ هەیە، بەڵام کەسانی دڵسۆزو نیشتمانپەروەری وەکو من و تۆش هەیە".

پاشان بۆم باسکرد، کە نابێت پەکەکە لە باشوورو پارچەکانی تر فۆتۆکۆپی خۆی دروست بکات، چونکە هەر پارچەیەک تایبەتمەندیی خۆی هەیە. بۆ نموونە باشوور وەکو باکوور نییە، ڕۆژئاوا وەکو ڕۆژهەڵات نییە، هەر پارچەیەک تایبەتمەندی خۆی هەیە.

باسی ئەوەم بۆ کرد لە باشوور مەلا مستەفا خەباتی کردووە، پارتی دیموکراتی کوردستان هەیە، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەیە، کە جەلال تاڵەبانی سکرتێریەتی، ئەمانە ساڵانێکە خەباتیان کردووەو قوربانییان داوە، لەسەر

کورد ئەنفال کراون، کیمیاباران کراون، بەو حاڵەشەوە باشووریان پێ قوت نەدراوە، بۆیە بە پەکەکەش قوت نادرێت.

هەمان ئەم قسانەی بۆ ماهیرم کرد، لە ڕۆژگاری دواتردا بۆ عەبدوڵلا ئۆچالانم کردووە.

یادگارییەکە ئەوەیە، کە بە ئۆچالانم وت: "باشوور بە مەلا مستەفاو جەلال تاڵەبانی قوت نەدرا، بە تۆش قوت نادرێت"، بە پێکەنینەوە وتی: "ئێمە قوتی دەدەین"!

جارێکیش مام جەلال بانگی کردم بۆ کۆنفرانسێک لە ئوتێلی سەرچنار، لەوێ کە دانیشتین، بۆم گێڕایەوە کە بە عەبدوڵلا ئۆچالانم و وتووە: "باشوور لەسەر دەریایەک نەوتەو ئینگلیز چاوی لەسەریەتی، ململانێی ڕووس و ئەمریکای لەسەرە، ئەوەی بە مەلا مستەفاو جەلال تاڵەبانی قوت نەدرا، بە تۆش قوت نادرێت".

لە دوارۆژی کۆنگرەکەدا، ماهیر قسەی کردو هێندێک لەو بۆچوونانەی منیش لە قسەکانیدا ڕەنگیان دابووەوە.

حزبی ئازادی کوردستان دامەزرا، من هیچ بەرپرسیارێتییەکم تێیدا نەبوو، بەڵام هاوکاریان بووم. خەڵکم پێدەناساندن و پەیوەندیم بۆ دروست دەکردن و لەگەڵ توێژو چینی کۆمەڵایەتی جاجیادا، لە هەوڵدا بووم، بۆئەوەی خۆیان بەهێز بکەن.

لەگەڵ (ئـازاد حـاجۆ)و (دکـتۆر وەیـسـی)، کە خەڵکی باکوور یا رۆژئـاوا بـوون، هەروەها لەگەڵ دوو هەڤاڵی تریشدا چووینە شارباژێر، پێنجوێن، هەڵەبجە، دەربەندیخان و کەلار کۆبوونەوەم بۆ ڕێکدەخستن و ڕێگام نیشان دەدان و خەڵکم هاندەدا کە کاریان لەگەڵدا بکەن. ئەوەندە هاوکارو پشتیوانیان بووم، خەڵک وای دەزانـی من دامەزرێنەری حزبەکەم.

٨- سەردانی دووەمم بۆ لای ئاپۆ.

هێشتاماڵم هەر لە هەولێر بوو، دوایان لێکردم کە بچم بۆ لای سەرۆک ئاپۆ. ئەمجارە ویستم هێندێک نووسەرو هونەرمەند لەگەڵ خۆمدا ببەم، ئەوە بوو هەریەکە لە (تەها خەلیل)و (ئەحمەد سـالار) لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی تردا ئامادەبوون، لەبەرئەوەی لە فیشخاپور ڕێگەیان نەدا بپەڕینەوە، ئەوان گەڕانەوەو وتیان: "ئێمە بەڕێگەی قاچاخ نایەین".

من و (حەمە کەریم عارف و ڕەئوف عوسمان و ڕەئوف حەسەن) بە قاچاخ پەڕینەوە، بەهەمان ئەو ڕێوشوێنەدا کە جاری پێشوو پێی چووبووین بۆ بیقاع، چووینەوە.

کە گەیشتین بە قەرەباڵغییەکی زۆرەوە پێشوازییەکی

گەرممان لێکرا، عەبدوڵڵا ئۆچالان خۆی هات بە پیرمانەوەو بەبۆنەی گەیشتنی ئێمەوە کۆبوونەوەیەکی گەورە ڕێکخرابوو. مێزیان دانابوو، ئاڵا هەڵکرابوو، ئاپۆ بەگەرمی پێشوازیی لێکردین و منیش لەوێدا وتارێکم خوێندەوە.

تێیدا باسی ئەوەم کرد کە لەنێوان سەردانی یەکەممان و ئەم سەردانەدا بیروبۆچوونی پەکەکە لە باشووردا بڵاوبۆتەوەو گەشەی کردووە، باسی بارودۆخی خراپی ئابووری هەرێمم کردو وتیشم "ڕێگە نادەن چالاکی بکەین و ڕۆژنامە دەربکەین".

لەو ماوەیەدا کە لەوێ بووین، چەندین جار لەگەڵ ئاپۆدا دادەنیشتین، چەندین سەعات گفتوگۆمان دەکرد، بیرمە مانگەشەوێک بوو، ئەو چیایەی لە پشت بیقاعەوە بوو، لە قەندیل دەچوو، یادی بەخێر ڕەئوف حەسەن، لەگەڵ ئاپۆدا سەبارەت بە (کونی ڕەش)و (گازی ئۆزۆن) گفتوگۆیان دەکرد.

ئێمە هەموو کتێبەکانی خۆمان بۆ ئاپۆ هێنابوو، ڕەئوف حەسەنمان وا پێناساند، کە ئەم یەکەم کەسە بە کوردی کتێبی لەسەر (خەیاڵی زانستی) نووسیوە.

ڕەئوف حەسەن و حەمە کەریم عارف و ڕەئوف عوسمان، هەرسێکیان ڕۆشنبیرو نووسەری بەتوانا بوون،

بۆیە ئاپۆ چێژی لەو گفتوگۆیە وەردەگرت کە لە ئاستێکی بەرزدابوو.

ئیتر ماوەیەک لەوێ ماینەوە، بردیانین بۆ شوێنی تری لوبنان و سوریا، گەڕانێکی باشیان پێکردین.

لەو سەروبەندەدا لە دهۆک کادرێکی پەکەکە دەکوژرێت و ئاسایش دەکەوێتە وێزەی ئەوانەی هەواداری پەکەکەن، لە بەری باکووریشەوە لایەنگرانی پەکەکە ڕێگەی (برایم خەلیل) دەگرن، کە تاکە دەروازەی ئابووریی و گوزەرانی باشوورە.

کە ئێمە لە بیقاع بووین (سەرچڵ قەزاز)مان بینی بە نوێنەرایەتی مام جەلال هاتبوو بۆ لای ئۆچالان، بۆئەوەی ئەو کێشەیە چارەسەر بکات.

ڕێکەوتێکی باش بوو کە ئێمە وەک نوێنەری خەڵکی باشوور لە بیقاع بووین، ئێمەش قسەمان لەگەڵ ئاپۆ کردو ڕێکەوتین بەیاننامەیەک دەربکەین و بڵێین "شاندێک لە ڕۆشنبیرو نووسەرانی باشوور هاتوون بۆ لای ئاپۆ، داوایان لێکردووە دەروازەکە بکاتەوە"، خۆی وای وت. بەیانەکە من و حەمە کەریم عارف نووسیمان، ڕەئوف عوسمان چاکی کرد، ویستمان بە زمانێکی سیاسییانە کۆتایی بە کێشەکان بهێنن.

حەمە کەریم عارف و ڕەئوف عوسمان عەرەبیزانی بەسەلیقە بوون، منیش چەند خاڵێکم هۆنییەوەو ئیتر بە هیمەتی پیاوچاکان بەیاننامەکە نووسراو بڵاوکرایەوەو ناوی ئێمەشی لەسەر بوو.

ڕەئوف عوسمان و حەمە کەریم عارف لەبەر ئیشوکاری خۆیان دەبوو بگەڕێنەوە، بۆیە ئەوان پێش ئێمە کەوتن و ڕۆیشتنەوە، من و ڕەئوف حەسەن چەند ڕۆژێک لە بیقاع ماینەوە، دوایی بردیانین بۆ شام و لە دیمەشق لەماڵێک دایاننناین.

لەوەدەمەدا پارتی ئازادی کوردستان ناوبانگی لێرەش پەیداکربوو، ئەگەرچی من تەنها یارمەتیم دەدان، کەچی لێرە منیان بە سەرۆکی ئەو پارتە دەزانی.

کوڕێک ناوی (ئاری) بوو، بارزانی بوو، دوایی وازی هێنا سەرپەرشتی کاری پارتی ئازادی دەکرد لە دیمەشق، گلەیی و گازندەی دەکرد لەوەی ناتوانن و ڕێگایان نادەن چاپ و بڵاوکراوەو ڕۆژنامەیان هەبێت. دوو ژمارەمان ئامادەکرد، یەکەمیان دەرچوو، دووەمیان لەژێر چاپدا بوو، ئەوانیش دوایی دەیانهێنایەوە بۆ باشوور.

من و ڕەئوف کەوتینە نووسین، هەریەکەو چەندین بابەت و وتارمان دەنووسی، بە ناوی جیاجیاو لەسەر ئەدەب

و سیاسەت، لەوماوەیەدا لەوێ بووین بەو توانا کەمەی کە هەبوو بە تایپ و ڕۆنیۆ بڵاوکراوەیەکمان دەرکرد بە ناوی (ئازادی کوردستان) و تەنانەت بەیاننامەیەکیشمان بڵاوکردەوە دژی ئەو دەستدرێژییانەی لە دهۆک کرابوونە سەر هەوادارانی پەکەکە.

نزیکەی هەفتەیەک لەوماڵەدا بووین لە بەیانییەوە خەریکی نووسین بووین تا ئێوارە، نازانم ئێستا لە ئەرشیفدا وێنەیەکی ئەو ڕۆژنامەیە دەست دەکەوێت؟

لە فیشخاپور پەڕینەوە هەڤاڵانی ڕۆژئاوا سپاردیانین بە هەڤاڵانی خۆیان لە بەری باشوور، هاتینەوە ناوخاکی هەرێمی کوردستان، لە زاخۆ سواری ئۆتۆمبێل بووین بەرەو دهۆک.

لە ڕێگا دوو ئۆتۆمبێل کە یەکێکیان پیکابێکی پڕ لە چەکدار بوو، بە هۆڕن لێدان نیشتنە سەرمان و ڕایانگرتین. کە دابەزین یەکێکیان خەڵکی سلێمانی بوو، کەوتنە پشکنینی جانتاکانمان، جانتاکەی ڕەئوف حەسەن هەمووی وێنەی ئاپۆو ئاڵای پەکەکەو بڵاوکراوەو کتێب و ئەدەبیاتی پەکەکە بوو. ڕەئوف تورە بوو، زۆر لە ڕەفتاری چەکدارەکان پەست بوو، وتی: "کاکە چییە ئێوە وەکو مولازم موحسین مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن"، یەکێک لە چەکدارەکان منی

ناسییەوەو منیش وتم: "کاکە ئەوە ڕەئوف حەسەنەو چیرۆکنووسی گەورەی کوردە"، ئیتر لە بەینی خۆیاندا بەیەکدا هاتن و کەوتنە قرەقرو ئێمەیان مەرەخەس کردو هاتینەوە هەولێر.

لەگەڵ ڕەئوف بەرەومالەوە ڕۆیشتین، کە گەیشتین چی ببینم، ئەو ماڵەی وردە وردە دروستمان کردبووەوە، جارێکی تر تالان کراوەو شڕوشیتاڵمان هاتۆتە دەرەوە. بە نیگەرانییەوە ڕەئوفم ڕەوانەی سلێمانی کردو خۆشم کەوتمە سۆراغی ماڵ و منداڵ "بڵێی کەوتبنە کوێوە"؟

ماڵ و منداڵم دۆزییەوە، بەڕاستی کەوتنە سەرزەنشتم، کوڕو کچەکەم لە دەوامی زانکۆ دابڕابوون، خێزانەکەم وتی: "تا کەی ئەم ژیانەی ئێمە بەهۆی تۆوە ئاوا بەردەوام دەبێت، ئەم ماڵوێرانی و ڕاکەڕاکە تا کەی؟!".

نەمدەزانی چی بڵێم، قسەکانیان هەمووی ڕاست بوون.

## ٩- شەڕی براکان.

خێزانەکەم لە تێکۆشەرە دێرینەکانی حزبی شیوعی بوو، لە مێژووی ئەو حزبەدا شوێن و پێگەی هەبوو، کاک قادر عەزیز گوێی لێدەگرت. ڕۆژێک وتیان: "قادر عەزیز سکرتێری حزبی شیوعی دێت بۆ ماڵتان". وتی: "دەمەوێت

بەڕاستی پێت بڵێم، لێرە بمێنیتەوە دەتکوژن، هەرچی چالاکی پەکەکە هەیە لە باشوور خراوەتە ملی تۆ، ئێمە زۆر بەرگریمان لێکردوویت، ڕەنگە کەسانی تر ئەو ئیشانە بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ ناسراویت هەمووی خراوەتە ملی تۆ، جا ئیتر چی دەکەیت بیکەو من ڕاستیم پێوتی".

هاتم بەرەو سلێمانی، لەو سەروبەندەدا (عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی) شەهید کرابوو، لە سلێمانی ڕۆمەڵغەزابوو، خۆپیشاندان بوو، بۆ بەردەم بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان، (پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و کەمال شاڵی) لە پێشەوەی خۆپێشاندەراندا بوون، منیان بانگکردو وتیان: "چۆن دەبێت تۆ بەشدار نەبیت؟"

کە چوومە ڕیزەوە، عیزەدین وتی: "بەیانی لە پەرلەمان کۆبوونەوەیەو بڕیاری شەڕی پەکەکە دەدرێت، تاوانبارترین کەسیش لەسەر پەکەکە لە کوردستانی باشووردا تۆیت، جا ئیتر ئاگات لە خۆت بێت".

لەوان جیابوومەوەو سواری تەکسییەک بووم بۆ ماڵی (دارای حاجی برایمی چەرمەگا) لە سەرچنار، تێم گەیاند، ئەوە حاڵ و وەزعەکەمە، وتی: "لێرەبەو منەتت بە کەس نەبێت و پیاوم دەوێت توخنت بکەوێت".

لەو ماوەیەدا کە لە ماڵی دارا بووم، دوو کەس دەیانزانی و سەرچاوەی ئاڵوگۆڕی زانیاریش بوون، یەکێکیان (مولازم عومەری حاجی عەبدوڵڵا)، کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بوو، ئەوی تریشیان (مولازم کەریم)، کە سەرکردەی پاسۆک بوو، دوایی بوو بە پارتی و شەهید بوو.

مولازم کەریمم دەمێک بوو دەناسی، زۆر ڕێزی منی لابوو، ئەوان لە پاسۆک ئامێری بێ تەلی خۆیان هەبوو، لە ڕێی ئەوەوە پەیوەندیم لەگەڵ برادەرانی پەکەکە هەبوو.

دارای حاجی برایمی چەرمەگا، کەسێکی خاوەن پێگەی کۆمەڵایەتی بوو، ماڵەکەی پاسەوانی تایبەتی خۆی هەبوو، زۆربەی بەرپرسەکانیش سەردانیان دەکرد، جگە لە مولازم کەریم و مولازم عومەر، مەحمود سەنگاوی و حامیدی حاجی غالی و مام ڕۆستەم سەردانیان دەکرد.

هێندێک جار کە ئەوان دەهاتن، من خۆم پیشان نەدەدان، هەندێک جاریش تووش دەبووم، لەگەڵیان دادەنیشتم، بەڵام ئەوان لەبەر دارا، هیچیان لەگەڵ من پێ نەدەکرا.

لە دانیشتنێکدا باسی شەڕی (پشت ئاشان) دەکرا، مام ڕۆستەم باسی کەسێکی عەینەک لە چاوی کرد، کە چۆن ئەم یەک سەڵییەی کلاشینکۆفی پێوەناوە، من خەریک بوو

بدەمە پرمەی گریان، نەک لەبەر کابرای شیوعی، بەڵکو لەبەر ئەو ئەقڵییەتە، حامی حاجی غالی هەڵیدایەو وتی: "کورە ڕۆستەم، حەمەمین پێنجوێنی سبەینێ ئەم قسانە دەکات بە شیعرو حەیامان دەبات".

ڕۆژێک مولازم عومەر هات بۆ ماڵی دارا، وتم: "دەمەوێت کاک نەوشیروان ببینم"، وتی: "تۆ خۆت شاردۆتەوە نەتگرن، پارتی و یەکێتی بەشوێنتا دەگەڕێن، ئێستا چۆن دەچیت بۆ لای نەوشیروان؟ پاشان ئەو ماوەیەکە دانیشتووەو تەنانەت ناشچێتە کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسییەوە"... وتم: "کاکە تۆ خەمت نەبێت، من لەگەڵ کاک نەوشیرواندا شتی تایبەتمان هەیە، پێی بڵێ دەمەوێت بیبینم و هەقت نەبێت".

لەدوای ڕۆژێک مولازم عومەر هات بە شوێنمدا بۆ ماڵی داراو بردمی بۆ ماڵی کاک نەوشیروان، وتی: "بۆچی خۆت شاردۆتەوە"؟ منیش بە پێکەنینەوە وتم: "لەترسی تۆ".

باسی بارودۆخەمان کرد، وتم: "خۆت دەزانی پارتی و یەکێتی بڕیاری شەڕکردنیان داوە لەگەڵ پەکەکە، منیش هاتووم هیمەتێک بکەیت و نەهێڵیت خوێن بڕژێت".

کاک نەوشیروان وتی: "من ئێستا دانیشتووم و هەقی هیچ شتێکم نییەو ڕەخنەی زۆریشم لە برادەرانی پەکەکە هەیە، بەڵام دژی شەڕم و نامەوێت خوێنی کورد بڕژێت

و لەنێوان باشوورو باکووردا دوژمنایەتی دروست ببێت، بۆیە هەرچیم پێ بکرێت دەیکەم، بەڵام تۆ دەتوانیت چی بکەیت؟!"

وتم: "من دەتوانم پەیامی خۆم بگەیەنمە عەبدوڵلا ئۆچالان و وەڵامەکەشی بدەمەوە دەست تۆ". وتی: "باشە، من بەیانی زوو دەچم بۆ هەولێر بۆ ئەو مەبەستەو بزانم چیم پێدەکرێت".

هەر ئەو شەوە کچێک هەبوو ناوی (دیلان) بوو، کوردی ڕۆژئاوا بوو، عەرەبیشی باش دەزانی و فێری نووسینی خۆشمان ببوو، نامەیەکم نووسی و دامێ، وتم: "بینێرە بۆ عەبدوڵلا ئۆچالان و وێنەیەکیشی بدە بە برادەران لە خواکورک".

ئەوکاتە پارتی ئازادی کوردستان ئامێرێکی بێتەلی ڕاکاڵیان هەبوو، ڕۆژانەش لەگەڵ مندا لە پەیوەندیدا بوون.

بۆ بەیانی عەبدوڵلا ئۆچالان وەڵامی نامەکەی دامەوەو دەڵێت: "مادام تۆ ئەم دەسپێشخەرییەت کردووە، نوێنەری من بەو باوەڕم بە کاک نەوشیروانیش هەیە، داوای چی لە ئێمە دەکەن، جێبەجێی دەکەین".

کە نامەکەم پیشانی کاک نەوشیروان دا، سەری سوڕماو وتی: "چۆن ئەمەت کردووە، پاشان بە پێکەنینەوە وتی:

ڕاست دەکەن دەڵێن حەمەمین پێنجوێنی سەری مارەکەیە، سەری مارەکە نەبێت، ئەمەت چۆن پێدەکرێت؟" دەستێکی دا بە پشتمداو وتی: "دانیشە با قاوەیەک بخۆینەوەو تۆزێکم مێشکم ئیسراحەت بکات".

کاک نەوشیروان وتی: "مادام تۆ ئاوا دەستوبرد ئەم کارەت کرد، منیش بەیانی دەچم بۆ هەولێر، مام جەلال و کاک مەسعود دەبینم، کۆبوونەوەی پەرلەمانیش هەیە لەسەر ئەو بابەتە". پرسیاری ڕێوشوێنمی کرد، وتم: "لە ماڵی دارام". یەکسەر تەلەفۆنی کرد بۆ داراو وتی: "ئاگاداری حەمەمین بەو هەرچیشت پێویست بوو، ژمارەکەی منت لایە، ئاگادارم بکە، پێشم وتووە لای من بمێنێتەوە، خۆی دەڵێت دەچمەوە ماڵی دارا".

کاک نەوشیروان چوو بۆ هەولێر، ڕۆژی دواتر هاتەوە، وتی: "قسەم لەگەڵ مام جەلال و کاک مەسعود کردووەو کۆبوونەوەکەی پەرلەمانیشم دواخستووە، وتیان بڕۆ قسە لەگەڵ یەکەکە بکە، بەڵکو کار نەگاتە خوێنڕشتن".

لە سلێمانی دوو کادری یەکەکە هەبوون، لەگەڵ پارتی ئازادی کوردستان کاریان دەکرد، ئەوانم لەگەڵ خۆم بردو چووین بۆ ماڵی کاک نەوشیروان. بە سێ ئۆتۆمبێلی جۆری لاندکرۆزەر بەڕێکەوتین، کاک نەوشیروان، حامیدی حاجی

غالی و شێخ جەعفەرو مەحمود سەنگاوی و مام ڕۆستەمی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

من و کاک نەوشیروان و شێخ جەعفەرو حامیدی حاجی غالی لە ئۆتۆمبێلێکدا بووین کە شۆفێرێک لێی دەخوڕی.

بەڕێکەوتین بەرەو سیدەکان، پێش ئەوەی بگەین، دێیەک هەیە پێی دەڵێن (مجێسەر) ماڵ و دیوەخانی (کەریم خانی برادۆست) لەوێیە، کە گەیشتین چی ببینم؟

هەرکەس دەنکە جۆیەکی پاشای خواردبێت لەوێ بوو، جگە لە بەرپرسەکانی یەکێتی، لە پارتی (عوسمانی قالەمنەوەرو حەمید ئەفەندی و عەبدوڵڵا ئاغا)، کاک نەوشیروان وتی: "من نەخۆشی پشت ئێشەم هەیە، ناتوانم بەو شاخانەدا سەرکەوم، حامیدو ڕۆستەم لەگەڵ خۆتا ببە، حەز دەکەیت با عوسمانیشتان لەگەڵ بێت، ئەو ڕێگا سەختە بە قسەی خۆش ببەنە سەر"، عوسمانی قالەمنەوەر وتی: "ئەم هەڤاڵانەی پەکەکە ئەوەندە وشکن بە نووکتەو قسەی منیش پێناکەنن، بۆیە با من نەچم".

هێزێکی زۆری یەکێتی و پارتی لە مجێسەر کۆکرابووەوە. من و (مام تاریق، کە شێخ تاریق نورییان پێدەوت، لەگەڵ حامیدو ڕۆستەم و ئازاد حاجۆو دکتۆر وەیسی)، کە ئەمان خۆیان پەکەکە بوون، بەڕێکەوتین بۆ خواکوڕک. تا ڕێگای

ئۆتۆمبێل هەبوو، بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشتین، دوای ئەوە دەبوو بەو چیا سەختانەدا هەڵبگەڕێین.

بەپێ زۆر ڕۆشتین، ڕێگاکە شاخاویی و سەخت و تاقەتپڕووکێن بوو، گەیشتینە شوێنێک کانی و ئاوێک بوو، حامیدی حاجی غالی و مام ڕۆستەم وتیان: "ئێمە ئیتر ناتوانین بەو ڕێگا سەختەدا سەرکەوین"، منیش پێم وتن: "کاکە ئێوە پێشمەرگایەتیتان کردووە، چۆن دەبێت نەتوانن بە شاخدا سەرکەون؟" وتیان: "کاکە ئێمە بووین بە شاریی"، بوو بە پێکەنین و ئەوانمان لەوێدا بەجێهێشت و ئێمە ڕۆیشتین.

ئێمە دوا نیوەڕۆ بوو کە لە مجێسەر دەرچووبووین، بۆیە لە ڕێگا شەومان بەسەردا هات و بۆ بەرەبەیان گەیشتینە ئەو شوێنەی کە بارەگای سەرەکی پەکەکەیە.

ئەودەمە مانگی (١٠) بوو، ئەم ناوچەیەش کوێستان بوو، تاریک و ڕوون بوو، کەسێکم بینی لە چەمەکەدا خۆی دەشت، لەشی سور هەڵگەڕابوو، کە چوومە پێشەوە سەیر دەکەم (عەزیز ئاکرەیی)ەو وتی: "ها پێنجوێنی شەڕت هێناوە، یان سوڵح؟".

گەریلاکانی ئەوێ، ئازاد حاجۆو دکتۆر وەیسییان دەناسی، ئیتر بردیانین بۆ شوێنەکەی (عوسمان ئۆچالان)،

کە گەیشتین خۆرهەڵاتبوو، لەوێ عوسمان ئۆچالان پێشوازیی لێکردین و جگە لە (ماهیر وڵات) چوار کەسی تریش لەوێ بوون، کە دیاربوو فەرماندەی پەکەکە بوون، لەوێ نانی بەیانیمان خوارد.

ئەم بارەگایە دەکەوتە بناری یەکێک لە چیاکانی خواکورک، کە ناوی (شاکێوە) لەوێ کۆبوونەوەمان لەسەر بارودۆخەکە کردو وتم: "کاک نەوشیروان خۆشی هاتووە، بەڵام لەبەر پشتی نەیتوانیوە بێتە ئێرەو لە مجێسەرە، حامیدی حاجی غالی و مام ڕۆستەمیشم لەگەڵە، کە ئەوان ئامادەن وەک بارمتە لێرەبن، تاخۆت بێیت و قسە لەگەڵ کاک نەوشیروان بکەیت، باسی نامەکەی ئاپۆم بۆ کردن، وتیان: "ئێمەش ئاگادار کراوینەتەوە".

وتم: "ئێمە نوێنەرایەتی هەرێمی کوردستان و هەردوو مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان دەکەین، ئەوان داوای ئەوە دەکەن، کە پەکەکە لەسەر سنووری تورکیاو ئێراق، لە هەرێمی کوردستانەوە هێرش نەکاتە سەر تورکیا، لە خواکوڕکەوە بچێتە شوێنێکی ترو ڕەنگە تیمی تیڤی تورکیاش بێت وێنەی ئەم ناوچانە بگرن کە پەکەکەی لێ نییە".

عوسمان هەڵوێستی دۆستانە بوو، وتی: "ئەوە هەر کێشە

نییە، کوردستان هەمووی شاخ و دۆڵە، لێرە لادەچین و دەچینە شوێنێکی ترو دەشچین کاک نەوشیروان دەبینین".

لەدوای ئەم کۆبوونەوەیە بەڕێکەوتین بۆ ئەو شوێنەی کە حامیدی حاجی غالی و مام ڕۆستەممان لێ بەجێهێشتبوو، کە گەیشتین، ئەوانیش هەمان ئەو قسانەی ئێمەیان کردەوە بۆ عوسمان ئۆچالان.

ڕێکەوتین کاک نەوشیروان بێتە گوندی (لیلکان)، کە نزیکی مجێسەرە، لەوێ لەگەڵ عوسمان ئۆچالان کۆببێتەوە.

زەردەی بەیان بوو، تاریک و ڕوون خەریک بوو لێک جیادەبوونەوە، لە گەرمەی گفتوگۆدا بووین، تەقوتۆق دەستی پێکرد، لەناو ئەو شاخانەدا دەنگی تەقەو دەستڕێژ، هەزار جار ڕەقتر پەردەی گوێچکەی دەدڕاند، هەموو سەرمان سوڕما، "ئێمە شاندی ئاشتین و ئەی ئەم تەقەو ڕەقەیە چییە؟!"

عوسمان ئۆچالان وتی: "تازە ناکرێت ئێمە بێین، بکەوینە بۆسەوە دەکوژرێین، بڕۆنەوەو بە کاک نەوشیروان بڵێن بڕیارِ نەبوو شەڕ ڕووبدات، بزانن بارودۆخەکە چییە؟"

ئێمە گەڕاینەوە نەمدەزانی لە سەنگەرەکانی پێشەوە چی ڕوودەدات، بەڵام هێزەکانی پەکەکەمان دەبینی کە ئیدارییەکان و بریندارو خەڵکی تر پاشەکشە دەکەن و هێزە

شەڕکەرەکان شوێنی ئەوان دەگرنەوە.

گەیشتینەوە لای ئوتۆمبێلەکانمان، شوێنەکەمان سەخت بوو، بە سواری وڵاخ بەرەو پێشەوە چووین، چواردەورمان ئاگرباران بوو، لە ئاسمانیشەوە فڕۆکەی تورکی بۆردوومانی دەکرد.

بارودۆخەکە بەشێوەیەک بوو، هەرباسی مەکە، بیرمە حامیدی حاجی غالی وتی: "حەمەمین پێنجوێنی هەموو عومرمان بە پێشمەرگایەتییەوە بەسەربرد، تۆ چاک حیزانە بەکوشتت داین".

مەبەستی ئەوەبوو لەناو ئەم ئاگربارانەدا چەکی پێ نییە، چونکە کە ئێمە ڕۆیشتین هەموو چەکەکانیان دانابوو.

با ئەوەشم بیر نەچێت، کاتێک بەناو ئەو تەق و تۆقەدا دەگەڕاینەوە، ژنێکی ڕۆژنامەنووسی ئەمریکاییمان بینی وتی: "ئێوە چی دەکەن لەم ناوە؟" وتمان: "ئێمە هاتووین بۆ نێوەندگیریی"، بە چاوی پڕفرمێسکەوە بۆ حاڵی کورد دەگریاو هێندێک قسەی کردو سەرزەنشتی کردین، هەر ئەوە نەبوو تفێکمان تێ بکات، دوایی ئەو ژنەم لە ئەمریکا بینییەوە کە ناسیمییەوە باوەشی پیاکردم.

کە گەیشتینە لێژاییەک، دوو ئۆتۆمبێلمان بینی ئاڵایەکی سپییان هەڵکردبوو، بەرەوپیریان چووین وتیان: "ئێمە کاک نەوشیروان ناردووینی"، سواری ئۆتۆمبێلەکان بووین و

ئەمە هەر ئاگربارانیشە، تا گەیشتینە لیلکان، لەوێ کە دوا بارەگای پەکەکە بوو، لەگەڵ عوسمان ئۆچالان بەبێ سیم قسەمان کرد.

عوسمان وتی: "خۆتان دەرباز بکەن و بگەنەوە لای کاک نەوشیروان، هەرشتێکی نوێ ڕوویدا پێم بڵێن".

ئاگربارانێک بوو هەر مەپرسە، لەڕێگا دەمانبینی یەکێتی و پارتی بە پاس پێشمەرگەیان دەهێنا بۆ سەنگەرەکان، بەناو بۆنی بارووت و تەق و تۆقی تفەنگدا گەیشتینەوە مجێسەر، کە کاک نەوشیروانی لێبوو.

ئێمە زۆرهیلاک بووین، شەو و ڕۆژێک بوو بەو کێوانەوە بووین، پشوومان داو ئیسراحەتی تەواومان کرد، (حەمە تۆفیق ڕەحیم و مامۆستا چەتۆ) هاتبوون بۆ لای کاک نەوشیروان، یەکی نامەیەکیان پێبوو، هی مام جەلال و کاک مەسعود بوو، ناوەڕۆکەکەی دەڵێت: "تۆ بگەڕێرەوەو بەیانی پەرلەمان کۆدەبێتەوە بڕیار لەسەر ئەم پرسە دەدات"، کاک نەوشیروان نامەکانی پیشانی من داو زۆر پەست بوو.

لەداخا نانم بۆ نەخورا، چوومە دەرەوە چەند کەسێک بەدوامەوە بوون، کاک نەوشیروان وتی: "ئەمجارە کە چوویتە دەرەوە، ئاگادارم بکەرەوە"، هەستم کرد شتێک هەیە.

شەڕ دەستی پێکردو هەوڵەکەی ئێمە سەرکەوتوو نەبوو، شەو تا بەیانی خەومان لێ نەکەوت.

کاک نەوشیروان تووڕەو غەمبار بوو، وتی: "پێم ناخۆش بوو کە کارەکە وای لێهات، بە منیان وتووە تا ئێوە نەیەنەوە شەڕ دەست پێ ناکات".

قسەی توندتریشی کردو ناهەقیشی نەبوو، وتی: "ئێستا چی بکەین؟" من وتم: "بەیاننامەیەک دەربکەو بڵێ ئێمە لەگەڵ فلان و فلاندا لە هەوڵی ئاشتیدا بووین و کەسیش تۆمەتبار مەکە". وتی: "بەیان دەرناکەم، چونکە مام جەلال عاجز دەبێت و وەڵامم دەداتەوەو منیش وەڵامی دەدەمەوەو یەکێتی دەبێت بە دوو بەشەوەو ئەوەش لە بەرژەوەندیی پارتییە".

سواری ئۆتۆمبێل بووین و لە مجێسەرەوە بۆ هەولێر، لە بینای مەکتەبی سیاسی یەکێتی دابەزین، کاک نەشیروان تەلەفۆنێکی کردو وتی: "تۆ لێرە بمێنەرەوە نەچیتە دەرەوە، ئێستا کاک مەسعودو مام جەلال لە کۆبوونەوەدان دەچم بۆ لایان، لێرە بە تا دەگەڕێمەوە".

دوای چوار سەعاتێک کاک نەشیروان گەڕایەوە، زۆر تورە بوو، ئەوی بەدەمیدا هات دەیوت، وتی: "کار لەکار ترازاوەو فرۆشتوویانە، سواربە با بڕۆینەوە بۆ سلێمانی،

فرۆشراوەو عەرەبوونەکەشی وەرگیراوە".

شۆفێرێک ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی، کاک نەوشیروان لە پێشەوە دانیشتبوو، منیش لە دواوە، هەر هەرسێکمان بووین و حامیدی حاجی غالی و مام ڕۆستەم لە ئۆتۆمبێلی تردا بوون، مەحمود سەنگاویش ئۆتۆمبێل و هێزی خۆی لەگەڵدا بوو.

گەیشتینەوە سلێمانی و لە ماڵی براکەم دابەزیم و شەو لەوێ مامەوە، بەیانی کە چوومە دەرەوە، لای چایخانەی شەعب هەستم کرد دووان سیانێک بەدوامەوەن، خۆم کرد بە پێچی کۆڵانەکەداو دوایی هاتمەوە سەر جادەو تەکسییەکم گرت و گەڕامەوە ماڵی دارا.

دەمویست ئاگاداری دەنگوباسی شەڕەکە بم، هەڤاڵەکانی پارتی ئازادی هاتن بۆ لام، تیپێکی هونەریشیان هەبوو لە شەقامی پیرەمێرد وتیان: "حەملەی گرتن دەستی پێکردووە". وتم: "هەموو کچەکان بێنن بۆ ماڵی داراو کوڕەکانیش خۆتان مشوری خۆتان بخۆن".

بەیانی هاتنەوەو دوانزە کچیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، کە دارا هاتەوە ئەم هەموو کچەی لە ماڵەکەیدا بینی، وتی: "ڕێوی خۆی نەدەچوو بە کوندا، هەژگی لە کلکیشی دەبەست. ئەمانەت لە کوێوە هێناوە ماڵ ئاوەدان".

یەکێک لە کچەکان زۆر جوان و شۆخ وشەنگ و خوێندەواریش بوو، ماڵی دارا چەکی لێبوو، وتی: "دەتوانم دەستکاریی ئەو بیکەیسییە بکەم"، وتمان: "بۆچی"؟ وتی: "من شارەزای ئەو چەکەم"، دەرکەوت کە شارەزاییەکی زۆری هەیە.

دارا بیست سی پاسەوانی هەبوو، لەمەولا ئەوکچە شۆخە لە سەربان لەسەر بیکەیسی بوو، شەوان پاسەوانیی دەکرد.

کە لە ماڵی دارا بووم مولاز عومەر سەردانی ئەوێی دەکردو زۆریش نیگەران بوو لەو شەڕی براکوژییە، لەسەر ئەوەش هەڵوێستی وەرگرتبوو و وازی لە کاری حزبی هێنابوو، وتیشی: "زۆربەی سەرکردەکانی یەکێتیش ئەم شەڕەیان پێخۆش نییە". دوایی بیستمەوە کە بێگومان لای پارتیش زۆر بوون ئەوانەی دژی شەڕەکە بوون، بەتایبەتیش "فەلەکەدین کاکەیی".

جگە لە مولازم عومەر، مولازم کەریمی پاسۆکیش سەردانی دارای دەکرد، من لە ڕێگەی ئەوانەوە دەنگوباسی شەڕەکەم دەزانی.

لەو ماوەیەدا دوو کچی پەکەکە لەلایەن ئاسایشەوە گیرابوون، ئەوسا "فایەقە ڕەش" بەرپرسی ئاسایشی

سلێمانی بوو، مولازم عومەر هەوڵێکی جوامێرانەی دا بۆئەوەی ئاگایان لێیان بێت، دوای دوو ڕۆژیش لە زیندان دەریهێنان و هاتن بۆ ماڵی دارا.

لەو ماوەیەدا من پەیوەندیم لەگەڵ بیقاع دابڕابوو، دەبوو بە هەر شێوەیەک بێت پەیوەندی دروست بکەم. ئامێری بێتەلەکەی پارتی ئازادی کوردستان لەلایەن ئاسایشەوە دەستی بەسەردا گیراو پەیوەندیم بە بیقاعەوە نەما.

کچێک هەبوو ناوی (دیلان) بوو، کوردی باکوور بوو، بەڵام لە ئوستورالیا خوێندنی تەواو کردبوو، پەیامنێری (بی بی سی) بوو، بۆ ڕادیۆی ئوستورالیاش ئیشی دەکرد، کاتی خۆی لە بیقاع ببوو بە ئاشنای من و دۆستی پەکەکەش بوو. بە دارام وت: "یەکێک لە کوڕەکان بنێرە بە هەرشێوەیەک بووە ئەو کچەم بۆ بدۆزێتەوە"، وتم: "یەکێکیش بنێرە یەک دوو وشەی ئینگلیزی بزانێت". لە ئوتێلێک بوو لە سلێمانی، کە هات وتم: "هەرجارێک کە دێیت بۆ ئێرە لە شوێنێکی جیاوە تەلەفۆن بکە بۆ ماڵی دارا، نەک لەو ئوتێلەوە کە لێی دابەزیویت".

تەلەفۆنم کرد بۆ "حەمە شوان ڕەسوڵ"، کە ئەودەمە بەرپرسی حزبی شیوعی بوو لە سلێمانی، تەلەفۆنی نۆرماڵ هەبوو، حەمە شوان کە ناسیمییەوە، بە دەنگی نزم قسەی

دەکرد وەک ئەوەی لە ژێرزەمیندا بێت وتم: "کاکە تۆزێک دەنگ هەڵبڕە، خۆ ئەگەر دەنگەکەمان تۆمار بکەن، تۆ دەنگت نزم بێت، یان بەرز هەر تۆماری دەکەن". داوام لێکرد کە کچێکی ئینگلیز دەنێرم بۆ لات و جفرەیەکی پێیە، دەمەوێت لە ڕێگەی بێتەلەکەی ئێوەوە پەیوەندی لەگەڵ بیقاع بکەم. حەمە شوان وتی: "کاکە ئەو کارە زۆر قورسە، بەڵکو قسە لەگەڵ مەلا ئەحمەد بانی خێلانی بکەیت"، وتم: "کاکە قسەی لەگەڵ دەکەم، بەڵام ئێستا ئەو کچە دەنێرم بۆ لات". دیلانم نارد بۆ لای حەمە شوان، کە بینیبووی، وتبووی: "دوێنێ تۆ هاتی بۆ لای ئێمە ئینگلیز بوویت و پەیامنێری بی بی سی بوویت، کەچی ئەمڕۆ کوردیت و پەکەکە دەرچوویت!" حەمە شوان ڕۆڵێکی جوامێرانەی گێڕا.

من جفرەکەم دابوو بەو کچەو پێم وت: "پەیامەکانم بگەیەنە بە خواکورک و بیقاع".

ڕۆژێکیان ڕەئوف حەسەن هات بۆماڵی دارا، وتی: "وەزعەکە زۆر خراپەو هەرکەسێک بۆنی پەکەکەی لێبێت لە سلێمانی دەیگرن".

هەر ئەو ڕۆژە دیلان هاتەوەو وتی: "پەیامی تۆم گەیاندووە بە بیقاع و زۆر لایان گرنگ بووە تۆ توانیوتە ئەم پەیوەندییە نوێیە دروست بکەیت، پەیامی سەرۆک ئاپۆش

ئەوەیە کە تۆ ئاگات لە خۆت بێت".

ئیتر من لە ڕێگای ئەو کەناڵەوە ئاگام لە دەنگوباسی شەڕ بوو.

ڕۆژێکیان دیلان هات و وتم: "دواهەواڵم بەرێ". وتی: "شەڕ دەوەستێت". وتم: "چۆن دەزانیت؟" وتی: "پەیوەندیم لەگەڵ بیقاع کردووە، سەرۆک ئاپۆ حافز ئەسەدی بینیوەو حافز ئەسەدیش داوای لە مام جەلال کردووە شەڕ بوەستێت، لەم ڕۆژانەشدا کاک مەسعود دەچێت بۆ سوریاو حافز ئەسەد دەبینێت و هەموو شت بەرەو باشی دەچێت".

ڕۆژێک حەمە شوان هات بۆ ماڵی دارا، وتی: "من سەفەری ئۆروپا دەکەم، با ئیتر ئەو کچەی ئێوە نەیەت".

لەو ماوەیەدا کە شەڕ بوو، من بەنهێنی سەردانی زۆر کەسایەتی سلێمانیم کردو هێندێک جار ڕەئوف حەسەنیشم لەگەڵدا بوو، بۆئەوەی لۆبییەک دروست بکەین بۆ وەستانی شەڕەکە.

لەو ماوەیەشدا ڕادیۆیەکی حزبی شیوعی هەبوو، کە "مەحمودی حاجی ڕەحیمی هەڵەبجەیی" سەرپەرشتی دەکرد، ئەویش کاری چاکی کرد، کە ڕۆشنبیرانی میوانداریی دەکردو دژی شەڕەکە قسەیان دەکرد.

ئیتر کاک کۆسرەت و عوسمان ئۆچالان بە ئامێری بێتەل ڕێکەوتبوون لە هەردوو لاوە تەقە ڕابگیرێت و هێرش نەکەنە سەر یەکتر.

من هەر لە ماڵی دارا بووم، ڕۆژێک دارا وتی: "مام جەلال تەلەفۆنی کردووە، وتوویەتی دەزانم حەمەمین لە ماڵی ئێوەیە، مولازم عومەر دەنێرم بەشوێنیدا، بڵێت سەرێکم لێ بدات".

کە چوومە لای مام جەلال، هێندێک بروسکەو نامەی پیشاندام کە هەوڵەکانی خۆی بوون بۆ ڕاگرتنی شەڕەکەو دڵنیای کردم بە یەکجاریی شەڕەکە ڕادەوەستێت و وتی: "بچۆ بۆ لای عوسمان ئۆچالان و پێی بڵێ، لە خواکورک بێتە خواری، من بارەگاکانی خۆمانیان لە زەڵێ بۆ ئامادە دەکەم، لەوێ دانیشن و کاری خۆیان بکەن".

من خۆم نەمتوانی بچم بۆ لای عوسمان، بەڵام پەیامەکەم گەیاند، ئەوان لە شاخ سێ بەرە بوون لە جەنگەکەدا. بەرەکەی (ماهیر وڵات و جەمیل بایک) نەهاتن، بەڵام بەرەکەی (عوسمان ئۆچالان) بە پێشنیارەکەی مام جەلال قایل بوون بێنە زەڵێ. یەکێتی داوای کردبوو کە دەبێت چەک دانێن و بەبێ چەک بەرەو زەڵێ بچن، ئەوان پێداگرییان کرد کە بە هیچ جۆرێک چەک دانانێن.

شەڕ کۆتاییهات و بارودۆخەکە هێمن بـووەوەو مام جەلالیش قسەی لەگەڵ کردبوون کە شەڕەکە ناچاریی بـووەو بەسەریاندا سەپێنراوە، لەگەڵ ئـەوەشـدا ئـەوان دەستیان پاراستووەو نەیانویستووە خوێنێکی زۆر بڕژێت.

ئیتر ئەوەبوو مام جەلال وەک قەرەبوو هێندێک چەک و ئۆتۆمبێلی دانێ و هاوکاریی ماددیشی کردن، دواییش لەگەڵ پارتیش قسەیان کردبوو، لە عەنکاوەش بنکەیەکیان کردەوە.

ئیمە لە سلێمانی گیراوەکانیان بۆ بەردایـن و کەلوپەل و ڕۆنیۆو ئامێری چاپەکانیان داینەوە.

ئەو ئۆپەراسیۆنە لەلایەن تورکیاوە ناوی (ساندویچ) بوو، پیلانەکەش بە سەرپەرشتی ئەمریکا دانرابوو، بە شێوەیەک لەلایەنی تورکیاوە سوپا سنوور دابخات و نەهێڵێت گەریلا بچێتە ناو تورکیا، لەمدیویشەوە پێشمەرگە هێرش بکەنە سەر پەکەکەو بیانفەوتێنن و وەک سەندویچ قوتیان بدەن.

## ١٠- ڕازێکی نەخوازراو سەبارەت بە شەڕی براکان.

(پارتی گەل و حزبی سۆیالیست و پاسۆک) بوون بە یەک و حزبێکی تازەیان دانابوو بە ناوی (یەکگرتن)، لە بارەگاکەی ئـەوان لە هەولێر سەردانێکی مولازم کەریم

سەلامم کرد، سامی عەبدولڕەحمان و چەند سەرکردەیەکی تری ئەو حزبە لەوێ بوون، مولازم کەریم وتی: "بابچینە ئەو ژوورەی ئەودیو و قاوەیەک بخۆین"، بەدرێژیی باسی شەڕەکەمان کرد، وتی: "کاکە ڕێکەوتن هەبوو دوای شەڕەکە تورکیا بیست ملیۆن دۆلار بدات بە هێزە کوردییەکانی هەرێم".

وتی: "نوێنەری ئێمە لە ئەنقەرە کە لەگەڵ حزبەکانی تردا ئەو جەنراڵە تورکەی دیبوو کە سەرپەرشتیاری شەڕەکەی دەکرد، وتی کابرا پێنج ملیۆنی بۆ فڕێداین و وتی لەناو خۆتاندا بەشی بکەن، چونکە ئێوە لە شەڕەکەدا سەرکەوتوو نەبوون، هەر ئەو پێنج ملیۆنەتان دەدەینێ".

بەداخەوە لەو شەڕەدا زیاتر لە هەزار کەس لە هەردوولا کوژراو هەتا ئێستاش ئاسەواری خراپی ئەو شەڕە ماوە، ئەگەر بەردەوامیش بووایە دەبووە شەڕی بادینی و سۆرانی، شەڕی باکوورو باشوورو دەرەنجامی کارەساتبارو درێژخایانی دەبوو.

لەم ڕۆژانە
قەرەجێکم دی
ڕووت و ڕەجاڵ
بە زەوقەوە پێشەکەنی
کە لێم پرسی
تۆ خەڵکی کوێیت؟
لە کوێ هاتووی
بۆ کوێ ئەچیت؟
پاش حەپەسان
ڕووی کردە تووڵایی ئاسمان
وتی: نەتەوە یەککگرتووەکان
ددانیان بە مافی منا ناو
خستمیانە ناو لیژنەیەک
ئەرێ ئەی تۆ؟
منیش تاسام
خەجاڵەت بووم
زمان لاڵ بوو نەهاتە گۆ
هەرچەندم کرد نەهاتە گۆ
ئێستەو ئەوساش نەهاتە گۆ.

## ١- چۆن هەرێمی کوردستانم بەجێهێشت؟

بە درێژیی چەند مانگێک لە سلێمانی لە ماڵی دارا مامەوە، لەو ماوەیەدا ئاگام لە ماڵ و منداڵ نەمابوو، وەڵامیان بۆ ناردم کە نەچمەوە هەولێر، چونکە چەندجار چوونەتە سەریان، کورت و پووخت پەیامەکەیان ئەمە بوو "هەر تۆمان لێ دووربێت، ئێمە باشین و تۆش خۆت بپارێزە".

ئیتر بەڕاستی من بەهۆی چوونم بۆ لای عەبدوڵلا ئۆچالان و نێوەندگیرییەکانم و نزیکیم لە پەکەکە، بەتایبەت کە دوای شەڕەکەش دەستم کەشف بوو، هەموو لایەک تۆمەتباریان دەکردم من بەرپرسیارم لە هێنانی پەکەکە بۆ باشوور.

لەڕاستیشدا وا نەبوو، پێش ئەوەی تێکەڵیان بم و دواتریش کە وڵاتم بەجێهێشت، ئەوان هەر کاری خۆیان دەکردو خەڵکیش پێیان سەرسام بوون، دەیانوت: "ئەگەر ئێمە کار بۆ ڕزگارکردنی باشوور دەکەین، ئەوان لە ئێمە دڵسۆزترن، کە خەبات بۆ هەر چوارپارچەکە دەکەن".

ئیتر لەو ماوەیەدا (ڕەئوف ئاکرەیی)یان لە دهۆک تیرۆر کرد، کچ و کوڕێکی تری پەکەکەیان کوشت، لە سلێمانیش لایەنگرانی پەکەکەیان دەگرت، هێندێکیشان سەرەونگوم کرد، دەچوونە سەر ماڵی ئێمە، چووبوونە سەر ماڵی نازەنین خانی خوشکی مومتاز حەیدەری.

من چووبومەوە هەولێر، ڕۆژێک عەزیز محەمەدی سکرتێری حزبی شیوعی هات بۆ لام بۆ ماڵەوە، وتی: "کاکە لێرە بمێنیتەوە دەتکوژن، هەوڵبدە کوردستان بەجێبهێڵیت".

هاتمەوە سلێمانی، وەزعی خۆم بۆ مولازم عومەر باسکردو ئەویش هەمان ڕای عەزیز محەمەدی هەبوو، وتم: "بەڵکو لای مام جەلال هیمەتێکم بۆ بکەیت، نووسراوێکم بۆ بکات لە فیشخاپور بپەڕمەوەو لێرە نەمێنم".

مولازم عومەر نووسراوەکەی مام جەلالی بۆ پەیدا کردم، دیاربوو یەکێتیش پێی خۆشبوو لەکۆڵیان ببمەوە.

چوومە زاخۆ بۆ سەرسنوورو نامەکەی مام جەلالم پیشاندان، بەڵام ڕێگەیان نەدا بپەڕمەوە، دوو سێ ڕۆژ لەو ناوە بووم، دەستی دەستییان پێدەکردم، بارودۆخی دەروونیم زۆر خراپ بوو.

دەچوومە ماڵێک کوڕەکەم پێشتر دەناسی، فەرماندەی سەربازیی یەکێتی بوو، ناوی (لەشکری) بوو، زۆر ڕێزیشی

دەگرتم، بەڵام ڕۆژێک گوێم لێبوو کەسوکارەکەی پێیان وت: "بەهۆی ئەم کابرایەوە هەموومان دەسووتێنن، ئەوەندە ڕووی مــەدەرێ، بەڵکو بــڕوات"، بەجارێک خەریکبوو دەڕووخام.

سەردانی نوێنەرایەتی پەیوەندییەکانی یەکێتیم کرد، ئەودەمە (بەکر فەتاح) لەوێ بوو، لە بەختی من ئەویش بە سەردان هاتبووەوە بۆ سلێمانی. باش بوو ئەوەندەی نەبرد گەڕایەوە، ئەمجارە کە چوومەوە بەکرم بینی، (جەوهەر کرمانج و شاخەوان عەباس)یش لەوێ بوون، شاخەوان پێشتر منی دەناسی، بەهۆی شیعرو ئەدەبیاتەوە (بەداخەوە دوایی لە تەقینەوەکەی هەولێردا شەهید بوو) نامەکەی مام جەلالم پیشاندان و وەزعەکەم بۆ گێڕانەوە، ئەوان لە ناوخۆیاندا چپەچپێکیان کردو کوڕێکیان بانگکردو وتیان: "بڕۆ بۆ لای فلانە کەس لەسەر ئاوەکەو بڵێ بەڕێزەوە لە فیشخاپوور بیپەڕێنێتەوە".

بە خـۆم و ســەروەت و سـامـانـمـەوە، کە جانتایەک جلوبەرگ و پێداویستی بوو، پەڕیمەوە، لەبەری ڕۆژئاوا هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا.

بەری ڕۆژئـاوا ئەوسا بەدەست حکومەتی سورییەوە بوو، بۆیە پشکنیانم و هێندێک کاسێتم پێبوو لێیان سەندم و

لە هێندێکیش بوران، ئیتر منیش بەرەو قامیشلۆ ڕۆیشتم و لەوێ ڕێوشوێنی برادەرانی پەکەکەم دەزانی، دۆزیمنەوەو حاڵ و مەسەلەم بۆ گێڕانەوەو وتم: "بمبەن بۆ بیقاع بۆ لای عەبدوڵلا ئۆچالان".

بێگومان جاری تر سەردانی ئۆچالانم کردبوو، لە دیمەشقیش بینیبووم، جارێکیش لە دیمەشق سەردانێکم بۆ مولازم عومەر ڕێکخستبوو، بەڵام ئەمجارە چوونەکەم بەنیازی ئەوەبوو نەگەڕێمەوە.

بردیانم بۆ بیقاع، ئۆچالان بە گەرموگوڕییەوە پێشوازیی لێکردم و زۆ ڕێزی ئەوەشی گرت کە لەسەر پەکەکە ئەمەم تووش هاتووە.

لەو ماوەیەدا زۆربەی شەوان پێکەوە دادەنیشتین، گفتوگۆی زۆرمان کرد، ئەمجارە زیاتر ئاستی ڕۆشنبیریی و شارەزایی ئەوم لە مێژووی کۆن و سیاسەت و فکردا بۆ دەرکەوت، بۆ خۆشیش هێندێک شتمان باسکرد، تا هاتە سەر (بەشیر موشیر)و بەشیریات، زۆری پێخۆش بوو، وتی: "شتەکانی بێنە با بیکەین بە تورکی، بزانم ئەم ئوستازە کێیە، مام جەلال و دوکتۆر کەمال فوئادیش زۆریان بۆ باسکردووم".

ئیتر ماوەیەک لەوێ بووم، ساڵ ساڵی (١٩٩٣) بوو، نەورۆز نزیک دەبووەوەو وتی: "لە قامیشلۆ بە بۆنەی نەورۆزەوە فیستیڤاڵێک ساز دەکرێت، برۆ لەوێ بەشداریی بکەو سەردانی شارەکان بکەو کۆبوونەوەی گەل ڕێک بخە.

لە بیقاعەوە بردیانم بۆ دیمەشق، لە دیمەشق لە گەڕەکی (مەزرەعە) ئاپۆ دوو شوقەی هەبوو، کە دەچووە دیمەشق لەوێ دەمایەوە، یەکێکیان شوێنی حەوانەوەی خۆی بوو، ئەوی تریشیان کە میوانیان دەهات لەوێ دایان دەناو نەیان دەبردە ئوتێل.

ماوەیەک لەو شوقەیە بووم، لەوێوە بردیانم بۆ قامیشلۆ، نەورۆزی ساڵی (١٩٩٣)م لە قامیشلۆ کرد.

لە قامیشلۆ ئاهەنگ و گۆڤەندی نەورۆز جۆش و خرۆشی تایبەتی هەبوو، پەکەکە لەوێ مۆراڵی خەڵکی بەرزکردبووەو لە سەرەتاشدا بوو. لەوێ خەڵکم بینی و قسەم کردو پاشان بردیانم بۆ (دێرک و عەفرین و ترپەسپی و کۆبانی)و هەموو شارەکانی تری ڕۆژئاڤا، لە هەموویدا وەک خۆیان دەڵێن کۆبوونەوەی گەلم دەکردو خەڵکم دەبینی.

جارێکیش لەگەڵ ئاپۆ چووین بۆ (لازقیە)، ئەوێ ناوچەی عەلەوی نشینەکانە لە سوریاو لەسەر دەریایە، لەوێش شوقەیەکی هەبوو.

ئیتر لەو ماوەیەدا زۆر خەڵکم بینی، لە حەڵەب، لە شام لەو شوێنانەی کوردی لێبوو، گفتوگۆ دەسازاو لەبەرئەوەی تازە هەرێمی کوردستانیش لە نەشونمادا بوو، کوردی سوریا بەپەرۆشەوە لە بارودۆخیان دەپرسی.

٢- فڕین بۆ ئۆروپا.

هاتمەوە بۆ بیقاع، شەوێکیان ئاپۆ وتی: "حەمەمین کاری ئۆروپاکەت بۆ ڕێک دەخەم، ماڵ و منداڵیشت ببە با لە مەترسیدا نەبن، بەڵام حەز دەکەم تۆ لە کوردستان بیت"، وتم: "منیش ئەوە پلانەکەمە".

وتی: "باشە دەتنێرم بۆ ئۆروپا لەوێ دەست بە چالاکی بکە"، وتم: "باشە بەڵام من لە ئەزموونی حزبی شیوعییەوە تاقەتی کاری ڕێکخستنم نەماوە، کاری ڕۆشنبیرو دیبلۆماسی دەکەم، لەم نیوەی عومرەدا ئەوەی ماوە تەرخانی دەکەم بۆئەوەی شتێک بۆ کوردایەتی بکەم". ئەویش ئەوەی پێ خۆش بوو.

کەسێکی بانگ کرد وتی: "دەفتەرێکی بۆ بکەن".

بردیانمە ژوورێکی ترو وێنەیان گرتم، بۆ بەیانی وتیان: "ئەوە پەساپۆرتەو فلانە ڕۆژ دەبێت لە فڕۆکەخانەی دیمەشق ئامادە بیت بۆ ئەوەی بە فڕۆکە بچیت بۆ مینشن لە ئەڵمانیا".

چوومە فرۆکەخانەو هێندێک دۆلاریشیان دابوومێ بە وردە، وتیان: "هەرکەس شتێکی وت، دۆلار دەربێنە کار دەڕوات". هەر وابوو، چوومە ئەوێ، پاسپۆرتم دەرهێناو یەکەم ئەفسەری سوری کە تاج و نەجمە بەسەر شانییەوە ئەوەندە زۆر بوون خەریک بوو بکەونە خـوارێ، بیست دۆلارم دایە دەست بوو بە خزمەتکارم و جانتای هەڵگرت تا لە کۆنترۆڵ تێیپەڕاندم.

من پاسپۆرتەکەم بە ناوی (ئوزگور شاهێن) بوو، کە گوایە کارگەرێکی تورکم و لە ئەڵمانیا کار دەکەم، چەند وشەیەکی تورکیشیان فێرکردبووم، بەڵام باش بوو هیچ ڕووی نەداو لە دیمەشقەوە بێوەی فڕیم بۆ ئەڵمانیا.

لە شاری مینشن کچێک لە فڕۆکەخانە پێشوازیی لێکردم و سواری ئۆتۆمبێلی کردم و بردمی بۆ ماڵی ولاتپارێزێک. پاش دوو سەعاتێک زەنگی تەلەفۆن لێیداو ماوەیەک بە تورکی قسەیان کردو تەلەفۆنەکەیان دامێ و تیان: "ئاپۆ دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات".

تـەلـەفـۆنـەکـەی بـۆ ئـەوە بـوو بـزانـێـت بـەسـەلامـەتـی گەیشتوومەتە ئەڵمانیاو، وتـی: ئیتر"کاری خۆت بکە لە ئۆرووپا".

بۆ بەیانی بردیانم بۆ شاری (کۆڵن)، لەوێ (کانی یەلمازو مستەفا قەرەسوو) سەرپەرشتی کاری پەکەکەیان دەکرد لە ئۆروپا، گفتوگۆی زۆرمان کرد، وتیان: "کۆبوونەوەی گەل هەیە".

کۆبوونەوەکە لە هۆڵێکی گەورەدا بوو، ئامادەبووانیش زۆر بوون، قسەو گفتوگۆ زۆر کرا، لەبەرئەوەی بە تورکی بوو، من تەنها گوێگر بووم، دواییش ماوەیەک گفتوگۆکان بوون بە کرمانجی و جارێ من هەر گوێگرم و بەشداریی ناکەم.

دوو شەو لەلای کانی یەڵمازو مستەفا قەرەسوو مامەوە، دوایی ناردمیان بۆ لای کوڕێک کوردی ڕۆژئاوا بوو، ناوی (سەلاح موسا) بوو، کوڕێکی دەوڵەمەند بوو، سێ چوار ڕێستۆرانتی هەبوو. ماوەیەک لای ئەو بووم، هەر لای ئەویشەوە وەک پەنابەر خۆم بە پۆلیس ناساند.

من شوناسی ڕۆژنامەنووسانی جیهان و شوناسێکی تری ڕۆژنامەنووسانی کوردستانم پێبوو، پۆلیس کە ئەوانەیان بینی، تۆزێک بایەخیان پێدام.

لەوێ دوای ئەوەی خۆت بە پۆلیس دەناساند، دەیانبردیت بۆ کەمپی نیشتەجێبوون، ئەو ماوەیە کەمپەکە لەسەر پاپۆڕێک بوو لە دەریادا، دەبوو منیش ببەنە ئەوێ تا کاتی

دادگاییکردنم دێت، بەڵام ئەگەر کەسێک گرەنتی بکردیتایەو شوێن و ئـەدرەس و ئیشی ئـازادی هەبووایە، دەتتوانی لای ئەو بمێنیتەوە. ماوەیەک لای سەلاح مامەوە، ڕۆژێک ئاگاداریان کردمـەوە کە هەموو پەناهەندە ئێراقییەکان ڕەوانەی ناوچەیەک دەکەن لە باکووری ئەڵمانیایە بە ناوی (ئۆڵدمبۆرگ).

لە ئۆڵدمبۆرگ بردیانینە کەمپێک کاتی خۆی سەربازگەی ئەمریکاییەکان بـووە، ئامادەکرابوو بۆ پەناهەندە، لەوێ ژوورێکی بچووکیان دامێ، دەستشۆری تیابوو، سابوون و شامپۆو دەرمانی ددانشتن و فڵچەشیان دامێ.

ڕۆژێـک لـە ئۆفیسی کـەمپەکەوە پۆلیسێک هـات بە شوێنمدا، وتیان: "کەسێک هاتووە دەیەوێت بتبینێت".

ڕێکخستنەکانی پەکەکە لەو شارە ئاگادار کرابوونەوە کە کەسێک ڕابسپێرن پەیوەندیم پێوە بکات. ئەوکەسەی هاتبوو بۆ بینینم، نـاوی (حـەسـەن) بـوو، یـەزیدی بوو، کوردی باکوور بوو، ئیتر ئەو بە بیانووی کۆتایی هەفتەوە لە کەمپەکە دەریهێنام و بردمی بۆ ماڵی خۆیان. ماوەیەک لەوێ بووم هەتا وادەی لێکۆڵینەوەی دادگایم هات، ئەمجارە هەڵیاندامە شارێکی تری ئەڵمانیا کە ناوی ( ڤیسبورگ) بوو.

کەمپەکەی شاری (ڤیسبورگ) زۆر قەرەباڵغ بوو، پڕ بوو لە پەناهەندەی ئەلبانی، بەنگلادیشی، ئەفریقایی، ئەفغانی و ژن و منداڵ و خێزان، نزیکەی سێ مانگێکی پێچوو تا مافی پەنابەرییان دامێ، بەڵام لەو ماوەیەدا من هەر بەناو لە کەمپدا بووم، ئەگینا دۆست و هەڤاڵان ماڵیان ئاوەدان بێت نەیانهێشت هەست بە بێلانەیی و غەریبی بکەم.

لە لێکۆڵینەوەکانی دادگادا خۆم ناساندبوو کە شاعیرو ڕۆژنامەنووسم و پێشینەم لە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی عێراقدا هەبووەو ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی ئێراق و ئەندامی ئەنجومەنی یاسادانان بووم.

لەکاتی لێکۆڵینەوەدا ئەو کەسەی وەرگێڕانی دەکرد، کوڕێک بوو ناوی دکتۆر (زەردەشت حاجۆ) بوو، لە بنەماڵەی حاجۆی ڕۆژئاوا بوو، زەردەشت وتی: "ئەمانە دەڵێن دەتوانێت شیعرێکی خۆیمان بۆ بخوێنێتەوە؟"

شیعرێکی خۆم خوێندەوەو زەردەشتیش کە باشبوو وردە وشەی سۆرانیشی دەزانی، بۆی کردن بە ئەڵمانی. نازانم شیعرێک بە سۆرانی نووسرابێت و کرمانجییەک بیکات بە ئەڵمانی، کە خۆی سۆرانی نازانێت، دەبێت چی بەسەرهاتبێت؟!

سێ مانگی پێچوو هەتا دادگا وەڵامی دامەوە، بووم بە پەناهەندەی سیاسی لە وڵاتی ئەڵمانیا.

ڕۆژێک ئەو حەسەنە کە وتم لە ئۆڵدمبیرگ خانەخوێم بوو، بۆ پەیوەندیی ئەدرەسی ئەوم دابوو، هات بۆ لام و وتی: "کاکە هێندێک بەرپرس لە حکومەتی خۆجێی، سەرۆک و ئەنجومەنی شارەوانی حەز دەکەن تۆ لەسەر کێشەی کورد قسەیان بۆ بکەیت، ئەوان داوایان کردووە سەعات و نیوێک قسەیان بۆ بکەیت، جا تۆ زیاتر، یان کەمتر، بەدەست خۆتە".

کە چوومە ئەوێ، بۆئەوەی قسەیان بۆ بکەم، ئامادەبووان بیست کەسێک دەبوون، قاوەو بیرەو چەرەس و کەمۆکەیەک شیرینیش دانرابوو.

قاوەمان خواردەوەو دەستم بە قسەکردن کرد، زەردەشت حاجۆ قسەکانی دەکرد بە ئەڵمانی، کوڕێکیش کە خزمی حەسەنی خانە خوێم بوو، ئەویش یەزیدی بوو مامۆستای زمانی عەرەبی بوو، لە سوریاوە هاتبوو، ئەوەی زەردەشت تێنەگەیشتایە لە من بە عەرەبی، ئەو دەیکردە کرمانجی بۆ زەردەشت و بە هەردووکیان دیاربوو ئامادەبووانیان باش تێدەگەیاند.

منیش هەرچی زانیم سەبارەت مێژووی کۆن و نوێی کوردو خەبات و بەرخودانی کورد بۆ ئامادەبووانم باسکرد، بەدرێژیش خەباتی باشوورم لە سەرەتای لکاندنی کوردستان بە ئێراقەوە باسکردو کەمێکیشم لەسەر ئێستای هەرێم و خەباتی باشوور قسەم کرد. بە دەموچاویاندا بۆم دەرکەوت هەموو شت بەباشی دەڕوات و ئامادەبووان بەباشی تێدەگەن.

دوای سەعاتێک زیاتر وتیان وادەی پشووە، لەو بەینەدا هەلم قۆستەوەو لەگەڵ ئەواندا بیرەیەکم خواردەوە، کاری ڕاستبێت بیرەی ئەڵمانی ئیشی خۆی کرد، ئەوەی لەوەوبەر نەموتبوو، لەم سەعاتەی دووەمی کۆڕەکەدا بە جوانتر بۆ ئامادەبووانم باسکرد.

یەکێک لە ئەڵمانەکان کە لەلامەوە دانیشتبوو، ژمارەو ئەدرەسی دا بە زەردەشت حاجۆو وتی: "بۆ هەر کارێکی پێویست پێی بڵێ پەیوەندیم پێوە بکات".

من مافی پەناهەندەییم وەرگرتبوو، بەڵام پاسم وەرنەگرتبوو، پاش هەفتەیەک ئەو کابرایە خۆی تەلەفۆنی کردو وتی: "ئەوەشمان بۆ تەواوکردووە".

ئیتر من مافی پەناهەندەییم لە باخەڵدابوو ئازاد بووم. یەکەکە بیرۆیەکی ڕۆشنبیریی هەبوو لە بۆن، کوڕێکی

ڕۆژهەڵاتی بەرپرسی بوو، کە دوایی شەهید بوو ناوی (فایەق چیچک)بوو، لە سەردەمی هاتوچۆمەوە بۆ بیقاع دۆستایەتی لەنێوانماندا پەیدا ببوو.

ئەو بیرۆ ڕۆشنبیرییە ناوێکی دووروودرێـژی هەبوو، وەکـو (یەکێتیی ڕۆشنبیرانی وڵاتـپارێـزی کوردستان)، ئیختسارەکەی (یەرەوەکە) بوو، تەنها ژوورێکی بچووک و مێزو کورسی و ئامێرێکی فاکس و کەلوپەلێکی کەمی هەبوو.

ئیتر ئەو ماوەیەی لە بۆن بووم، هەرشەوە، یان دوو سێ شەوێک لە ماڵێک میوان دەبووم، هەرکە دەشیانزانی من هاوڕێی سەرۆک ئاپۆم، ئەوەندەی تر شیرینتر دەبووم و بەرنەدەکەوتم.

چەند شاگەشکە دەبـووم ئەو خەڵکە لە خۆشەویستی دۆزی ڕەوای گەلەکەیان ڕێز لە ئاپۆ دەگـرن و بەهۆی ئەویشـەوە ڕێـز لـە مـن دەگـرن، جـارجـارە وەخـت بوو خۆشەویستی ئەوان بۆ دۆزی ڕەوای گەلەکەیان، چاوانم پڕ بکات لە فرمێسک.

هـەر شـەوەی لە شارێک و لە ماڵێک، کوڕی گەرمی خەباتی ئەوان، سێ ساڵ لە تەمەنی گێڕامەوە بۆ دواوە، گەنج و چوست و چالاکی کردمەوە.

لەو ماوەیەدا ئاپۆ تەلەفۆنی بۆکردمەوەو سەرپشکی کردم لە کاروباری ڕۆشنبیریی، پێشنیارم کرد لە شاری کۆڵن کۆنفرانسێکی ڕۆشنبیریی ببەسترێت.

بەگەرمی بەپیر پێشنیارەکەمەوە هاتن، شەست کەسێک ئامادەی کۆنفرانسەکە بوون، دوو کەسی باشووری تێدابوو، کە تا ئێستاش لەگەڵ پەکەکەدا ماون، کە ناوی منیان بیستبوو، بە پەرۆشەوە هاتن بۆ لام، ئەو دووانە (ڕێبوار ڕەشیدو کاروان) بوون.

فایەق کە بەرپرسی بیرۆی ڕۆشنبیریی پەکەکە بوو، سەرپەرشتیکردنی کۆنفرانسەکەی بە من سپارد. لەو ماوەیەدا من زۆر وشەی کرمانجی و تورکی فێرببووم کە لەکاتی قسەکردندا مەبەستی پێ بگەیەنم.

لەو کۆنفرانسەدا من وتارێکم دا، لە وتارەکەدا زۆر هانی ئەوەم دا کە ئێمەی ڕۆشنبیرانی کورد پێش هەموو شت دەبێت کار بۆ ئەوە بکەین کە بە کوردی قسە بکەین، بە کوردی بخوێنینەوە، بە کوردی گۆڤارو بڵاوکراوە دەربکەین، سەرەتای ڕێگای ڕاست و دروستی خەبات ئەوەیە، کە پارێزگاریی لە زمانی کوردی بکەین و پەرەی پێ بدەین، ئەمەش یەکەم سەنگەری بەرەنگارییە دژ بە داگیرکەرانی کوردستان.

ئـەوان لـەوێ زۆربـەیـان خەڵکی خـوێنـدەوار بـوون، خاوەن بڕوانامەی بەرز بوون، بەباشی زمانی ئەڵمانییان دەزانـــی، بــەڵام هــەمـوو بـە تـورکـی دەیـانـنـووسـی و بە تورکیش قسەیان دەکرد، ڕۆژنامەیەکیان هەبوو بەناوی (ئـوزگـول پۆلەتیک) (سیاسـەتی ئـازاد)، ئەویش هـەر بە تورکی دەردەچوو، لە گۆڤارو بڵاوکراوە تورکییەکانیشدا دەیاننووسی، بڵاوکراوەکانیان هەمووی تورکی بوو، تەنها گۆڤارێکی وەرزییان هەبوو، کە ئەو بیرۆیە دەریدەکرد بە ناوی (ڕۆشن) بە کرمانجی و لاتینی لێکۆڵینەوەو شیعرو ئەدەبیاتی تیادا بڵاو دەکرایەوە.

لەو کۆبوونەوەیەدا، لەو شەست کەسە پرسیارم کرد، چەند کەس دەتوانێت بە کوردی قسە بکات و بە کوردی بنووسێت، تەنها بیست کەسێکیان تێدابوو کوردی بزانێت.

لـەوێدا من داوام کـرد کە ئـەو بیست کەسە ئەدرەسی خۆیانمان بدەنێ، تاوەکو لیستێک لەلای بیرۆکە بێت. هێندێک لە ئامادەبووان ئەمەیان پێ ناخۆش بوو، وا هەستیان کرد کە تورکیزانەکان فەرامۆش دەکرێن، بەڵام من مەبەستم لەوە ئەوە بوو جارێ ئەمانە هاوکاریمان بکەن لە گۆڤارو بڵاوکراوە کرمانجییەکاندا، تا ئەوانی تریش فێری کوردی دەبن. لەوێ بڕیارمان دا بە کرمانجی و سۆرانیش بڵاوکراوە دەربکەین.

لەو دەمەدا زمانی دووەم لە دوای تورکی کە بەکاردەهات بەهۆی کوردانی سوریاوە، زمانی عەرەبی بوو، بۆیە تەنانەت زوربەی لافیتەی کۆنفرانسەکە بە تورکی و عەرەبی و ئەڵمانی نووسرابوون، یەک دووانێک نەبێت بە کرمانجی بوون.

هەر لەو کۆنفرانسەدا پێشنیارم کرد کە پەیمانگایەک بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی لە (بەرلین) دابمەزرێت، لە کوردانی هەر چوارپارچەکە لە ئۆروپا، سەدو پەنجاکەسێکی پسپۆڕو شارەزای مێژوو و کلتوورو فەرهەنگی کوردی ببنە ئەندامی پەیمانگاکەو گرنگیش نییە ئەوانە کوردی بزانن، یان تورکی، یان هەر زمانێک، بەڵام گرنگ ئەوەیە دەست بە لێکۆڵینەوە بکەن لە بوارە جیاجیاکانی تایبەت بە کورد.

بۆ دامەزراندنی گۆڤارەکەیش پێشنیارم کرد دەستەیەک لەو بیست کەسە پێکبێت کە کوردی دەزانن، بۆئەوەی ئەوان بەڕێوەی ببەن.

پێشنیارەکانم بۆ دامەزراندنی پەیمانگاکەو دەرکردنی گۆڤارەکە بە کۆی دەنگ پەسەند کرا.

هەر لەوێش بڕیاردرا کە سەردانی پایتەختەکانی ئۆروپا بکەین و ئەو شارانە بچین کە ژمارەی کوردی پەناهەندەی زۆری لێیەو دەست بکەین بە چالاکی کۆڕو کۆبوونەوەو

سیمینار، هەوڵیش بدەین بە نوێنەرایەتی پەیمانگاکە سەردانی پەرلەمانی ئۆروپا بکەین و لەوێ دۆزی ڕەوای کوردیان پێ بناسێنین و داوای پشتیوانی ئەوان بکەین.

لە پاش مانگێک ڕەزامەندیی ئاپۆ لە سەردانانی پەیمانگاکەو گۆڤارو چالاکییەکان وەرگیراو بڕیاردرا ئۆفیسی سەرەکی پەیمانگاکە ببرێتە بەرلین، کە دوایی ناونرا ئینستیتیوت.

لەو سەروبەندەدا دەستمان کرد بە گەڕان بەناو شارەکانی ئەڵمانیاداو دەیانبردم بۆ ئەو شوێنانەی کوردی لێیە، لەوێ من سەرپەرشتی کۆبوونەوەکانم دەکردو باسی مێژوو و فەرهەنگ و خەباتی کوردو گرنگی ئەزموونی باشوورو پشتیوانیکردنی ئەو ئەزموونەو بایەخدان بە کلتوورو زمانی کوردیم دەکرد، گفتوگۆی گەرم لەو کۆبوونەوانەدا، دادەمەزراو سودو بایەخی خۆی هەبوو، جۆش و خرۆشی لەناو کوردانی ئەڵمانیادا دروست دەکرد.

ئینستیتیوتەکە دامەزراو مۆڵەتی کارکردنی لە حکومەتی ئەڵمانی وەرگرت و ئۆفیسی خۆی لە بەرلین دامەزراند. لەو ماوەیەشدا جگە لە فایەق کە سەرەوکاری ڕۆشنبیریی پەکەکەی دەکرد (دلبخوین دارا)، کە دواتر لە پەکەکە جیابووەوەو ئێستا لە کەناڵی (ڕووداو) کار دەکات و

بێژەرێکی بەناو و دەنگە، بوو بە بەرپرسی ڕۆشنبیریی ئۆروپا. فایەق گواسترایەوە بۆ "یۆنان" بۆئەوەی لەوێ سەرەوکاری ڕێکخستنی پەکەکە بکات. بابیرم نەچێت فایەک کە لە ئۆروپا سەرپەرشتی کاروباری ڕۆشنبیریی دەکرد، هەڤالانی پەکەکە پێیان دەوت: "فایەق قومبەلە ئیختساسی"، لەبەرئەوەی شارەزایی زۆری لە تەقینەوەدا هەبوو!

بۆ کۆکردنەوەی پسپۆڕو شارەزاییان لە ئینستیتیوتەکەو خۆسازدان بۆ سەردانی پەرلەمانی ئۆروپا، من کەوتمە سەفەرکردن بۆ وڵاتانی ئۆروپا، چوومە (لەندەن و پاریس و ستۆکهۆڵم و ئەمستردام و کۆبنهاگن و برۆکسل) کەسایەتیی ناودارو شارەزامان کۆکردەوە، لەنێویاندا دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، کە بەیادم هێنایەوە جارێک لە شەستەکاندا لە پێنجوێن یەکمان بینیوە.

عسمەت دکتۆرای لە مێژوودا هەبوو، مامۆستای خانەنشینی زانکۆی سویسرا بوو، زمانی ئەڵمانی، فەڕەنسی، ئینگلیزی و عەرەبی دەزانی، زۆرجار ڕۆڵی گرنگی گێڕابوو لە دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان شۆڕشی کوردو ئۆروپادا، دواییش زۆر لێکتر نزیکبووینەوەو بوو بە دۆست و هاوڕێم، پێکەوە کاری گرنگمان کرد. جگە لە عیسمەت شەریف وانلی، هەریەکە لە (دکتۆر نوری تاڵەبانی، دکتۆر

جەبار قادر، دکتۆرە کوردستان موکریانی، دکتۆر جەمال ڕەشید، هونەرمەند قادردیلان، برایم ئەحمەد و دکتۆر نەجمەدین کەریم)و چەندین کەسانی تر، لە هونەرمەندو سیاسی و پسپۆڕو خاوەن بڕوانامەی بەرز لە کوردانی پارچەکانی ترمان کۆکردەوە.

٣- تەلئەبیب و پێنجوێن.

بۆ دامەزراندنی ئینستیتیوتەکە دەبوو ڕێکاری یاسایی بگرینەبەرو بەپێی ڕێنماییەکانی وڵاتی ئەڵمانیا نووسراوێک بدەینە شارەوانی و حکومەت، لە نووسراوەکەدا، پرۆفیسۆر عیسمەت شەریف وانلی وەک سەرۆک و منیش وەک سەرۆکی دووەم دیاری کرابووم. ئەو ڕێکخراوانەی پەکەکە دروستی دەکردن، سەرۆک و هاوسەرۆکی بۆ دادەنان، بەڵام بەپێی یاسای ئەڵمانیا، هاوسەرۆکی نییەو سەرۆکی یەکەم و سەرۆکی دووەم هەیە، هاوسەرۆک تەنها بۆ حزب هەیەو دەبێت ژن و پیاو بێت.

بەهەرحاڵ ئینستیتیوتەکە مۆڵەتی یاسایی بۆ وەرگیرا، من پێشنیارم کرد ڕاگەیاندنی دامەزراندنەکەی بخەینە ڕۆژی (٢٢)ی نیسان، کە ڕۆژی دامەزراندنی ڕۆژنامەگەریی کوردییە.

ڕۆژی (٢٢ی ٤ی١٩٩٤) لە بەرلین ئێمە ئینستیتیوتمان کردەوەو خەڵکێکی زۆرمان بانگێشت کردبوو، نوێنەری ئەو پێکهاتانەشمان بانگێشت کردبوو کە وەکو کورد زوڵمیان لێکراوە، وەکو جولەکەو ئەرمەن، تەنانەت هێندێک لەو ڕۆشنبیرو ڕێکخراوە چەپانەشمان بانگ کردبوو کە سەر بە فکری چەپ بوون.

نوێنەری زۆربەی میللەتان بەشداریی مەراسیمی کردنەوەی ئینستیتیوتەکە بوون، ئەوکاتە نزیکەی چل هەزار کوردێک لە بەرلین دەژیان، عیسمەت شەریف وانلی بە زمانی ئەڵمانی و فەڕەنسایی وتاری دا، منیش بە سۆرانی قسەم کردو برادەرانی تریش بە کرمانجی و تورکی قسەیان کرد، ئێوارەکەی ئاهەنگێکی گەورەمان ڕێکخست.

من و عیسمەت بەسەر مێزەکاندا دەگەڕاین و بەخێرهاتنمان دەکردن، دە دەقەیەک لەسەر مێزی ئەرمەنییەکان دانیشتین، ئەوان زۆر لایەنگری دۆزی کورد بوون.

کۆمەڵەیەکی جولەکەکان هەبوو لە بەرلین بە ناوی (یودیش گەمایندە) ئەوانیشمان بانگکردبوو، چووینە سەر مێزەکەیان، ئەوان پێنج کەس بوون، کە عیسمەت منی بەوان ناساند، وتی: "شاعیرەو سیاسییەو کوردی ئێراقە"،

فەرموویان لێکردین بۆ دانیشتن، ژنێکیان تیابوو زمانی عەرەبی دەزانی، مامۆستا بوو، وتی: "لە ئیسرائیلەوە هاتووم بۆ خوێندن". وشـەی پێنجوێن سەرنجی ڕاکێشا، وتی: "ئەمە ناوە، یان نازناوە؟" وتم: "ئەوە ناوی شارۆچکەیەکە لە کوردستان و هێندێکیش دەڵێن گوایە پێنج جولەکە دروستیان کردووە "کە ئەمەم وت و ژنەکە بۆی وەرگێڕان هەر بەجارێ تێم ئاڵان و کەوتنە پرسیارکردن".

وتیان: "هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی هەیە لەسەر ئەمە؟" وتم: "ئەمە تەنها بۆچوونێکە لەسەر دروستکردنی شارەکە، بەڵام دوو بنەماڵەی ناوداریش هەن لەوێ بە ناوی بارام و مخە، بارامەکە لە ئەبراهەمەوە هاتووەو مخەکەش لە میخائیلەوە"، گفتوگۆکە ئەوەندەی تر گەرم بوو، ئەوان وتیان: "بارام ناوی شوێنێکی پیرۆزە لە ئیسرائیل و دەوترێت موسا ماوەیەک لەوێ ژیاوە".

باسی ئەوەشم بۆکردن کە لە پێنجوێن شەخسێک هەیە (وشـەی شەخسم تێگەیاندن کە وەک مەزارێکە) ناوی (ئەلیاسە فڕە)یە، ئەوانیش وتیان: ئەلیاس ناوی پاڵەوانی مێژووی جولەکەیە.

گفتوگۆی زۆر بابەتی تر کراو باسی کوردستان و ئێراق و سیاسەت و دواییش کە ئاهەنگەکە تەواو بوو،

ژمارەی تەلەفۆنمان ئاڵوگۆڕ کردو وتیان: "حەز دەکەین پەیوەندیمان هەبێت".

پاش ماوەیەک لە گەرمەی کارو چالاکیدا بووین، ڕۆژێک ئەو ژنە تەلەفۆنی کرد، کە بە عەرەبی قسەی دەکردو وتی: "دەستەیەک لە ئینستیتیوتی ڕۆژهەلاتناسان لە تەلئەبیبەوە هاتوون، حەز دەکەین لەگەڵ تۆدا دانیشتن بکەن".

دانیشتنەکە ڕێکخراو بەدرێژیی قسەمان کرد، ئەوان داوایـان لێکردم کە بچم بۆ تەلئەبیب، بۆئەوەی لەوێ لە ئینستیتیوتەکەیان سیمینارێک پێشکەش بکەم.

لەدواییدا پرسم کرد، دیاربوو ئەو سەفەرە بۆ ئیسرائیل شتێکی بـاش نـەبـوو، بەتایبەت کـە مـن هێندێک خـزم و کەسوکارم لە بەغدا بوون، بۆیە بێدەنگیم لێکردو ئەوانیش دیاربوو تێگەیشتبوون و دووبارەیان نەکردەوە.

٤- بەرەو پەرلەمانی ئۆروپا.

عیسمەت شەریف وانلی هات بۆ بەرلین و ماوەیەک لای من مایەوە، لەوێ یاداشتنامەیەکمان نووسی سەبارەت مافی کوردو پشتیوانیکردنی لەلایەن وڵاتانی ئۆروپاوە.

یاداشتنامەکە کرا بە زمانی ئینگلیزی و هەموو زمانە ئەوروپییەکانی تر، چەند کۆبوونەوەیەکمان کردو ڕێکەوتین

ڕێپێوانێکی گەورە بکەین و لە ئەڵمانیاوە بە پێ بچین بۆ پەرلەمانی ئۆروپا لە برۆکسل.

لەو ماوەیەدا ویستمان زۆرترین کەس کۆ بکەینەوە، سەیر لەوەدا بوو کە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ هێندێک دۆست و هاوڕێدا دەکرد لە کوردانی باشوور، گاڵتەیان بە کارەکە دەهات و یەکێکیش وتی: "کاکە جا ئەوە بۆئەوەی بە پێ بگەنە برۆکسل، یەکی فەردەیەک پێڵاوتان پێویستە".

لە ئەڵمانیا برادەرانی پەکەکە هەموو شتیان ڕێکخست و مۆڵەتیان لە لایەنی پەیوەندیدار وەرگرت و ئامادەکاریی تەواویان بۆ وادەی دەستپێکردنی ڕێپێوانەکە کرد.

لەبەردەم بینای پەرلەمانی ئەڵمانیاوە دەستمان بە ڕێپێوانەکە کرد، ئەوسا هێشتا پەرلەمان نەگواسترابووەوە بۆ بەرلین، سەرەتا (١٢٠) کەس بووین، برادەران کارەکەیان بە ڕێکوپێکی ڕێکخستبوو، کاروانەکەمان وابوو ئێمە بە پیادە دەڕۆیشتین، لە دواشمانەوە ئۆتۆمبێلی ئەمبوڵانس و پۆلیس و ئۆتۆمبێلێک پێڵاو و ئۆتۆمبێلێک جلوبەرگی باران و ئۆتۆمبێلێکیش کەلوپەلی خواردن و ئاو.

وا ڕێکەوتبووین هەر ڕۆژە بیستوپێنج کیلۆمەتر بە پێ بڕۆین، ئەوەی باش بوو پۆلیسیش دەیپاراستین، چونکە لە ئەڵمانیا ئەودەمە کورد هەر گردبوونەوەیەکی

بکردایە، ڕێکخراوی گورگە بۆرەکان و تورکە شۆڤێنییەکان پەلاماریان دەدان.

لەناو ئەڵمانیادا دەگەیشتینە هەر شارێک خۆمان بە سەرۆکایەتیی شارەوانی و پۆلیس دەناساندو وێنەیەک لە یاداشتەکەمان دەدانێ، نزیکەی سەعاتێک قسەمان بۆ دەکردن و پەیامی خۆمان دەگەیاند.

لە دوای ئەڵمانیا گەیشتینە هۆڵەندا، لەسەر سنوور پێشوازیمان لێکرا و پشوومان دا، پاشان ڕێپێوان دەستی پێکردەوە هەتا گەیشتینە شاری (ماستریخت)ی هۆڵەندی، لەوێش سەرۆکی شارەوانی و سەرۆکی پۆلیس پێشوازیی لێکردین، یاداشتنامەکەمان دا بەوان و پەیامی خۆمان بەوانیش گەیاند.

شەوێک لەو شارە ماینەوە، زۆر ماندوو ببووین، کەمێک پشوومان دا، قاچ و قولمان هەمووی ببوو بە بڵق، هێندێکمان تەواو پەکمان کەوتبوو، لێرەوە سەرەتای قورسیی ڕێپێوانەکەمان دەستی پێکرد.

بەناو هۆڵەندەدا شارەو شار دەڕۆیشتین، وەکو وتم، دەگەیشتینە هەر شارێک گەورە بووایە، یان بچووک، یاداشتەکەمان پێشکەش دەکردن و پەیامی خۆمان دەگەیاند.

لە قۆناغەکانی ڕێگادا ڕێکخستنەکانی پەکەکە شوێنی

شەومانەوەو پشوودانیان بۆ دابین دەکردین، جار هەبوو شوێنەکە یاریگایەک بوو، جار هەبوو قوتابخانەیەک بوو، جارێکیان شوێنیان دەست نەکەوتبوو، لە شارێکی هۆڵەندا بارەگای ڕێکخراوێکی ئانارشی هەبوو ناوی (ئۆتۆنۆم) بوو، هەموو ترۆتسکی بوون، ئەوێیان دابینکردبوو بۆئەوەی لێی بمێنینەوە. عیسمەت شەریف تووڕە بوو، وتی: "ئەمانە لە ئۆروپا کەس خۆشی ناوێن، ئێوە چۆن لێرە دەمانهێڵنەوە؟"

لەپاش شانزە ڕۆژ گەیشتینە برۆکسلی پایتەختی بەلجیکا، کە پەرلەمانی ئۆروپاو بارەگای یەکێتیی ئۆروپای لێیە. یەکەم کورد کە هات بە پیرمانەوە (دکتۆر مارف عومەر گوڵ) بوو، وتی: "پێنجوێنی ئەم هەرایە چییە لە ئۆروپا ناوتەتەوە"و باوەشی پیاکردم. کوڕێکیش ناوی (سەربەست کەرکوکی) بوو، دکتۆرای تەواوکردبوو، بە ماڵ و منداڵەوە هاتە ناو ڕێپێوانەکەوە. ئیتر وای لێهات وردە وردە کوردی هەموو پارچەکان دەهاتن و ژمارەمان زیادی دەکرد.

شێوازی ڕێپێوانەکەمان بۆ بەردەم پەرلەمانی ئۆروپا وابوو، کە سێ چوار کچ دروشمیان بەرزکردبووەوە، من و عیسمەت شەریف و دکتۆر مارف عومەرگوڵ و چەند برادەرێکی تر ئاڵاو دروشمان بڵند کردبوو لە پێشەوە، ئەوانی تریش بەدواماندا دەهاتن.

کە گەیشتینە بەردەم پەرلەمانی ئۆروپا، هاتن بەرەوپیرمانەوەو وتمان: "دەمانەوێت پەیامی خۆمان بگەیەنینە پەرلەمانی ئۆروپا"، وتیان: "باشە، بەڵام ئەمڕۆو بەیانی پشووە، بڕۆن ئێمە خۆمان ڕۆژی دووشەممە پەیوەندیتان پێوە دەکەین".

بێگومان بەدرێژیی ئەو ماوەیەی لە بەرلینەوە تا برۆکسل، میدیای ئۆروپایی، ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن ڕووماڵی ڕێپێوانەکەیان دەکردو ڕاپۆرت و هەواڵیان لە بارەوە دەکردو دەیانوت: "کورد لە دڵی ئۆروپادا داوای مافی مێژوویی خۆیان دەکەن، داوای ڕاگرتنی شەڕ دەکەن لە تورکیاو خەبات بۆ ئاشتی دەکەن". لە برۆکسل برادەران شوێنێکیان بۆ دابینکردبووین، ئەوێ وەکو خانێک وابوو، هەمووی ژوور ژوور بوو، کەمێک پشوومان دا، هۆڵێکی گەورەی تێدابوو، کۆبوونەوەیەکمان کردو ڕەوتی ڕێپێوانەکەمان هەڵسەنگاند، لایەنی باشەو خراپەو ڕەخنەشمان لەخۆمان گرت.

لە گەرمەی ئەم گفتوگۆیەدا بووین، گوێمان لە تەقەی دەمانچە بوو، من لەسەر مێزێک بووم لەگەڵ چەند برادەرێکدا کۆبوونەوەکەم بەڕێوە دەبردو نزیکی دەرگاکە بووم، سەرم کێشایە دەرەوە، دەبینم شەڕو تێکچڕژانەو

کۆمەڵێک بە چەقۆو قەمەو شمشێرەوە هاتوونەتە سەرمان و برادەرانی پەکەکە کە دیاربوو خۆیان بۆ شتێکی وا ئامادەکردبوو، ڕووبەڕوویان بوونەوەو لە هەموو لایەکەوە هاتن بەتەنگمانەوە، شەڕەکە تا دەهات گەورەتر دەبوو، پۆلیس هات، بەڵام خەریک بوو لە کۆنترۆڵ دەردەچوو و ئاژاوەیەک لەو ناوەدا دروست بوو، ئاگر کرایەوەو خەڵک بریندار بوون، هێزی زیاتری پۆلیسیان هێنا، ڕەوشەکە خراپتر بوو، هێزی سوپاش هات.

ئێمەیان بردە ژوورەوەو پاش ماوەیەک سەرۆکی شارەوانیی برۆکسل و سەرۆکی پۆلیس هاتن و وتیان: "ئێوە خەریکە دەبنە هۆکاری ئەوەی شارەکەمان بسووتێنن". عیسمەت شەریف و ئەو برادەرانەی فەڕەنسییان دەزانی، وتیان: "ئێمە کارێکی مەدەنی و ئاشتییانەمان کردووەو ئەوان هاتوونەتە سەرمان و دەستدرێژ دەکەنە سەرمان و دەیانەوێت بمانکوژن".

پاش ماوەیەک گفتوگۆ، هاتن وتیان: " ئێوە نابێت ئەمشەو لەم شوێنە بمێنن"، ئیتر دەستە دەستە بە ئۆتۆمبێلی سەربازیی بەناو ئەو شەڕو شۆڕەدا دەریانکردین و بردینیان بۆ سەربازگەیەکی گەورە لە دەرەوەی شار، ئەو شەوە لەوێ ماینەوە.

بێگومان شار خرۆشابوو، دەسەڵاتداران مەترسی ئەوەیان هەبوو شەڕی کوردو تورک هەموو شارەکە بگرێتەوە، میدیاش هەموو ڕووداوەکانی ڕوومال دەکرد، کە گورگە بۆرە تورکەکان پەلاماری کوردیان داوە.

سیان چوارێک لە ئێمە بریندار ببوون، بۆ بەیانی ئێمە کۆبوونەوەیەکمان کردو بڕیارمان دا مانگرتن ڕابگەیەنین، بۆئەوەی ڕووداوەکە زیاتر دەنگ بداتەوە. نوێنەری پۆلیس هات بۆ بنکە سەربازییەکەو وتی: "ئێوە کە مان دەگرن داواکاریتان چییە؟"

ئێمە چەند داواکارییەکمان دیاری کرد، کە بەم شێوەیە بوو:

یەکەم: ئەو تورکانەی هێرشیان کردۆتە سەرمان، لەلایەن حکومەتی بەلجیکاوە سزا بدرێن، بەتایبەت کە ئاشکرابوو دووان لەوانە دیبلۆماتکاری تورکن و لە باڵیۆزخانەی تورکیا کار دەکەن.

دووەم: سەرۆکی پەرلەمانی ئۆروپاو سەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتی یەکێتیی ئۆروپا ببینین.

ئەوان بە داواکارییەکانمان ڕازیبوون.

بۆ خاڵی یەکەم، وەزیری ناوخۆی بەلجیکامان بینی و داوای سزادانی تورکە دەستدرێژکارەکانمان کرد.

بۆ خاڵی دووەمیش، سەرۆکی پەرلەمانی ئۆروپاو

سەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتیی یەکێتیی ئۆروپامان بینی.

وەفدێکمان بۆ ئەم دیدارانە پێکهێنا لە من و عیسمەت شەریف وانلی و دکتۆر حسێن قرتاڵ و سەلیم فورات، سەربەست کەرکوکی وتی: "من فەلەمانی دەزانم" و منیش دێم، چونکە وەزیری دەرەوە فەلەمانییە. عیسمەت شەریف سەرۆکی شاندەکەمان بوو، سەرۆکی پەرلەمانی ئۆروپاو سەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتیی ئۆروپامان بینی، کە لەوێ هاتینە دەرەوە، من و عیسمەت و برادەرێکی هەولێری لە ئۆتۆمبێلێکدا بووین و شۆفێرەکەش بە فەرەنسی قسەی دەکرد.

لەدوای پەلاماردانەکەشەوە ئێمە وەفدەکە بۆ هەرکوێ دەچووین، ئۆتۆمبێلی پۆلیس پاسەوانی دەکردین و لە پاش و پێشمانەوە دەڕۆیشت.

ئێمە پاش ئەم هەموو گفتوگۆو دیدارە، هێشتا هەر مانمان لە خواردن گرتووە، لە ئۆتۆمبێلەکەدا عیسمەت لە گفتوگۆکاندا، کە هەم بە قسەکردن و هەم بە وەرگێڕانی قسەکانی من و برادەران زۆر ماندوو ببوو، خەریک بوو بڕستی لێدەبڕاو تەمەنیشی هەبوو، وتی: "کاکە من ئیتر پەکم دەکەوێت"، برادەرە هەولێرییەکە وتی: "خەمت نەبێت من پاکەتێک هەنجیری وشکم پێیە"، دانەیەکی دا بەو،

دانەیەکیشی دا بە من.

نزیک مۆزەخانەیەک بووینەوە، عیسمەت شۆفێرەکەی ڕاگرت وتی: "زۆر تینوومە"، وتم: "کاک عیسمەت بیرت نەچێت ئێمە مانمان لە خواردن گرتووە". وتی: "کاکە قوڕگم وشک بووە، خۆ مانمان لە ئاوخواردنەوەش نەگرتووە!".

٥- بەری خەباتی مانگرتن.

ئێمە پێنج شەش کەسێک بووین کە گفتوگۆمان دەکرد، مانگرتنەکەمان بەری هەبوو، وتیان بۆئەوەی بچنە پەرلەمانی ئۆروپا، دەتوانن پانزە تا بیست کەسێک ژمارەی وەفدەکەتان بێت.

کۆبوونەوەی ناو پەرلەمانی ئۆروپا، زۆر گرنگ بوو، من و عیسمەت شەریف و هەشت کەسمان لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان و جێگری سەرۆکی پەرلەماندا چووینە سەر سەحنە.

سەرۆکی فراکسیۆنەکان و نوێنەرانی ئۆپۆزسیۆن ئامادە بوون، چەپکەگوڵیان پێشکەش کردین, یەک دوو کەس لە ئەندامانی پەرلەمانی ئۆروپا قسەی باشیان کرد سەبارەت بە کورد، یەکێکیان وتی: "تەنها لەمپەر لە بەرامبەر فاشییەتی تورکیدا، کوردن، ئەوان نەتەوەیەکی

گەورەو دێرینی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستن، بۆیە مافی خۆیانە دەوڵەتیان هەبێت"، ئەوەشی بیرهێنایەوە کە تورکەکان ئەگەر دەسەڵاتیان هەبێت، ئۆروپاش داگیر دەکەن، کاتی خۆی عوسمانییەکان تا ڤیەننا هاتوون.

کەسێکی تر قسەی کرد لە بەرژەوەندیی کوردو وتی: "ئەمانە گەلێکی دێرینن و لەنێوان تورکیاو ئێراق و ئێران و سوریادا دابەشکراون"، ئیتر قسەکانیان هێندە حەماسەت ورووژێن بوو، چەپڵەڕێزانی لێکەوتەوە.

یاداشتەکەی خۆمان دانێ، عیسمەت بە زمانی فەرەنسی قسەی لەگەڵ دەکردن، وتمان: "دەمانەوێت کێشەی کورد لە باکوور بە ئاشتی چارەسەر بکرێت"، ئەو دەمە لە کوردستانی باشوور شەڕی ناوخۆ بوو، کە عیسمەت منی پێ ناساندن، زۆربەی پرسیارەکانیان لە من دەکرد، منیش بەدرێژیی باسی شەڕەکەم بۆ کردن.

لەوەوبەریش (شازاد سائیب) نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ئۆروپا بە تەلەفۆن پەیوەندیی پێوە کردبووم، وتی: "کە چوونە پەرلەمانی ئۆروپا، باسی بارودۆخی باشوور بکەو داوا بکە، کە ئۆروپا لە نەتەوەیەکگرتووەکان پشتگیریی هێزی دژەفڕین و چەکوشی ئامادە بکات و بەردەوام بێت لە هاوکارییە مرۆییەکانی بۆ گەلی باشوور".

من لەوێ باسم لەوە کردو داوای پشتیوانی ئۆرووپام کرد بۆ خەڵکی باشوور.

باسمان لەوە کرد کە ئێمە نوێنەرایەتی ڕۆشنبیرانی هەر چوارپارچەکەی کوردستان دەکەین و لەگەڵ ئاشتیداین و دەمانەوێت ئێوە پشتیوانی مافی گەلی کوردبن.

ڕۆژنامەکانی بەلجیکا بە بایەخێکی زۆرەوە ڕووماڵی ئەو سەردانەیان کردو زۆریشیان لەبارەوە نووسی، بەهۆی ئەو چالاکییەشەوە لەناو میدیادا، دۆزی کورد لە ڕۆژئاوا دەنگیدایەوە.

٦- بینینی وەزیری دەرەوەی بەلجیکا.

ئاگاداریان کردینەوە کە وەزیری دەرەوەی بەلجیکا دەیەوێت شاندەکە ببینێت، لەکاتی دیدارەکە ئاگاداریان کردینەوەو بردینیان بۆ ئۆفیسی وەزیر، بەڕێزەوە پێشوازیی لێکردین و وتی: "وەزیری دەرەوەی تورکیا هەواڵەکانی ڕۆژنامەو میدیای ئێرەی پێگەیشتۆتەوە، کە من پێشوازیی لە ئێوە دەکەم، پێی وتم کە ئەوانە تیرۆریستن و نابێت بیانبینیت، بەڵام من لە وەڵامدا پێم وت، ئێمە وڵاتێکی دیموکراسین و ئەوانەش چالاکییەکی دیموکراسییان کردووە لە وڵاتەکەمان و لە چوارچێوەی یاساشدا ئەمە

ڕێپێدراوە، بۆیە ئاساییە بیانبینم".

با بیرم نەچێت، لەم دانیشتنەماندا لەگەڵ وەزیری دەرەوەو لە پەرلەمانی ئەوروپاش، دکتۆر سەربەست کەرکوکی کە یەکێک بوو لە ئەندامانی شاندەکە، لەبەرئەوەی زمانی فەلەمانی دەزانی، سەعییەکی چاکی کرد لە وەرگێران و گەیاندنی پەیامەکەماندا.

بێگومان جەنابی وەزیر پێشوەخت ناوی ئێمەی بۆچوبوو، دوای ئەوەی هەریەکە خۆمان ناساند، کە نوێنەری باشوورو باکوورو ڕۆژئاواین و ئەو قسانەی لە پەرلەمانی ئۆروپا کردبوومان، دووبارەمان کردەوە، کەوتە پرسیارکردن لێمان، پرسیاری بارودۆخی ئێراقی لە من کردو پرسی: داخۆ سەدام حسێن تا کەی لە دەسەڵاتدا دەمێنێتەوەو زۆرشتی تر باسکرا، دوای کۆبوونەوە کە وێنەی لەگەڵ گرتین و کاتی ئەوە هاتبوو کە بڕۆین، بە سەربەستم وت: "پێی بڵێت من قسەیەکم ماوە دەتوانم بیکەم"، وتی: "دەتوانیت"، وتم: "جولەکە گەلێک بوون وەکو کورد مافیان زەوتکرابوو، کاتی خۆی لەسەر بەڵێنی وەزیرێکی ئینگلیز وەعدی بەلفۆری پێدان و دەوڵەتێکیان بۆ دامەزراندن، ئێوەش وڵاتێکی گرنگن لە یەکێتیی ئۆروپادا، دەتوانم قسەیەک لە تۆ وەرگرم کە پشتیوانمان دەبیت لە

دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیدا؟"

دوایـی زانیم کابرا خـۆی جولەکە بـوو، بۆیە کە ئەم قسانەم کرد پێی خۆش بوو، بەڵام لە وەڵامدا وتی: "من دەزانم کورد گەلێکە غەدری لێکراوەو مافی خۆتانە داوای دەوڵـەت بکەن، بـەڵام ئێستا دنیا گـۆڕاوەو بەرژەوەندیی سیاسی وڵاتان بڕیار لەوە دەدات و ناتوانم بەڵێنێکی وا بدەم، بەڵام من ئەوەی لە توانامدا بێت بۆ پشتیوانیکردنتان، دەیکەم".

ئـەوەی مـن دەمـویـسـت، دەسـتـم نـەکـەوت، بـەڵام ئەو قسەیەش لـەو سـەردەمـەدا لـەلایـەن وەزیـری دەرەوەی وڵاتێکی وەکو بەلجیکاوە، کەم نەبوو.

جا با شتێکی خۆش باس بکەم، پاش مـاوەیـەک ئەو کابرایە بوو بە سەرۆکی هاوپەیمانی (ناتۆ)، منیش بە ناوی ئینستیتیوتی کوردییەوە لە بەرلین، نامەی پیرۆزباییم بۆ نارد، بەبۆنەی دەستبەکاربوونی وەک سەرۆکی هاوپەیمانی ناتۆ، وتم: "ئێستا ئەم پێگە نوێیەت لەوەی پێشوو کاریگەرترەو بەڵێنەکەشیم بەبیرهێنابووەوە بۆ پشتیوانیکردن لە دۆزی کورد". بە سوپاسەوە وەڵامی نامەکەی دامەوەو ئێستاش ئەو نامەیە لە ئەرشیفی ئینستیتیوتدا پارێزراوە، کۆڵێک دڵخۆش بووم و لای دۆست و برادەران دەموت کاتی خۆی بینیومانەو بەڵێنی پشتیوانیکردنی دۆزی کوردی پێداوین.

ڕۆژگار هات و چوو، کەچی بۆ نەگبەتی کورد، کاکم لەسەر گەندەڵی لە سەرۆکایەتیی هاوپەیمانێتی ناتۆ لادرا!

تێبینییەک:

پاش کۆتاییهاتنی ڕێپێوانەکەو گەیاندنی پەیامەکەمان، بە برادەرانی پەکەکەم وت: "ئێوە کە خۆپیشاندان دەکەن، دروشم و هوتافکێشانتان بە تورکییە، خەڵکی بەلجیکا لە کوێ لە زمانی تورکی، یان تەنانەت لە کرمانجی دەگات؟ پێشنیارم کرد لە هەر وڵاتێک خۆپیشاندان دەکەن، بە زمانی ئەو وڵاتە دروشمەکان بڵێنەوە، لە ئەڵمانیا بە ئەڵمانی، لە بەریتانیا بە ئینگلیزی و لە فەڕەنساش بە فەڕەنسایی، بۆئەوەی خەڵکی ئەو وڵاتە لە داواکانتان تێ بگات".

٧- ستایشی ئاپۆ.

ئەو ڕێپێوانە بۆ بەلجیکاو چوونمان بۆ پەرلەمانی ئۆروپاو سەردانی یەکێتیی ئۆروپاو چالاکییەکانی ترمان دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، چ لە میدیای ئەوروپی، چ لەناو کوردەکانی ئۆروپادا. دەیانوت "پەکەکە دەتوانێت شتی گەورە بکات لە ئۆروپا"، ئەمەش بۆ ناوبانگی پەکەکە گرنگ بوو. ئەمە وەک سەرەتای ناساندنێکی گەورەتری پەکەکەو بووژانەوەی چالاکییەکانی بوو لە ئۆروپا.

کانی یەڵماز پێی وتین: "سەرۆک ئاپۆ زۆر بەم کارانە دڵخۆش بووەو ستایشی زۆری هەموان و تۆو کاک عیسمەت دەکات".

گەڕابووینەوە بەرلین، شەوێک ئاگاداریان کردین کە فلانە سەعات دەچینە ماڵێک، لەوێ سەرۆک ئاپۆ بە تەلەفۆن قسەمان لەگەڵ دەکات. کە چووینە شوێنی دیاریکراو، پاش کەمێک ئاپۆ تەلەفۆنی کرد، یەکەیەکە قسەی لەگەڵ کردین، من، عیسمەت شەریف، حسێن کارتال، بەشار کایا، کانی یەڵمازو دڵبخوین داراو دەستخۆشی لێکردین، بۆ ئەو کارانەی کردوومانەو بەڵێنی پشتیوانیکردنی داین، کە منیش قسەم لەگەڵ کرد بەتایبەتی دەستخۆشی لێکردم و هانیدام کە بەردەوامبین لەسەر ئەو ڕێبازە، وتی: "بە برادەرانم وتووە تۆ هەرچی پێشنیاز بکەیت، جێبەجێی بکەن، ئەمەش ژمارەی تایبەتی خۆمە بۆ هەرشتێک پێویستی کرد، خۆت قسەم لەگەڵ بکە". هەرواش بوو، ئیتر بۆ پرس و ڕا گۆڕینەوە ڕاستەوخۆ قسەم لەگەڵ ئاپۆ خۆیدا دەکرد.

٨- سۆرمانجی.

ئێمە بەردەوام لەگەڵ دلبخوین دارا، کە ببووە سەرپەرشتیاری کاروباری ڕۆشنبیریی پەکەکەو

سەرکردەکانی تری پەکەکە، لە گفتوگۆدا بووین، کە چۆن کاری تر بکەین بۆئەوەی کوردانی ئۆروپا یەکبخەین و کۆیان بکەینەوە، بەشێوەیەک کاریگەریی هەبێت.

پێشنیارم کرد کە هێندێ کاری سەندیکایی بکەین و هەوڵبدەین ڕێکخراوی پیشەیی لەسەر ئاستی هەر چوارپارچەکە بۆ هەموو توێژەکان دروست بکەین. بۆ نموونە یەکێتیی مامۆستایانمان دروستکرد، یەکێتیی پزیشکان، یەکێتیی ڕۆژنامەنووسان، یەکێتیی هونەرمەندان.

ئیتر ئەوان لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی خۆیانەوە پەیوەندییان دەکردو خەڵکەکەیان کۆدەکردەوە، سەردانی شارەکانمان دەکردو منیش لە ڕێگای پەیوەندییەکانی خۆمەوە، هەرکەسم دەناسی بانگم دەکردن بۆ کۆبوونەوەی دامەزراندنی ئەو یەکێتییانە.

لە کۆبوونەوەکاندا قسەم دەکرد، وردە وردە کرمانجییەکەشم باش ببوو، بۆ شۆخیش زمانێکی تێکەڵم دروستکردبوو لە سۆرانی و کرمانجی، بۆئەوەی هەموان لێی تێبگەن، ناوم نابوو (سۆرمانجی)، بۆیە لەمەودوا جگە لەوەی دەیانوت پێنجوێنی هەڤاڵی سەرۆکە، داهێنانی ئەم زمانەشیان دەدایە پاڵم، ئەمەش ناوبانگێکی باشی بۆ پەیداکردبووم، چونکە دەمتوانی بەباشی پەیام و ڕای خۆم

بگەیەنمە ئامادەبووانی کۆڕو کۆبوونەوەکان.

یەکێک لەو وتارانەم کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو لەناو ڕێکخستنەکانی پەکەکەدا، ئەو وتارەم بوو لە کۆبوونەوەی دامەزراندنی یەکێتیی مامۆستایاندا دام لە شاری (ڕۆتمۆند)، کە پاشان بە کاسێت و سیدی بڵاوکرایەوە.

دوو سەرنج:

یەکەم:

ئەوەی سەرنجم دا لە کاتی دامەزراندنی ئەو یەکێتییە پیشەییانەدا ئەوە بوو، هەندێک برادەرانی لایەنگرانی حزبەکان دەیانویست نەخۆشییەکانی ناو کاری ڕێکخراوەیی باشوور، بگوازنەوە بۆ ناو ئەم ڕێکخراوانەش، لەوانەش پشک پشکێنەو نوێنەرایەتی حزبەکان لە دەستەی باڵای بەڕێوەبردنی ئەم ڕێکخراوانەدا. من زۆر دژی ئەوە بووم، دەموت: "ئەم برادەرانەی پەکەکە مەبەستیانە لێرە دۆزی کورد بەهێز بکەن و نییەتیان پاکە، با ئەم نەریتە لە ئۆرووپادا نەبێت و خەمی هەموومان بەهێزکردنی پەیوەندیی نێوان کوردانی پارچەکان و نوێنەرایەتییان بێت لە دەرەوەی وڵات".

دووەم:

هێندێک لە کوردانی باشوورو تەنانەت خۆرهەڵاتیش، هەر گومانیان دەکرد لە کارکردن لەم ڕێکخراوانەدا، ئەمەش بە هاندانی ئەو حزبانەی کوردستان بوو، کە ئەوان لایەنگری بوون.

دەویست قەناعەتیان پێ بکەم، لەمەدا گوێ بە حزبەکانیان نەدەن، وەک کورد بەشداریی بکەن.

هەموو ئەم خۆڕێکخستنانە لەناو ئەو ڕێکخراوانەدا، سودی بۆ دۆزی کوردی هەبوو، بۆ نموونە: بەهۆی دامەزراندنی یەکێتیی هونەرمەندانەوە، زۆربەی هونەرمەندانی هەر چوارپارچەکە، لێکتر نزیکبوونەوەو کارو چالاکی هونەری کوردی برەوی سەند.

هونەرمەندی گەورەی وەک (قادر دیلان)م لە (براگ)ەوە بانگهێشت کردو بە هەموانم ناساند، (فەرەیدوون دارتاش)م بانگکردو خەڵکێکی زۆر کە ناوی هەموویانم بیر نەماوە، لە شانۆکارو تەشکیلی و مۆسیقی و گۆرانیبێژ، هەموان لێکتر نزیکبوونەوە، لەسەر ئاستی هەموو پارچەکان ناسران و ئەدرەس و تەلەفۆنی هەموو ئەوانەمان وەرگرت و پەیوەندیمان لەگەڵدا دروستکردن، لە بواری هونەری و فەرهەنگی و بوارەکانی تریشدا ئەمە لەوەوبەر نەکرابوو.

بۆ نموونە لە بەرلین فێستیڤاڵێکی شانۆییمان ڕێکخست، کە دە ڕۆژی خایاند، شانۆگەریی گرنگی تێدا پێشکەشکرا، کە هونەرمەندەکانی هەر چوارپارچەکە تێیدا بەشداربوون.

هاتینە سەر ئەوەی لە ئۆروپا مۆزەخانەیەک بکەینەوەو تابلۆی هونەرمەندانی هەر چوارپارچەکەی کوردستانی تێدا نمایش بکەین، بۆئەوەی گەلانی تر بزانن کە ئێمە میللەتێکین هەر جەنگاوەر نین و هونەرو فەرهەنگمان هەیە.

٩- سەردانی ڤاتیکان و پاپا.

لەیادمە لە گازینۆیەک لە شاری بۆن دانیشتبووین، لەگەڵ دلبخوین، ئەو دەمە دلبخوین بە فەرمی ببوو بە بەرپرسی بزاڤی ڕۆشنبیریی پەکەکە لە ئۆروپا، وتم: "با سەردانێکی پاپاو سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان بکەین"، وتی: "ئەمە ڕەزامەندیی سەرۆک ئاپۆی دەوێت".

من پێشتر قسەم لەگەڵ عیسمەت شەریفدا کردبوو، ئەویش زۆری پێ باش بوو، ڕاستەوخۆش قسەم لەگەڵ ئاپۆ کردو بە دلبخوینیشم وت بە فەرمی کار بۆ ئەوە بکات.

ڕەزامەندیی وەرگیراو لە ئینستیتیوت دانیشتین، بۆئەوەی سەردانەکە ڕێکبخەین، ڕێکەوتین من و عیسمەت و دلبخوین و عەبدولڕەحمان دوورە کە پێشتر موفتی

دیاربەکر بوو و هاتبووە دەرەوەو شاعیرو نووسەریش بوو، شاندی نوێنەرایەتی کوردبین بۆ سەردانی ڤاتیکان و بینینی پاپا.

پێیان وتین "بینینی پاپا شتێکی کەم نییەو لەوەوبەر زۆرکەس و لایەنی سیاسی دhوای بینینی پاپایان کردووەو نەیانبینیوە، بەڵام ئێوە لەبەرئەوەی نوێنەری دامەزراوەیەکی کلتووریی دەکەن، پاپا پێشوازیتان لێدەکات.

بە ناوی ئینستیتیوتی کوردییەوە لە بەرلین چووینە خزمەتی پاپا، عیسمەت شەریف بە فەڕەنسی کەوتە قسەکردن و باسی دۆزی کوردی کردو داوای پشتیوانی پاپاو ڤاتیکانیشی کرد.

پاپا بەڵێنی دا نوێژو نزا بۆ کورد بکات، دواییش وایکردو لە نوێژەکەیدا وتی: "لە خوا دەپاڕێمەوە میللەتی کورد لەژێردەستی ڕزگار بکات".

ئەمەش کاردانەوەیەکی گەورەی هەبوو، چونکە میدیا بە بایەخەوە باسی ئەم سەردانەی کردو بۆ ئەو دەمە سەبارەت بە دۆزی کورد سەردانی پاپا زۆر کاریگەر بوو، دوای ئێمە شاندێکی تری ژنانی کوردی سەر بە پەکەکە سەردانی پاپایان کردو بە کوردی ڕۆژباشی لێکردبوون.

جا لەو سەردانەدا من بە جلی کوردییەوە چوومە لای

پاپاو ڕانکوچۆغەم لەبەر کردبوو، بۆینباخیشم بەستبوو، بۆیە چاوی کامێرا لەسەر من بوو، وایان دەزانی من قەشەیەکی کوردم و ئەم جلوبەرگەش تایبەتە بە پیاوانی ئاینی مەسیحی کوردستان و لەو بارەیەوە پرسیاری زۆریان کردو منیش تەقەی سەرم دەهات.

(هۆمەر دزەیی) ئەودەمە لە ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا کاری دەکرد، بە تەلەفۆن گفتوگۆیەکی لەگەڵ کردم بۆ ڕادیۆکە، منیش بە درێژیی باسی سەردانەکەی پاپام کردو وتیشم: "بەڵێنی پێداوین نوێژمان بۆ بکات"، کە لێبوومەوە هۆمەر وتی: "هەر بە تەنها نوێژێک؟!".

١٠- سەردانی نەتەوەیەکگرتووەکان.

ئێمە لە گفتوگۆکانمان لە ئینستیتیوتی کورد باسی سەردانی ڤاتیکان و پاپامان کردبوو، باسی سەردانی نەتەوەیەکگرتووەکان و سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکانمان کردبوو. سەردانی پاپا شتێکی کەم نەبوو، (دکتۆر کەمال فوئاد)، کە ئەو دەمە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، بە تەلەفۆن پێی وتم: "ئەم کارەتان چۆن کردووە، ئێمە سێ ساڵە دەمانەوێت سەردانی پاپاو ڤاتیکان بکەین".

که ئهم کارهمان به سهرکهوتوویی ئهنجام دا، کهوتینه سهر خهیاڵی ئهوهی سهردانی نهتهوهیهکگرتووهکان و سکرتێری گشتی بکهین.

ئهم کاره ئاسان نهبوو، له کوێوه دهست پێ بکهین؟

من به پهیوهندییهکانی خۆمدا چوومهوه، گهڕامهوه بۆ ئهودهمهی ئهندامی ئهنجومهنی نیشتمانی ئێراق بووم، دهبوو کهسێک بدۆزمهوه که له دهوڵهتدا وهزیر بووبێت، یان له بواری دیبلۆماسیدا کارێکی کردبێت، بروسکهیهک به خهیاڵمدا هات و ناوی (عیسمهت کهتانی) وهک وێنهی فۆتۆگراف لهبهرچاومدا کهوته چوارچێوهوه.

عیسمهت کهتانی له بنهماڵهیهکی به ناوبانگی دهۆک بوو، ئهندامی ئهنجومهنی نیشتمانیی ئێراق و ماوهیهکیش وهزیر بوو، دوایی چووه دهرهوهو ببوو به یهکێک له یاریدهدهرهکانی سکرتێری نهتهوهیهکگرتووهکان بۆ کاروباری مرۆیی له خۆرههڵاتی ناوهڕاست.

هۆمهر دزهیی که هاوڕێی تهمهنم بوو، له ڕادیۆی دهنگی ئهمریکا کاری دهکرد، تهلهفۆنم لهگهڵ کردو وتم: "کاکه دهمهوێت ژمارهی تهلهفۆنی عیسمهت کهتانیم بۆ پهیدا بکهیت". هێندهی نهبرد هۆمهر دزهیی کارهکهی مهیسهر کردو ژمارهی تهلهفۆنهکهی بۆ ناردم.

لە بەرلینەوە تەلەفۆنم لەگەڵ عیسمەت کەتانیدا کردو ناسیمییەوەو لە هەواڵی پرسیم، وتم: "دوو ساڵێکە لە بەرلین ئینستیتیوتی کوردیمان دامەزراندووە، کارو چالاکی دەکەین، وتی: "ئاگام لێتانە". وتم: "من ئێستا لە بەرلین جێگری عیسمەت شەریف وانلیم، کە سەرۆکی ئینستیتیوتەکەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوماڵی لە (لوزان)ە لە (سویسرا)، من سەرەوکاری ئیشەکان دەکەم و بە ناوی ئینستیتیوتەکەوە داوای بینینی (پوترس گالی) لێ دەکەم.

عیسمەت وتی: "ئەو کارە هەروا ئاسان نییەو سەرۆکی هەموو حزبە کوردییەکان پێش تۆ ئەم داوایەیان کردووە"، وتم: "ئێمە ڕێکخراوی سیاسی و حزب نین و نوێنەرایەتی لایەنی فەرهەنگ و کلتوور دەکەین. پێگەی یاسایی و مۆڵەتی کارکردن و ئەدرەس و ئۆفیسمان هەیە"

ئەدرەس و شتمان گۆڕییەوەو وتی: "نووسراوێک بکەن بە ناوی ئینستیتیوتەوە بۆ ئۆفیسی سەرۆکی نەتەوەیەککرتووەکان".

لەگەڵ عیسمەت شەریف وانلی و برادەران کەوتینە کنەی نووسینی نامەیەک بۆ سەرۆکی نەتەوەیەککرتووەکان.

نامەکەمان وا هۆنییەوە کە ئێمە نەتەوەیەکی دێرینین و تایبەتمەندی خۆمان هەیە، زمان و کلتوورو فەرهەنگمان

هەڕەشەی لەسەرەو مافمان زەوتکراوەو لە باشووری ئێراق ئەنفالکراوین و چەکی کیمیاییان لە دژمان بەکارهێناوە، بۆ گەیاندنی پەیامی خۆمان، داوای بینینی سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکەین.

نامەکەمان بە فاکس ناردو بە تەلەفۆنیش عیسمەت کەتانی ئاگاداری کردمەوە نامەکە گەیشتۆتە بەردەستی پوترس گالی.

پاش ماوەیەک عیسمەت کەتانی تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی: "داواکارییەکەتان بۆ بینینی سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان پەسەندکراوەو ڕۆژی (١٩٩٥\٣\٢١) دەتانبینێت".

دواتر بە فاکس و بە پۆستیش لە ئۆفیسی سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە وەڵامەکەمان بەدەست گەیشت.

بۆ وەرگرتنی ڤیزەی ئەمریکایی، سەردانی باڵیۆزخانەی ئەمریکاییم کرد، ئەگەرچی هۆکاری سەفەرەکەشم بۆ باسکردن، بەڵام هەوڵەکەم سەرکەوتوو نەبوو.

ئەودەمە لە ئەمریکا کۆنگرەی نیشتمانی کورد هەبوو (کەی ئێن سی) دکتۆر (نەجمەدین کەریم) سەرۆکی بوو، بە تەلەفۆن پەیوەندیم پێوەکردو وتم: "دەمەوێت بۆ کارێکی وا بێم بۆ ئەمریکاو لەبەرئەوەی من پەنابەرم، ڤیزەم نادەنێ،

بەڵکو تۆ بە ناوی کۆنگرەی نیشتمانییەوە داوەتنامەیەکم بۆ بکەیت".

دکتۆر نەجمەدین وتی: "مادەم کارەکە بۆ بەرژەوەندیی کــوردە، بــە چـــاوان". پــاش مـاوەیـەکـی کـەم بـە فاکس داوەتنامەکەی بۆ ناردم، بردم بۆ باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە بەرلین و ڤیزەی ئەمریکام وەرگرت.

شاندەکەی ئینستیتیوتی کورد بۆ سەردانی ئەمریکا من و عیسمەت شەریف وانلی و عەلی یەگید بووین.

عیسمەت وتـی: من هەندێک ئیشی خـۆم هەیە "ئێوە بڕۆن لەوێ لە وادەی خۆیدا دەگەم و یەکدەگرینەوە"، عەلی یەگیدیش ڕۆژێک پێش من سەفەری کرد.

بــەرلــەوەی بچین بـۆ ئـەمـریـکـا، بـرادەرانـــی پەکەکە ئاگاداریان کردبووین کە لە واشنتن بیرۆیەکیان هەیە، کە دەگەینە ئەوێ پرۆگرامێکی کارو چالاکیمان بۆ ئامادەکراوە.

بەرپرسی بیرۆکەی پەکەکە لە واشنتن کوڕێکی یەزیدی بوو، بە ناوی (ئیلهان قزڵهان) ، دکتۆرێکی بەناوبانگ بوو، هەرکە گەیشتین لە پێشوازیدا بوو.

دلـهـان پرۆگرامێکی چڕوپڕی بۆ دانـابـوویـن و دوو هەفتەشمان بەدەستەوە بوو، هەتا وادەی بینینی پوترس گالی دەهات.

لەو ماوەیەدا هەتا عیسمەت شەریف وانلی گەیشتە واشنتن، من و عەلی یەگید بیستودوو کۆنگریسمان و یانزە سیناتۆرمان بینی. وەکیلی وەزیری دەرەوەی ئەمریکامان بینی.

دوو سێ ئینستیتیوتی گەورەی لێکۆڵینەوە کۆنگرەی ڕۆژنامەوانییان بۆ ڕێکخستین. لەو دیدارانەی کە زۆر گرنگ بوون، بینینی (جۆ پۆرتەر) بوو، ئەم پیاوە ئەودەمە سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییە دەرەکییەکانی کۆنگریسی ئەمریکایی بوو. کە چووین بۆ بینینی پۆرتەر، هەشت نۆ کەسی تری لێبوو، دواتر زانیمان نوێنەری (سی ئای ئەی و پنتاگۆن)یان تێدا بووە. لەوێ گفتوگۆی گەرم دامەزرا، کە زانییان من کوردی ئێراقم، بەهۆی بارودۆخی ئەوکاتەی ئێراق و کوردستانەوە، زۆر پرسیاریان لێکردم، بەپێی تواناو لە بەرژەوەندیی کورد وەڵامم دایەوە، هاتنە سەر پرسیاری تر سەبارەت بە پەکەکە، وتیان: "ئەوانە تیرۆریستن". وتم: "بەداخەوە ئێوە زانیارییەکانتان لە دەزگا هەواڵگرییەکانی تورکیاوە وەردەگرن، پەکەکە کوردی نیشتمانپەروەرن، خەبات دەکەن بۆ بەدەستهێنانی مافی کورد بە شێوەیەکی دیموکراسی، بەڵام تورکیا نکۆڵی لە بوونی کورد دەکات، لە زمان و فەرهەنگ و بوونی وەکو مرۆڤ".

دوای کۆبوونەوەکە چووین قاوەیەکمان خواردەوە، پۆرتەر وتی: "من زۆر سودم لە ئێوە بینی و بەهۆی ئەم گفتوگۆیەوە باشتر لە کێشەی کورد تێگەیشتم".

یەکێک لە دیدارە گرنگەکانی ترمان، بینینی (تۆم لانتۆس) بوو، تۆم لانتۆس ئەودەمە یەکێک بوو لەو ئەقڵانەی کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دادەڕێژن، خۆی و ژنەکەی سیناتۆر بوون، ئەوکاتەی بۆمان تەرخانکرابوو بۆ بینینی، نیو سەعات بوو، بەڵام دانیشتنەکە ئەوەندە بەباشی بەڕێوەچوو، زیاتر لە سەعاتێکی خایاند.

بەتایبەت کە ئەو زۆر پرسیاری لەسەر بارودۆخی ئێراق و کوردستان و تورکیا لە من دەکرد.

بابیرم نەچێت لە هەموو ئەم دانیشتنانەدا برادەرێکمان لەگەڵ بوو، کوردی باکوور بوو، ناوی (گاوان) بوو، هەر لە منداڵییەوە هاتبووە ئەمریکاو ئینگلیزییەکی باشی دەزانی، ئەو زیرەکانە کاری وەرگێڕانی دەکرد.

دانیشتنێکی گرنگی ترمان ئەوە بوو، کە لەگەڵ سیناتۆر (جۆ کەنەدی) بوو، کە برازای (جۆن کەنەدی) سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا بوو.

سەرەتا من قسەم کرد، وتم: "جێگەی شانازیمە کە لەگەڵ یەکێک لە بنەماڵەی جۆن کەنەدی دادەنیشم، کە

ئێوە لەپێناوی چەسپاندنی دیموکراسی و یەکسانیی مافی مرۆڤ لە ئەمریکادا قوربانیتان داوەو خەباتی کوردیش لە هەر چوارپارچەی کوردستان بۆ بەدەستهێنانی ماف و بەدیهێنانی دیموکراسییە". ئەم پێشەکییەی من دەرگای ئاوەڵا کرد کە جۆ کەنەدی بە سنگێکی فراوانەوە گوێمان لێبگرێت، دیدارەکەمان نزیکەی سەعاتێکی خایاندو پەیامی خۆمان سەبارەت مەبەستی سەردانەکەمان بۆ ئەمریکاو بینینی پوترس گالی بۆ ئەویش باسکرد، ئەویش چەند پرسیارێکی کردو بەم جۆرە دەتوانم بڵێم دیدارەکە سەرکەوتوو بوو، لە کۆتاییشدا هەر خۆی داوای لێکردین کە پێکەوە بۆ یادگاریی وێنەیەک بگرین.

١١- نوونە کوژراو.

هێشتا عیسمەت شەریف وانلی نەگەیشتبوو، لەگەڵ عەلی یەگیدو گاوان، سەردانێکی کالیفۆرنیامان کردو لەوێ هێندێک برادەری کۆنم بینی، لەوانە: ( جەمال بەختیارو نەریمانی بەهجەتی عەونی)، کە زۆر خۆشحاڵبوون و وتیان: تا ئێستا هیچ شاندێکی کوردی سەردانی ئێمەی نەکردووە.

لە کالیفۆرنیا ئێمە چووینە شاری (ساندیاگۆ)و خانەخوێکەمان دکتۆر (هەڤاڵ) بوو، کە خۆی کوردی

باکوورەو هاوژینەکەی کچی (کامیل) بوو، ناسیاوی کۆنم بوو، کاتی خۆی شیوعی بوو بە ئەسڵیش عەرەبە.

کوڕێک هەبوو لە وشارە ناوی (غەریب) بوو، پێنجوێنی بوو، لە شەستەکانەوە چووبووە ئەمریکا، ڕۆژنامەنووسێکی (واشنتن پۆست)، کە هەواڵی سەردانەکەی ئێمەی بۆ واشنتن بینیبوو، داوای لەو کوڕە پێنجوێنییە کردبوو من بدۆزێتەوە، بۆئەوەی چاوپێکەوتنم لەگەڵدا بکات.

ڕۆژنامەنووسەکە کە ئێستا ناویم بیر نەماوە، گۆشەنووس بوو لە ڕۆژنامەی واشنتن پۆست، پیاوێکی بەتەمەن، بە چاویلکەو گۆچانەوە هات بۆ ماڵی دکتۆر هەڤاڵ و وتی: "پێنجوێنی کامەیە؟".

وتیان: "ئەوەیە"، باوەشی بە مندا کردو منیش وتم: "دیارە لەگەڵ تۆدا خزمین، وا بە گەرمی باوەشم پیا دەکەیت؟:، پێکەنی و وتی: "دانیشە با بۆت باسکەم".

وتی: "من هەواڵی ئەم سەردانەی ئێوەم لە ڕۆژنامەکاندا خوێندۆتەوە، ویستم لەبارەی کوردەوە زانیاریم هەبێت، بەتایبەتیش من جولەکەم، بۆیە دەمەوێت سەبارەت بە جولەکەکانی پێنجوێن پرسیارت لێ بکەم".

لە بەینی "هەرگێنە"و پێنجوێندا، شیوێک هەیە پێی دەڵێن شیوی (نوونە کوژراو)، چیرۆکەکە وایە کە (نوونە)

جولەکەیەکی خەڵکی پێنجوێن بووەو هێسترێکی پێبووەو بە گوندەکاندا گەڕاوە، وردەواڵەی فرۆشتووەو لەو شێوەدا کوژراوە.

پاش پرسیارێکی زۆر سەبارەت باردۆخی کوردستان و ئایندەی ئێراق، کابرای ڕۆژنامەنووس هاتە سەرپرسیارکردن لەسەر جولەکەکانی پێنجوێن و ڕووداوی کوشتنی (نوونە).

من باسی جولەکەکانی پێنجوێنم کردو وتم: "بە مەزەندەی من پەنجا ماڵێکی جولەکە لە پێنجوێن هەبوون، کە زوربەیان کۆچیان کردووە بۆ ئیسرائیل و کەمێکیشیان لەوانەی ماونەتەوە، بوون بە موسڵمان".

باسی ئەوەشم کرد، دوو بنەماڵەی بەناوبانگ هەن لە پێنجوێن، بنەماڵەی (مخە)، کە دەوترێت لە (میخائیل) ناوێکی جولەکەوە هاتووەو بنەماڵەی (بارام)، کە سەبارەت بە ئەمیش دەوترێت لە (ئەبراهام)ەوە هاتووە، کە ئەمیش هەر جولەکە بووە.

سەبارەت کوشتنەکەی نوونەش، وتم: "بە چەند شێوەیەک دەگێڕدرێتەوە".

یەکەم: دەڵێن فەقیەکانی مزگەوتی پاشا، خەڵکیان لێ هانداوەو وتوویانە ئەمە جولەکەیەو ئاینی جولەکە بڵاو دەکاتەوەو لە بارودۆخێکی تایبەتدا کوژراوە.

دووەم: دەڵێن دزو جەردە لەو شیو و چۆڵە، زەفەریان پێهێناوەو پارەو کەلوپەلیان لێسەندووەو کوشتوویانەو هێسترەکەشیان بردووە.

سێیەم: دەڵێن کە پۆلسی نهێنی ئەو کاتەی ئێراق پێی زانیوە، کە کار بۆ ڕێکخراوێکی زایۆنیزمی دەکات و تیرۆریان کردووە.

وتیشم: "ئەمانە کامیان ڕاستە، نازانم"، بەڵام منیش پرسیارێکم لە ڕۆژنامەنووسەکە کردو وتم: "تۆ بۆچی بە بایەخەوە لەم چیرۆکە دەپرسیت؟".

وتی: "نوونە لای ئێمەی جولەکە قارەمانێکی خەباتی سەربەخۆییە، ئەو ئەندامی یەکێک لەو ڕێکخراوانە بووە کە ڕاسپێردرابوو بە کوردستاندا بگەڕێت، هانی جولەکە بدات بۆئەوەی بچن بۆ ئیسرائیل، من بۆیە هاتووم تۆ ببینم، چونکە بەدوای ئەم چیرۆکەوە بووم، ئێستا زانیت بۆچی باوەشم پیاکردیت و وتم دەمەوێت پێنجوێنی ببینم؟".

ئینجا پرسیاری کردو وتی: "دەتوانم بەناوی تۆوە، ئەم دیدارەم بکەم بە وتارێک لە گۆشەکەمدا، لە واشنتن پۆست بڵاوی بکەمەوە؟. وتی: "تۆ پەناهەندەیت، ئەمە بۆ تۆخراپ نییە؟" (ئەوسا هێشتا ڕژێمی بەعس مابوو)، وتم: "نەخێر، تۆ ئازادی چیم وتووە، وەکو خۆی بە ناوی منەوە لە وتارەکەتدا بڵاوی بکەرەوە".

١٢- بینینی پتروس گالی.

من و عەلی یەگید لە ئەمریکا خەڵکی زۆرمان بینی، کە عیسمەت شەریف وانلیش گەیشتە واشنتن، بەهۆی پەیوەندییەکانی خۆیەوە، خەڵکی زیاترمان بینی، بەتایبەت کە عیسمەت خۆی زمانزان بوو، ڕۆژنامەنووس و کەسایەتیی سیاسیمان بینی.

هەتا وادەی بینینی سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان هات، ئێمە خۆمان تەرخانکردبوو بۆئەوەی زۆرترین کەس ببینین.

(پرۆفیسۆرمهرداد ئیزادی) خەڵکی کرماشان بوو، مامۆستای مێژوو بوو، لە زانکۆی واشنتن وانەی دەوتەوە، هاوڕێی عیسمەت شەریف بوو، ئەویشمان لەگەڵ هاتبوو.

لە واشنتنەوە من و کاک عیسمەت و عەلی یەگیدو قزلهان، فڕین بۆ (نیویۆرک)، بۆئەوەی لە ڕۆژی (٢١)ی نەورۆزدا (پتروس گالی) سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان ببینین و پەیامی کوردی پێ بگەیەنین.

لە کات و وادەی دیاریکراودا، کە سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی بوو، ئێمە لە بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان ئامادەبووین.

بێگومان هەواڵی سەردانی شاندەکەی ئێمەو ناو و وێنەمان و ڕۆژو کاتی بینینی پتروس گالی لە ڕۆژنامەو میدیای ئەمریکاییدا بڵاوببووەوە، بەهۆی ئەوەشەوە کێشەی کورد لە میدیای ئەمریکاییدا ورووژابوو، بۆیە کە بردیانینە نووسینگەی ڕاگەیاندنی نەتەوەیەککگرتووەکان، نزیکەی پەنجا ڕۆژنامەنووس و پەیامنێری تەلەفزیۆنەکان هاتبوون.

ئێمە لە چاوەڕوانی بینینی سەرۆکی نەتەوەیەککگرتووەکاندا بووین، کابرایەکی میسری هاتەلامان کە لە نووسینگەکەی ئەو کاری دەکرد، وتی: "بترۆس گالی تەندروستی تێکچووەو ناتوانێت بتانبینێت".

عیسمەت شەریف وتی: "ڕاستیمان پێ بڵێ، ئەم نەخۆشییە بیانووە، بۆئەوەی نەمانبینێت؟".

وتی: "نەخێر، ئەو زۆر حەزی کردووە بتانبینێت، بەڵام نەخۆشکەوتووەو باری تەندروستی تێکچووە". پێداگریمان کردو وتمان: "ئێمە لەسەر بەڵێنی خۆی هاتووین، بۆیە ناکرێت ڕێگامان نەدەن ببینین".

کابرای میسری ڕۆیشت و پاشماوەیەک گەڕایەوە لامان و بردینی بەرەو ڕاڕەوەکە، لەوێ پتروس گالی هات و پێنج دەقەیەک بەسەرپێوە قسەی لەگەڵ کردین.

ئێمە بە ناوی کوردەوە پەیامەکەی خۆمان بۆ باسکردو نامەکەشمان دایە دەستی و نامەیەکی ئۆچالانیشم دایە دەستی.

کورتەی قسەکانی ئەو ئەوە بوو، کە کورد گەلێکن هەقی خۆیانە داوای مافی خۆیان بکەن، بەڵام تەنها ڕێگایەک بۆ ئەوە، ڕێگای ئاشتییانەو گفتوگۆیە لەگەڵ حکومەتی عێراق و ئێران و سوریاو تورکیادا، جگە لەوەش لەم قۆناغەدا هیچی تر ناکرێت.

پاش ئەم قسانە یاریدەدەرێکی خۆی بەرەوڕووکردینەوە کە لەگەڵی دابنیشین و بەدرێژیی قسە بکەین.

نزیکەی سەعات و نیوێک زیاتر لەگەڵ یاریدەدەرەکە دانیشتین، سەرەتا وتی: "لەڕاستیدا مەسەلەی نەخۆشییەکەی سکرتێری نەتەوەیەکگرتووەکان بیانوویەک بوو بۆئەوەی لەگەڵتان کۆ نەبێتەوە، چونکە نوێنەری حکومەتی تورکیا لە نەتەوەیەکگرتووەکان هەڕەشەی ئەوەی کردووە کە لە نەتەوەیەکگرتووەکان دەکشێتەوە، نوێنەری ئێراق و ئێران و سوریاش هەمان داوایان کردووە، نابێت پتروس گالی لەگەڵ ئێوەدا کۆببێتەوەو فشارێکی زۆری لەسەر بووە". بەدرێژیی باسی بارودۆخی کوردستانمان بۆ کرد، کە چۆن کورد لەو وڵاتانەدا مەترسی لەسەر کلتوورو فەرهەنگ و

زمانی هەیە، تەنانەت مافی ئەوەشی پێ ڕەوا نابینن بە زمانی دایک قسە بکات و بخوێنێت.

باسی بارودۆخی باکوورمان کرد، وتمان: "پەکەکە ئامادەیە بە شێوەیەکی ئاشتییانەو بە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی تورکیادا دابنیشێت".

باسی باشوورمان کرد کە دەبێت نەتەوەیەکگرتووەکان هاوکاریی مرۆیی زیاتری خەڵک بکات، چونکە حکومەتی ئێراقی ئابلۆقەی خستۆتە سەر خەڵک، هەروەها داواشمان کرد کە ناوچەی دژەفڕین و "هێزی (چەکوشی ئامادە)ش بمێنێت، ئەگینا بە پێچەوانەوە ڕژێمی سەدام حسێن گەلی باشوور ڕەشەکوژ دەکات و چەکی کیمیایی بەکاردەهێنێت، وەکو لە هەڵەبجە بەکاری هێنا.

کە من باسی پەکەکەو ئامادەیی پەکەکەم کرد بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی تورکیادا، کابرا وتی: " تۆ خەڵکی ئێراقی، چ کارت بەسەر کوردی تورکیاوە هەیە؟" عیسمەت شەریف کە هەر خۆی بەئینگلیزی قسەکانی وەردەگێڕا، وتی: "ئەمە کوڕی ناسیونالستی کوردییە".

پاش کۆتاییهاتنی گفتوگۆکە، وتی: " ئێوە دەتوانن کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی خۆتان ئەنجام بدەن و ئازادیشن چی دەڵێن لە میدیادا بیڵێن".

هەرپێنجمان من و عیسمەت و عەلی و قزلهان و پرۆفیسۆر ئیزادی، چووینە سەر مێزێک کە بۆ کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکە ئامادە کرابوو، ئیتر ئەو هەموو کامێرای تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەوان و پەیامنێرە لێمان کۆبوونەوە. سەرەتا عیسمەت وەک سەرۆکی شاندەکە مەبەستی ئەم سەردانەی ئینستیتیوتی کوردی بۆ نەتەوەیەکگرتووەکان و بینینی پتروس گالی بۆ ڕۆژنامەنووسەکان باسکرد، دواتر ئەوان کەوتنە پرسیارکردن.

کە زانیشیان من کوردی ئێراقم، هەندێک پرسیاریشیان لە من کردو منیش وەڵاممدانەوە. لەو کاتەدا دوو ئەمریکایی لە نزیک بەغدا گیرابوون، پرسیاری ئەوەشیان کرد، وتم: "من ئاگام لەوە نییە، منیش هەر لە میدیاوە بیستوومە".

کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەمان زۆر سەرکەوتوو بوو، نزیکەی سەعاتێکی خایاند، ئەوەی پێویست بوو ویستمان، سەبارەت بە کورد گەیاندمان بە ڕای گشتی.

ئەم سەردانەمان بۆ ئەمریکا کاردانەوەیەکی گرنگی هەبوو لە ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکاندا، بەشێوەیەکی بەرفراوان ڕووماڵیان کردو باس و خواسی کورد لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی بەرچاو هاتەوە ناو میدیای ئەمریکی.

بێگومان لۆبی تورکی چەندین ساڵ بوو هەوڵی دابوو کە پەکەکە وەکو تیرۆریست بە ڕای گشتی ئەمریکی و دنیا بناسێنێت، بەڵام گەیاندنی ئەو نامەیەی ئۆچالان بە سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان، کە داوای چارەسەری ئاشتییانەو گفتوگۆ دەکات، زۆر جێگای بایەخ بوو.

کارەکەمان لە نیویۆرک تەواو بوو، گەڕاینەوە واشنتن، لەوێ من بە چاکم زانی تەلەفۆن بۆ عیسمەت کەتانی بکەم و سوپاسی بکەم، کە بەهۆی ئەوەوە ئێمە توانیمان بگەینە لای سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان.

کە تەلەفۆنم بۆ کرد، عیسمەت وتی: "کاکە هیچ سوپاسم مەکە، خەریکبوو لەسەر ئێوە لە ئیشەکەم دەرم بکەن".

گەڕاینەوە بۆ برۆکسل من و عیسمەت شەریف براینە شوێنێکی تایبەت، بۆئەوەی قسە لەگەڵ عەبدوڵڵا ئۆچالان بکەین، سەرەتا قسەی لەگەڵ عیسمەت کردو دواتر من قسەم لەگەڵ کرد، پاش چاکوچۆنی، یەکەم شت وتی: "پێنجوێنی نامەکەی منت گەیاندە دەستی پتروس گالی؟" منیش وتم: "بەڵێ، بەدەستی خۆم نامەکەم دایە". بەدرێژیی باسی سەفەرەکەی ئەمریکام بۆ کرد، ئەو زۆر ستایشی کردین و زۆری پێخۆشبوو کە توانیومان ئەو چالاکییانە ئەنجام بدەین، دەستخۆشی لێکردم و وتی: "پێنجوێنی تۆ ناو دەنێم پردی نێوان باشوورو باکوور".

١٣- چالاکی تری ئینستیتیوتی کوردی.

یەکێک لە چالاکییەکانی تری ئینستیتیوتەکە بایەخدان بوو بە زمانی کوردی، بۆ ئەم مەبەستە چوار کۆنفرانسمان گرت، کە تێدا زۆربەی زاناو پسپۆڕی زمانی کوردی لەسەر ئاستی هەر چوارپارچەکە بەشدارییان کرد. ئەو کۆنفرانسانە ئامانجی ئەوە بوو، زمانێکی ستاندارد بۆ کورد دروست بکات، ئەو گفتوگۆ دوورودرێژانەی لەو کۆنفرانسانەدا ئەنجامدران، گەیاندینییە ئەم دەرەنجامەی خوارەوە.

(لەبەرئەوەی کورد بە یەک پیت و بە یەک ڕێنووس نانووسێت، هەندێک بە پیتی عەرەبی و هەندێکیشی بە پیتی لاتینی و کوردی ڕوسیاو وڵاتی تری شورەوی بە پیتی کریلی ڕوسی دەنووسن و زاراوەکانیش زۆر دوورن لە یەکەوە، لەبەرئەوەی دەوڵەتی سەربەخۆشمان نییە، لە ئێستادا ئامانجی یەکخستی زمانێکی یەکگرتوو، نایەتەدی)، بۆیە بڕیارمان دا، کە:

یەکەم: هەرچی وشەی بێگانەیە بەکاری نەهێنن و ئەگەر لە زاراوەیەکدا، وشەیەک دەست نەکەوت، لە زاراوەیەکی ترەوە وەریبگرین.

دووەم: هەوڵبدەین لە نووسین و گفتوگۆدا، زاراوەکان تێکەڵاو بکەین، بەتایبەتی نووسەرو شاعیران لە میدیا

کوردییەکاندا ئەو زمانە کوردییە بەکاربێنن.

سێیەم: بەتایبەت تێکەڵکردنی زاراوە سەرەکییەکانی سۆرانی و کرمانجی کە ناوم نابوو سۆرمانجی، پێڕەو بکەین.

کۆنفرانسێکی ترمان لەسەر مێژوو بوو، لە لۆزان کرا، ئەم کۆنفرانسە دوو ڕۆژی خایاند. ڕۆژی دووەمی کۆنفرانسەکە لەو کۆشکە بەسترا، کە لە گەلاوێژی (١٩٢٣) بڕیاری چوارپارچەکردنی کوردستانی تێدا درا.

جگە لە مێژوونووسە کوردەکان، مێژوونووسی بیانیش بەشداربوون، لەوانە سێ مێژوونووسی گەورەی ڕووس وەکو (لازاریف و حەسرەتیان و ژیکا لینا)، کە شارەزای مێژووی کوردن.

مێژوونووسە کوردەکان کە ئامادە بوون (دکتۆر عیسمەت، دکتۆر جەبار قادرو دکتۆر جەمال ڕەشید) و (دکتۆر کەمال مەزهەر)یشمان داوەت کرد، بەهۆی دەستنەکەوتنی ڤیزەوە نەیتوانی ئامادەبێت.

مێژوونووسێکی ئەمریکیش ئامادەبوو ناوەکەیم لە یاد نییە. مێژوونووسەکانی باکووریش (پرۆفیسۆر جەمشید بەندەر)و هێندێکی تر کە ناویانم بیرم نایەت.

کۆنفرانسێکی تری گرنگ ئەوەبوو کە بە بۆنەی تێپەڕبوونی چوارسەد ساڵ بەسەر نووسینەوەی (شەرەفنامە)دا ڕێکخراو دوو ڕۆژی خایاند.

لەم کۆنفرانسەدا زۆربەی لێکۆڵینەوەو سیمینارەکان لەسەر شەرەفنامەو زمان و شێوازی نووسین و واقعییەتی نووسەرەکە بوو، کە هەبوون ڕەخنەیان دەگرت و هەشبوون زۆر بەرز هەوڵەکەیان دەنرخاندو باسی کەسایەتیی شەرەفخانی بەدلیسییان دەکرد.

هێندێک لە مێژوونووسە بیانییەکان، لێکۆڵینەوەیان پێشکەش کردو لە هۆکاری ڕووخانی ئەمارەتاکان و شکستی شۆڕش و بەرخۆدانەکانی کوردیان دەکۆڵییەوە.

١٤- کۆنفرانسی ئەدەبی لە بەرلین.

ئەم کۆنفرانسەمان ناونا کۆنفرانسی (ئەحمەدی خانی)، ئەمیش سێ ڕۆژی خایاند، لە شوێنێک بوو بە ناوی (کۆشکی کلتوورە جیاوازەکان)، شاعیرو نووسەرو کەسایەتی هەر چوارپارچەی کوردستان، تیایدا بەشداربوون، جگە لەو شارەزاو پسپۆڕە بیانییانەی کە شارەزای ئەدەبی کوردی بوون. خۆشم لەم کۆنفرانسەدا لێکۆڵینەوەیەکم لەسەر خانی پێشکەش کرد.

لە زوربـەی پایتەختەکانی ئۆروپا، وەک: ستۆکهۆڵم، پاریس، کۆبنهاگن و ئەمستردام، کۆنفرانسی جیاجیامان دەکرد، لەسەر کلتوورو مێژووی کورد.

ئـەوەی شـایـەنـی بـاسـە هـەمـوو ئـەو لێکۆڵـەوانـە کە لەو کۆنفرانسانەدا پێشکەش دەکـران، بە پیتی لاتینی و کرمانجی دەکرایە کتێب و لە ڕێگای ڕێکخستنی پەکەکەوە دەنێردرایەوە ناو تورکیا، جگە لەم چالاکییانە، زانکۆکانی ئۆروپـا لـە وڵاتـانـی خـۆیـان، بەتایبەت مـن و عیسمەت شـەریفیان داوەت دەکرد، بۆئەوەی لەسـەر کلتوورو مێژوو و فەرهەنگی کوردی سیمینار پێشکەش بکەین.

گۆڤارێکیشمان هەبوو، بە ناوی ئینستیتیوتەوە دەردەکرا، بە ناوی (لیکۆڵین) کە ئەم بابەتانەمان تیادا بڵاودەکردەوە، هەر سیمینارێکیش بە هەر زمانێکی بیانی پێشکەش بکرایە، بەو زمانە لە گۆڤارەکەدا بڵاو دەکرایەوەو کورتەیەکمان لێ دەکرد بە کوردی.

١٥- جارێکی تر شەڕی براکان.

لە ناوچەی بادینان پەکەکە لە هێرشێکدا کە ناویان نابوو (بروسک)، پەلاماری پارتی دابوو، نزیکەی بیست لوتکەو قوتەیان لە پێشمەرگەی پارتی داگیرکردبوو، بیانووی

پەکەکە بۆ هێرشەکە ئـەوە بـوو، کـە گـوایـە پـارتـی ئەو بەرزاییانەی لەوان گرتووەو لەوێوە چاودێرییان دەکات و زانیاری دەداتە هەواڵگریی تورکیا، بۆ خۆپاراستن ئەو هێرشانەیان کردووە، شەڕەکە تا دەهات سەختتر دەبوو.

ئـەو مـاوەیـە بـۆ چـالاکـی ڕۆشنبیریی لـە بـۆن بـووم، کوردی هەموو پارچەکانم دەبینی، بە تەلەفۆنیش قسەم لەگەڵ دۆست و بـرادەران دەکـرد، لە وڵاتەکانی تر. لەو سەروبەندەشدا زوو زوو لەگەڵ (عەلی قازی) یەکتریمان دەبینی، عەلی و برادەرانی تریش کە هەموو شەڕەکەیان بە ماڵوێرانیی بۆ کورد دەزانی، هانیاندام ڕۆڵێک ببینم.

(دڵشاد بارزانی) برای کاک مەسعود ئەوسا لە شاری بۆن بوو، جارجارە یەکتریمان دەبینی، بەڵام ئەم جارە بە مەبەستی ئەوەی کە هیمەتێک بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە بکەین، سەردانیم کردو ئەویش زۆری پێ باش بوو، وتی: "ئێمە لەگەڵ شەڕدا نین و پەکەکە هێرشی کردۆتە سەرمان، وا بکە دەستەیە ک ڕۆشنبیری کورد کۆ بکەیتەوە، بۆئەوەی بتوانن کاریگەری دروست بکەن".

قسەم لەگەڵ برادەرانی پەکەکە کرد لە ئۆروپا، وتیان: "تۆ چیت پێدەکرێت، بیکە بۆ ڕاوەستانی شەڕەکەو ئێمەش دژی شەڕین".

تا دەهات شەڕەکە پەرەیدەسەند، میدیای پارتی کەوتبووە وێزەی پەکەکەو میدیای پەکەکەش خراپتری دەکرد، لەودەمەدا تەلەفزیۆنی (مەد تیڤي)ش لە بەلجیکاوە پەخشی دەکردو کاریگەری هەبوو.

ئێمە هەموو غەمبارو نیگەران بووین، من پەیوەندییەکانم بەکارهێنا، بۆئەوەی ئەم شەڕە ماڵوێرانکەرە کۆتایی پێبێنین.

لەو سەروبەندەدا من و عەلی یەگید، هاوکاری (مەلیک فورات)مان دەکرد لە (کۆڵن ) کە سەرقاڵی ئەوەبوو، وەقفێک بە ناوی (شێخ سەعیدی پیران)ی با پیرییەوە دامەزرێنێت، چەند پیاوچاک و مەلایەکیش لە وەقفەکە کۆببوونەوە، یەکێک لەوانە (عەبدولڕەحمان دوڕە) بوو، کە مەلایەکی نیشتمانپەروەرو موفتی پێشووی (دیاربەکر) بوو.

قسەم لەگەڵ هەموو ئەمانەدا کرد، پەیوەندیشم کرد بە عیسمەت شەریف وانلییەوە، هەموو هاوڕا بووین لەسەر ئەوەی بکەوینە بەینەوەو کۆتایی بەم شەڕە نەگریسە بهێنین.

لەو دەمەدا من چەند جارێک (دڵشاد بارزانی)م بینی، وتم: "خەریکی ئەوەین بچین بۆ لای عەبدوڵڵا ئۆچالان و دواییش بچین بۆ باشوور بۆ لای کاک مەسعود". دڵشاد کارەکەی زۆر پێ باش بوو، زۆریش هانیدام کە کۆڵ نەدەین.

من و عەلی قازی و مەلیک فورات هاتینە شام، عەبدوڵڵا ئۆچالانمان بینی، ئەو هەڵوێستی زۆرباش بوو، وتی: "من بۆئەوەی شەڕی کورد دژی کورد کۆتایی بێت، بە هەمووشت قایل دەبم، بچن بۆ باشوورو کاک مەسعود ببینن".

ئەگەرچی من لەگەڵ دڵشاد بارزانیدا زۆر ڕێک بووم، بەڵام پیان وتم: "پارتی بەرامبەر من غەزەبیان لێ دەبارێت". مەلیک فوراتیش لەبەر تورکیا نەیدەتوانی بچێتە باشوور، بۆیە ڕێکەوتین کە عەلی قازی بچێت و دڵشادیشمان ئاگادار کردەوە کە عەلی بە نوێنەرایەتی ئێمە دەچێتە لای کاک مەسعودو دیدارەکەی بۆ ڕێک بخات.

من دوو ڕۆژ لە شام مامەوە، لەگەڵ مەلیک فورات گەڕاینەوە بۆ بۆن، عەلی قازی چووبوو بۆ لای کاک مەسعود، ئاو کرا بە ئاگرەکەداو شەڕەکەی پارتی و پەکەکە کۆتایی هات.

١٦- شەڕی تری براکان.

بێگومان لە شەڕی پارتی و پەکەکەدا، هەردوو لا زیانێکی زۆریان لە یەکتری داو کوڕی خەڵک کوژراو شەڕەکەش سودی بۆ هیچیان نەبوو، باش بوو هەوڵەکەمان

بۆ ڕاوەستانی شەڕ، بەری هەبوو، شەڕەکە ڕاگیرا، بەڵام خۆ ئەم بەدبەختی شـەڕە لە کۆڵ کورد نابێتەوە، ئەوە جارێ پارتی و یەکێتی لەگەڵ یەکدا شەڕ دەکەن، کەچی هەریەکەیان بەجیاش شەڕیان لەگەڵ پەکەکەدا دەکرد!

دوای کۆتاییهاتنی شەڕی پارتی و پەکەکە، پاش ماوەیەک ئینجا، پەکەکەو یەکێتی بەربوونە ویزەی یەک و شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا هەڵگیرسا.

ڕۆژ بەڕۆژ شەڕ قورستر دەبوو، لە هەردوولا ژمارەی کوشتار زیادی دەکرد، هەموومان نیگەران بووین، کوردی هەموو پارچەکان ئەودەمە سەردانی ئینستیتیوتیان دەکرد، هەموو بە داخ و کەسەرەوە لەو شەڕە نەگریسەی دوو هێزی کـوردیـان دەڕوانــی، بەتایبەت کە ڕۆژبــەڕۆژ لە هەردوو لاوە، هەواڵی کوشتاروماڵوێرانیی دەبیسترا.

عوسمانی برام لە سلێمانییەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی: "کاکە گیان، یان بەجارێ واز لە پەکەکە بێنە، یان بچۆ سەر مەد تیڤی و بانگەوازێک بکە، چیت بۆ دەکرێت بۆ کۆتاییهێنانی ئەم شەڕە بیکە، کاکە ڕۆژی چەندین تەرمی ئەو شەڕە دێتەوە بۆ سلێمانی و زۆربەی مزگەوتی سلێمانی پرسەی تیایە".

ئیتر هەرچی کوردی چوارپارچەکەیە دەهاتن و دەیانوت: "با هیممەتێک بکەین و ئەم شەڕە ڕابگیرێت".

تەلەفۆنم بۆ (موراد قەرەیڵان) کرد، ئەودەمە سەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتی بوو، داوای ڕاگرتنی شەڕەکەم لێکرد.

دوای ئەوە (جەمیل بایک) تەلەفۆنی بۆ کردم، هەموو هەڵوێستیان کوردانە بوو، وتیان: "برا تۆ خۆت دۆست و هاوڕێی سەرۆک ئاپۆیت، بە ناوی ئێمەوە چیت پێدەکرێت، بیکە".

ئەودەمە (سەلاح ڕەشید) نوێنەری یەکێتی بوو لە ئەڵمانیا، نزیکترین کەس بوو دەمم پیا بگات، تەلەفۆنم بۆ کردو باسی باردۆخەکەو هەڵوێستی سەرکردەکانی پەکەکەم بۆ کرد، کە دەیانەوێت شەڕەکە ڕابگیرێت.

سەلاح ئەمەی پێ خۆشبوو، وتی: (دکتۆر کەمال فوئاد) ئێستا لە بەرلینە، قسەیەکیش لەگەڵ ئەو بکە.

تەلەفۆنم بۆ کرد، وتی: "کاکە ئەوە تۆ لە کوێیت، منیش بە شوێنتا دەگەڕام و دەمویست بتبینم".

لەگەڵ دکتۆر کەمال فوئاد، کە دۆستی دێرینم بوو، هەردووکیشمان لە پێڕەوانی (بەشیر موشیر) بووین، پێکەوە دانیشتین.

وتم: "برا ئەرێ یەکێتی بۆ وا دەکات؟ خۆی حاڵی زۆرجوان بوو، وا شەڕی پەکەکەش دەکات؟ لەلایەک شەڕ لەگەڵ پارتی دەکەن و تەنگی پێ هەڵچنیون، لەملاشەوە شەڕی ئیسلامییەکان دەکەن، خەریکە تا (سەیدسادق) دێن، لەولاوە شەڕی ڕژێمی ئێراقی دەکەن لە (قەرەهەنجیر)، ئێستا شەڕی پەکەکەشتان دەسپێکردووەو خەریکە (سەنگەسەر) تان لێ بگرێت".

دکتۆر کەمال فوئاد ئەم ڕاوبۆچوونەی منی پەسەند کرد، لەسەر بارودۆخی یەکێتی و وتی: "ئەم شتانەی ئێستە باست کرد، لە نامەیەکدا بیهۆنەرەوە، منیش نامەکە بە ناوی تۆوە دەنێرم بۆ مام جەلال، سبەینێ کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسییە با لەوێدا باسی بکات، بەڵکو هەوڵبدرێت ئەم شەڕە ڕابگیرێت".

هەر ئەوشەوە لە ماڵی (موحسین عوسمان) لە بەرلین، کە دواتر بووە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان لەسەر لیستی یەکێتی، نامەکەم نووسی و ئەویش تایپی کردو ناردم بۆ دکتۆر کەمال فوئادو ئەویش بە فاکس ناردبووی بۆ مام جەلال.

شەوی دواتر سەلاح ڕەشید تەلەفۆنی بۆکردم، وتی: "جەنابی مام جەلال، دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات". قسەم

لەگەڵ مام جەلال کرد، وتی: "پێنجوێنی تۆ چیت پێدەکرێت بیکە، من ڕازیم شەڕەکە ڕابگیرێت". لەو دەمەدا پەکەکە لە شەڕەکەدا لە پێشڕەویدا بوو، لە (کورتک) بارەگای هێزەکەی "جەبار فەرمان"یان گرتبوو و هەڵیانکەندبوون.

دوای تەلەفۆنەکەی مام جەلال پەیوەندیم کرد بە موراد قەرەیلانەوەو وتی: "باشە مادام مام جەلال هەڵوێستی وایە، تۆ قسە لەگەڵ برۆکسل بکە، یان خۆت بچۆ بۆ ئەوێ، بەناوی کۆنگرەی نەتەوەییەوە بەیانێک دەربکەن، بڵێن ئەو شەڕە لە بەرژەوەندیی کورد نییەو داوا لە پەکەکەو یەکێتی بکەن بە هەر شێوەیەک بووە ڕایبگرن".

ئەو دەمە ئێمە کۆنگرەی نەتەوەییمان دامەزراندبوو، بارەگاکەشی لە برۆکسل بوو، منیش خۆم ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردن بووم، بۆئەوەی کارەکە دوانەکەوێت، هەر بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ (زوبیر ئایدار) کرد، ئەویش ئەندام بوو، بە تەلەفۆن ناوەڕۆکی بەیاننامەکەمان هۆنییەوە، بەناوی کۆنگرەی نەتەوەییەوە بڵاومان کردەوە، لە مەد تیڤی و ڕادیۆو میدیاکانی پەکەکەو میدیای کوردیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاوکرایەوە، دوای ئەوەش پەکەکە.

بۆ وەڵامی داواکارییەکەی کۆنگرەی نەتەوەیی، بەیانێکی دەرکردو وتی: "لە ڕۆژی پانزەی مانگ، شەڕ ڕادەگرێت".

بیستوچوار سەعات بەسەربە یاننامەکەی پەکەکەدا تێپەڕی، یەکێتی هیچ وەڵامی نەبوو، برادەرانی پەکەکە پێیان وتم: "بۆچی ئەوان ڕایناگەیەنن کە شەڕ ڕادەگرن؟!".

تەلەفۆنم لەگەڵ مام جەلال کرد، وتم: "برادەرانی پەکەکە دەڵێن ئێمە ڕامانگەیاندووە کە شەڕ بوەستێت، کەچی یەکێتی هیچ ڕاگەیاندنێکی بڵاو نەکردۆتەوە بۆ ڕاوەستانی شەڕ". مام جەلال وتی: "کوڕی مامی، لەبەر پەیوەندی هەرێمایەتیی و نێودەوڵەتی ناتوانین ڕایبگەیەنین، بەڵام لە سەعات ئەوەندەوە، شەڕ ڕادەگرین و ئێستا بە فاکس بروسکەکانی خۆمت بۆ دەنێرم، کە بۆ فەرماندە مەیدانییەکانم ناردووە، تا شەڕ ڕابگرن".

مام جەلال بە فاکس وێنەی بروسکەکانی بۆ ناردم، منیش بە تەلەفۆن بۆ موراد قەرەیلانم خوێندەوەو بروسکەکانیشم نارد بۆ برۆکسل.

بەم جۆرە شەڕەکە وەستا، منیش ئەوەم بۆ مایەوە ئاهێک هەڵکێشم و خۆشنوود بم بەوەی بێهودە خوێنی کورد نەڕژێت.

## ١٧- پەرلەمانی دەرەوەی وڵات

پاش (١٤) ساڵ سوپای سوری لە (٢٠٠٥)دا لە لوبنان کشایەوە، ئەمەش شوێنی بە پێگەو بنکەو بارەگاکانی گرووپە

فەڵەستینییەکان لەق کرد، ئیتر دەوڵەتی لوبنانی بەوە ڕازی نەدەبوو، نە ئەو گرووپ و ڕێکخراوانە، نە پەکەکە لەسەر خاکەکەی کارو چالاکی سەربازیی و سیاسی بکەن.

(ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستین) لە لوبنان چووە دەرەوەو لە وڵاتی تونس گیرسانەوە، لەوێش ڕێگەی کاری سەربازییان پێ نەدرا، بۆیە دەبوو کاری سیاسی بکەن، ئیتر ئەوەبوو (ئەنجومەنی نیشتمانی فەڵەستین)یان دروستکرد.

دەبوو پەکەکەو عەبدوڵڵا ئۆچالان، بیقاع جێبهێڵن، بۆیە بنکەو بارەگایان پێچایەوەو هاتنە گوندێک لە نزیکی دیمەشق، لەوێ کەمپێکیان دامەزراند، بەڵام نەیاندەتوانی چەکداربن، بۆیە لەو نێوەندەدا بە تەنها کاری سیاسییان دەکرد، لەوێ پەروەردەی فیکری و ڕۆشنبیریی ئەندامانیان دەکردو لە دواییدا هەندێک دەبوونە گەریلاو ئەوانی تریش کاری سیاسی و ڕۆشنبیریی و میدیاییان دەکرد.

ئەو کاتەی هێشتا لە بیقاع بوون، لەگەڵ ئاپۆدا لەسەر شێوازەکانی پەرەپێدانی خەبات لە دەرەوەی وڵات، باسی دروستکردنی پەرلەمان و حکومەتی تاراوگەمان کردبوو، بەڵام دوای ئەم بارودۆخە نوێیە، گفتوگۆی زیاترمان لەو بارەیەوە دەکرد.

لەڕاستیشدا ئەم ئەزموونە لە خەباتی گەلاندا، لەوەوبەر، لە ئۆروپا پەنای براوەتە بەر. فەڕەنسییەکان و ئەوەی "دیگۆڵ" لە تاراوگە دروستی کرد، لە نموونە بەناوبانگەکانە.

ئێمە لە ئۆروپا کەوتینە گفتوگۆو لەگەڵ زۆر کەس و لایەندا قسەمان کرد، لەگەڵ برادەرانی پەکەکەش، زۆر گفتوگۆمان کرد، کانی یەڵماز یەکێک بوو لەوانەی کە زۆر لایەنگری ئەو بیرۆکەیە بوو.

لە برۆکسل زنجیرەیەک کۆبوونەوەی ڕاوێژکاریمان کردو ڕێکەوتین، لیژنەیەکی ئامادەکارمان پێکهێنا، بۆ دامەزراندنی پەرلەمانی کوردستان لە تاراوگە.

ئەم لیژنە ئامادەکارییە دوانزە کەس بووین، من و عیسمەت شەریف وانلی و بەشێک لە پەرلەمانتارە کوردەکانی تورکیا کە هێندێکیان وەک لەیلا زانا لە تورکیا گیرابوون و هەشتیشیان ڕاپانکردبووە دەرەوە، لەوانە عەلی یەگیدو یەشار کایاو نیزامەدین حاجی، مەحمود قلنجی، زوبیر ئایدارو ڕەمزی کارتاڵ، دواییش دکتۆر جەبار قادر لەسەر پێشنیاری من و دلبخوین دارا، بووە ئەندامی لیژنەکەو بەدرێژیی سێ مانگێک خەریکی گفتوگۆی چڕوپڕ بووین.

من ڕاسپێردرام سەردانی چەند شوێنێک بکەم و پەیوەندی بکەم بە کەسایەتییە سیاسییەکانی باشوورەوە، لەناو ئەو شوێنانەدا سەردانم کرد ئەوەبوو چوومە لەندەن، سەردانی نەوشیروان مستەفام کرد. ئەودەمە لە یەکێتی تۆرابوو، وتی: "ئەمە کارێکی زۆرباشە دەیکەن، هەرچیتان پێویست بوو بۆ پرس و ڕاو ڕاوێژکرن، من هاوکار دەبم، بەڵام خۆم ناتوانم بەشداربم، چونکە بەتایبەت بۆ خۆسەرقاڵکردن بە کاری نووسینەوە، هاتووم بۆ لەندەن". بیرمە ناوی (دکتۆر نوری تاڵەبانی)یشی بۆ پێشنیازکردم.

لە لەندەن سەردانی برایم ئەحمەدم کرد، لایەنگری هەوڵەکە بوو، وتی: "بۆ کۆبوونەوەی ڕاوێژکاریی دێمە برۆکسل".

«دکتۆر مەحمود عوسمان"یش هاتبووە لەندەن، لەگەڵ ئەویش دانیشتم کارەکەی زۆر پێ پەسەند بوو، وتم: "گرنگە تۆ وەک سیاسییەکی کوردی باشوور بەشدار بیت". وتی: "من پشتگیریتان دەکەم و وەکو میوان دێمە کۆبوونەوەکە، چونکە سەرقاڵی کاری سیاسیم لە باشوور، ناتوانم لێرەش کار بکەم".

لێرەدا دەمەوێت شتێک بڵێم: "هەموو ئەوکەسانەی کە قسەم لەگەڵ کردبوون، بۆئەوەی ئامادەی کۆبوونەوەی

ڕاوێژکاریی پەرلەمانی دەرەوەی وڵات بن، پێم دەوتن، ئێوە سەفەرو مانەوەو خەرجی و بلیتی فرۆکەتان لەسەر ئێمە دەبێت، لەڕووی داراییەوە، هیچ ئەرکێکتان ناکەوێتە سەر".

با شایەتییەک بۆ مێژوو بدەم، هەموو خەرجی ئینستیتیوتی کوردی بەرلین و سەفەری وڵاتان و هاتن و چوون و کۆنفرانس و چاپەمەنی و هەرچی چالاکی ترە، کە لە ئۆروپا دەمانکرد، لە ماڵی پەکەکە خەرج دەکراو، عەبدوڵڵا ئۆچالان برادەرانی پەکەکەی سەرپشک کردبوو، وتبووی "نەکەن لەو هەوڵانەدا ڕەزیلی بکەن". بەڕاستی گیرفانی پەکەکە بۆ ئەم خەمە کوردییانە ئاوەڵا بوو.

ڕێکەوتین لە ئەمستردام کۆبوونەوەی ڕاوێژکاریی پەرلەمانی کوردستانی تاراوگە ڕێکبخەین، شارەوانیی ئەمستردام ڕێگای پێداین لەوێ کۆبوونەوەکە بکەین.

نزیکەی حەفتا کەسێک لە هەر چوارپارچەکەوە هاتبوون، نوێنەری زۆربەی حزب و ڕێکخراوەکانیش ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون، لە مانگی چواری (١٩٩٤)دا یەکەمین کۆبوونەوە بەسترا.

ئەوانەی ناویانم بیر نییە، دەبێت بمبەخشن، لەوانەی بیرمە بەشداری کۆبوونەوەکە بوون، جگە لە خۆم و عیسمەت شەریف وانلی، ئەمانەم بیرە، عەلی عەگید، نوری تاڵەبانی،

دکتۆر نەجمەدین کەریم، ئیبراهیم ئەحمەد، حەمەی حاجی مەحمود، قادر عەزیز، بەهادین نوری، ئەسعەد خێلانی، کەمال بورقای، دکتۆر جەمال ڕەشید ، ئیبراهیم سۆفی (ئەبو تارا)، جەلیل گادانی، نەبی قادری، کەمال میراودەلی، پرۆفیسۆر نادر نادرۆف و زۆری تر...

لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری دامەزراندنی پەرلەمانی کوردستان دراو برادەرانی پەکەکە کەوتنە خۆیان، چونکە ئەوان بە هەڵبژاردن نوێنەرانیان بۆ پەرلەمان دیاری دەکرد.

لە هەر شارێک لە شارەوانی ئەو شارە، سندووق دادەنراو دادوەر سەرپەرشتی ڕێوشوێنی دەنگدان و هەڵبژاردنی دەکرد, ئەندامانی پەرلەمان سەد بۆ سەدو دە کەس دەبوون.

لە کۆبوونەوەی یەکەمی پەرلەمانەکەدا گفتوگۆی سیاسی گەرم لەسەر بارودۆخی سیاسی هەر چوارپارچەکە کراو کۆنسەیەک بۆ سەرۆکایەتیی پەرلەمانەکە هەڵبژێردرا، من یە کێکیان بووم، یەشار کایا بوو بە سەرۆکی پەرلەمان و عیسمەت شەریف وانلیش بوو بە جێگری، جەبار قادر بوو بە سکرتێر.

ئەم کۆنسەی سەرۆکایەتییە هەریەکەیان بوون بە بەرپرسیاری دۆسیەیەک، بەپێی شارەزایی و تایبەتمەندیی

خۆی، من بووم بە بەرپرسی دۆسیەی کلتوورو ڕۆشنبیریی، یەکێک بوو بەرپرسی ئابووری، یەکێکی تر کاروباری دەرەوە، یەکێک تەندروستی، ئیتر، ئاوا بەو شێوەیە.

بەگەرمی کەوتینە چالاکی، من لە بواری کلتووریدا کەوتمە ڕێکخستنی هونەرمەندان و ڕۆشنبیران، چەندین چالاکی گرنگمان کرد. پەرلەمان شەش مانگ جارێک کۆدەبووەوە، ئەوانەی لە ئۆروپاو وڵاتانی ترو کوردستانیش بوون، دەهاتن و بەشدار دەبوون.

لە ڕێی کۆمیتەی پەیوەندیی دەرەکییەوە، کەوتینە پەیوەندیکردن بە پەرلەمانی وڵاتانی جیهانەوە، ئەم هەوڵانەش جێگەی خۆی گرت.

سەردانێکی گرنگمان ئەوە بوو، کە چووین بۆ پەرلەمانی ڕوسیا، لەوێ کۆبوونەوەمان کردو بە جیاش لەگەڵ سەرۆکی فراکسیۆنەکاندا کۆبووینەوە، (جیرنۆفسکی) کە ئۆپۆزسیۆن بوو، زۆر لایەنگری پەکەکە بوو، کەچی دوایی وا ناوی دەرکرد، لە مەسەلەی گرتنی ئۆچالاندا، خیانەتی کردووە!

ئەو سەردانە کاردانەوەی باشی هەبوو، ڕۆژنامەو میدیای ڕوسیاش زۆر بایەخی پێداو بۆ ناوبانگی مەسەلەی کورد، ڕوسیا وڵاتێکی گەورە بوو.

دوای ئەوە سەردانی پەرلەمانی بەریتانیامان کرد لە لەندەن، لەوێش کۆبوونەوەی گرنگمان کرد. سەردانی پەرلەمانی نەمساو سویدو دانیمارک و نەرویج و ئیتاڵیامان کرد، دوو کۆبوونەی پەرلەمانی خۆمان لە پەرلەمانی ئیتاڵیادا کرد.

باسی دۆزی کوردمان دەکردو میدیای ئەو وڵاتانەش بە بایەخەوە باسی سەردانی پەرلەمانی کوردستانیان دەکرد، بەو هۆیەشەوە مەسەلەی کوردی لەسەر ئاستی ڕای گشتی ئەو وڵاتانە دەناسرا.

لە سەروبەندی سەردانماندا بۆ نەرویج، یەک دووژنی کورد لە ئۆروپا کوژرابوون، دەنگی دابووەوەو میدیاش هێندێک جار باسی کوردی دەکرد، پێشوەخت زانکۆیەک هەیە لە شاری (بێرگن)، لە ڕێگەی دوو مامۆستای کوردی ڕۆژهەڵات و مامۆستایەکی خەڵکی باکوورەوە کە ڕاگری یەکێک لە کۆلێژەکان بوو، من و عیسمەت شەریف وانلییان داوەت کردبوو، بۆئەوەی سیمینارێک بکەین بە ناوی (ژن لە کلتووری کوردیدا).

من لەوەوپێش خۆم ئامادەکردبوو، بۆئەوەی ئەو تانەی ژنکوشتنە بڕەوێنمەوە، بۆیە بەدرێژیی باسی مێژووی کوردو ڕۆڵی ئافرەتم کرد، کە چۆن کورد هەر لە کۆنەوە

ڕێزی لە ئافرەت گرتووەو هاوتای پیاو بووە لە کشتوکاڵ و مەڕو ماڵاتدارییدا بەشداربووە، باسی ئەوەم کرد کە ژن لە شۆڕشدا بەشداریی کردووە، باسی پایەی ئافرەتم کرد لە شیعری شاعیرانی وەکو ئەحمەدی خانی و نالی و شاعیرو ئەدیبانی تردا. دواتر باسی ئێستای ئافرەتی کوردم کرد کە چۆن لە کۆمەڵگای کوردیدا مافی هەیەو ڕێزی لێدەگیرێت، ئەو حاڵەتانەشم سەبارەت بە ژنکوشتن بە تاوانی کۆمەلایەتی لەقەلەم داو بەڵگەی زۆرم هێنایەوە، کە ئەوە بەشێک نییە لە نەریت و کلتووری کورد.

لەڕاستیدا قسەکانی من زۆر جێگای سەرنج بوو، چونکە دوو مانگێک لەوەوپێش ئاگاداریان کردبووم، منیش لێکۆڵینەوەیەکم سەبارەت بە بابەتەکە ئامادەکردبوو، لەوێ کورتەیەکی ئەو لێکۆڵینەوەیەم پێشکەش کرد، دواتر لە ئینستیتیوتی کورد لە بەرلین لە چاپدراو کرا بە ئەڵمانی و ئینگلیزیش.

ماددەیەک هەیە لە پەیڕەوی ناوخۆی پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، دەڵێت: "لەدوای هەشت ساڵ کارکردن، ئەم پەرلەمانە هەوڵ دەدات بۆ سازدانی کۆنگرەیەکی نەتەوەیی کوردستانی، کە ببێتە چەترێک بۆ چارەسەری هەر کێشەیەک کە لەنێوان هێزە سیاسییەکان

و کۆمەڵگای کوردیدا دروست ببێت".

لەڕاستیشدا چ ئینستیتیوتەکەو چ پەرلەمانیش، کاریگەرییەکی گەورەیان لە ئۆروپا دروستکردبوو، بەتایبەت کە لەلایەن پەکەکەوە توانایەکی ماددیی باشی بۆ تەرخانکرابوو.

پەرلەمانی کوردستانی دەرەوەی وڵات لەسەر ئەو بنەمایە دامانمەزراند، کە کورد ئەدرەسێکی سیاسی و دیبلۆماسی هەبێت لە ئۆروپاو وەک نەتەوەش نوێنەرایەتییەکی هەبێت، هەوڵیش بدەین کورد گوتارێکی نەتەوەیی یەکگرتووی هەبێت و پەیوەندیی دیبلۆماسی لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی دروست بکەین، ئەمە فەلسەفەی کارمان بوو، ڕای ئاپۆش وابوو.

لە ماوەی هەشت ساڵدا توانیمان مەسەلەی کورد وەکو مەسەلەی میللەتێکی گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بناسێنین، پیشانی بدەین کە چۆن کوردستان لەلایەن چوار دەوڵەتی گەورە داگیرکراوەو توانیشمان وێنەی کورد بخەینە ناو هەموو دامودەزگا سیاسی و دیبلۆماسییەکانی ئۆروپاو ئەمریکاو ڕوسیاوە.

## ١٨- حکومەتی تاراوگە.

بەهۆی کارو چالاکییە سیاسی و دیبلۆماسی و کلتوورییەکانی پەرلەمانەوە، ڕایەک دروست بوو، کە کۆنسەی بەڕێوەبەری پەرلەمانی دەرەوەی وڵات، بکەینە حکومەتێک بە ناوی حکومەتی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، ئەم ئەزموونەش گەلانی تر هەیانبووە، کاتی خۆی جەزائیرییەکانیش حکومەتی تاراوگەیان هەبووە.

بۆ پێکهێنانی حکومەتەکە، پرسمان بە ئۆچالان کرد، وتی: "پێکهێنانی کۆنگرەی نەتەوەیی پەسەندترە، چونکە ڕەنگە لە ڕووی نێونەتەوەییەوە کێشەمان بۆ دروست بێت، پاشان حکومەت دەبێت وڵاتان دانی پێدا بنێن". بەڵام ڕای وابوو پێویستە لێکۆڵینەوەو گفتوگۆی زیاتر لەو بارەیەوە بکرێت.

بۆ گفتوگۆی زیاتر سەبارەت بەم پرسە، من چووم بۆ شام، لە نزیکەوە لەگەڵ ئۆچالان سەبارەت بە دامەزراندنی حکومەتی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، بیروڕامان ئاڵوگۆڕ کرد.

ئاپۆ قایل بوو بەوەی کە دەست بکەین بە کارکردن بۆ دامەزراندنی حکومەتەکەو وتی: "عیسمەت شەریف وانلی بکەن بە سەرۆکی حکومەتەکە، یەشار کایا، یان هەرکەسێکی تر خۆتان پێتان باشبێت، بیکەن بە جێگرو

کۆنسەی بەڕێوەبردنەکە فراوان بکەن بۆ بیست کەس و خاڵی گرنگی کارکردنی بۆ دەستنیشان کردین, من هاتمەوە بۆ برۆکسل، لەگەڵ کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتی بەدرێژیی هەموو شتمان باسکرد، سەرەتا ویستمان بزانین داخۆ ئەگەر ئێمە حکومەتی تاراوگە ڕابگەیەنین، وڵاتان دانمان پێدا دەنێن و مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن؟!".

وەفدێکمان پێکهێنا، سەرەتا ویستمان قسە لەگەڵ ئە وڵاتانەدا بکەین کە بەرژەوەندیی ئەوتۆیان لەگەڵ تورکیادا نییە، چووین بۆ "بولگاریاو پۆڵۆنیا"، وتمان: "وەک کورد بەتەمای شتێکی واین، ئەگەر حکومەت ڕابگەیەنین ئێوە دانمان پێدا دەنێن؟"، ئەوان قایل بوون، وتیان: "ئێمە دان بە حکومەتەکەتاندا دەنێین و بە فەرمیش مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەین".

هێندێک وڵاتی تر کە لامان باس دەکردن دەیانوت: "ئەوە کارێکی باشە، بەڵام ئێمە ناتوانین مامەڵەتان لەگەڵ بکەین و دانتان پێدا بنێین".

لە ڕێگای باڵیۆزخانەکانیانەوە لە برۆکسل، بەگشتی ڕای وڵاتە ئۆروپاییەکانمان وەرگرت، پەیوەندیمان بە وڵاتانی عەرەبیشەوە کردو ئەوان دەیانوت: "ئەمە مافی خۆتانە، بەڵام لەم قۆناغەدا بارودۆخی نێودەوڵەتی ڕێگا نادات وەک

حکومەت مامەڵەتان لەگەڵ بکرێت". هەتا نوێنەری جەزائیر وتی: "بەڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم داوایە دەکەین، چونکە گەلی جەزائیر ئەزموونی حکومەتی مەنفای هەیە، بۆیە هاوسۆزتانین".

ئێمە سەرقاڵی سەردانی وڵاتان و گفتوگۆکردن بووین، لە گەرمەی کارکردندا بووین بۆ هەوڵی پێکهێنانی حکومەتی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، لە بەدبەختی کورد، فشار کەوتە سەر عەبدوڵڵا ئۆچالان سوریا جێبهێڵێت، ئەمەش کارەکەی پەکخست، کە خۆشی دەستگیرکرا، بارودۆخی تر هاتە ئارەوەو هەموو شت قڵپ بووەوە.

نابمە بەفرو لەناو پیاڵەی

زرکەفتینی بادەم بکەن

بتوێمەوە!

دەبمە پشکۆ

کەرووی نەهەنگ

ئەسووتێنم...

ئینجا لە نوێ ئەژێمەوە!

نابمە (هۆزار)

شاپەڕ کراوەی دەستەمۆ

بە گۆشتی خۆم چەشەم بکەن

لە قەفەسی....،

کریستاڵی جوانا بگریم

دەبمە بازو دەبمە شەهێن

دەبمە هەڵۆ...!

١- پیلان.

بەر لە گرتنی ئەو، من بۆ گفتوگۆی پێکهێنانی حکومەتی تاراوگە، سەردانی عەبدوڵڵا ئۆچالانم کرد، نەمزانی ئەوە دوایەمین جار دەبێت کە لە شام دەیبینم.

گرتنی عەبدوڵڵا ئۆچالان زۆری لەسەر نووسراوەو پیلانێکی ئیسرائیلی و تورکی و ئەمریکایی بوو، لێرەدا بۆ بەرچاو ڕوونی تەنها باسی دیدارێکی (بولند ئەجەوید) ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری تورکیا دەگێڕمەوە، سەبارەت بە پیلانی گرتنەکە.

بەر لە سێ مانگ لە مردنی، لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانیدا ئەجەوید دەڵێت: "شەو لە گەرمەی خەودا بووم، هەڵیانساندم وتیان سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی ئەمریکا دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات". دەڵێت: "لە تەلەفۆنەکەدا وتی ئەوە عەبدوڵڵا ئۆچالان دەگرین، بەڵام دوو مەرجمان هەیە بۆئەوەی تەسلیمی تورکیای بکەین، یەکەم: دادگایەکی عادیلانەی بکرێت، دووەمیش: لەسێدارە نەدرێت".

ئەجەوید دەڵێت، وتم: "من قایلم، هەر ئەو شەوە پاش سەعاتێک کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانم کرد، وتم

شتێکی وا هەیە، وتیان گرنگ ئەوەیە بگیرێت، هەموویان ڕازی بوون بە مەرجەکەی ئەمریکا".

## ٢- دوا دیدارم لەگەڵ سەرۆك.

بەپێی ڕێککەوتنی (ئەدەنە) نێوان تورکیاو سوریا لە ئەیلوولی (١٩٨٩)دا، دەبوو عەبدوڵلا ئۆچالان شام جێبهێڵێت، ئەوەبوو لەوێوە چوو بۆ ڕوسیاو پاشان بۆ ئیتاڵیاو دوایی بۆ یۆنان و دواجاریش ئەوەبوو کە چووە کینیاو ڕۆژی (١٥\١٠\١٩٩٩) لەوێ گیرا.

ئەودەمە من لە بەرلین سەرقاڵی کارو چالاکی کلتووریی ئینستیتیوتی کوردی و لە پەرلەمانیش جگە لەوەی لە کۆنسەی سەرۆکایەتیی پەرلەمان بەرپرسی کاری کلتووریی بووم، بەتەواوی لەگەڵ هەڤالانی تردا لە جموجوڵی دیبلۆماسی و سیاسیدا بووم و چاودێریی بارودۆخی دەرچوونی ئۆچالانیشمان دەکردو لە هەوڵ و غەمی ئەوەدا بووین، چۆن ڕزگاری بکەین و لە ئۆروپا مافی پەناهەندەیی بۆ زامن بکەین.

ئۆچالان لە ڕوسیاوە چووە ئیتاڵیا، دەرفەت ڕەخسا بۆئەوەی سەردانی بکەین. ئەودەمە لە ئیتاڵیا چەپەکان لە حکومەتدا بوون و (ماکسیمۆ دالیما) سەرۆکی وەزیران بوو،

(جارێکیش سەردانی کوردستانی کردو سەرانی کوردی دیوەو ئاگاداری دۆزی کورد بوو).

ئۆچالان لە ڕۆما لە نەخۆشخانەیەکی سەربازیدا دانرابوو، بۆئەوەی پارێزگاریی بکەن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەستبەسەر بوو.

گۆڕەپانێکی گەورە لە تەنیشت نەخۆشخانەکە بوو، ڕۆژانە دەیان هەزار کوردو خەڵکی بیانی لەوانەی چەپ بوون، لە ئۆروپاو وڵاتانی ترەوە دەهاتن و لەو گۆڕەپانە کۆدەبوونەوە، تەنانەت شەوانیش نەدەڕۆیشتنەوە، بۆیە شارەوانیی ڕۆما بە ناچاریی لەو گۆڕەپانەدا چادری هەڵدابوو و شوێنی مانەوەی بۆ دابینکردبوون و تەوالێتی بۆ دروستکردبوون. ئیتر ئەو گۆڕەپانە ببووە کەمپێکی مرۆیی گەورە، پەیتا پەیتا خەڵک دەهاتن و ئێوارانیش دەستیان دەکرد بە ڕێپێوان، بۆ بەردەم بارەگای سەرۆکی شارەوانی و بارەگای سەرۆکی حکومەت و داوای ئەوەیان دەکرد مافی پەنابەری سیاسی بدرێتە ئۆچالان.

بابەتی هەرە گرنگی ئەودەمەی میدیای ئیتاڵیاو ئۆروپاو جیهان ببووە باس و خواسی کوردو ئۆچالان، ڕۆژنامەکان دەیاننووسی "ڕووبارێک لە کورد، ڕۆمایان داگیرکردووە".

لە بەرلین بە ناوی ئینستیتیوتی کوردەوە شاندێکمان

پێکهێنا بۆ سەردانی عەبدوڵڵا ئۆچالان، جگە لە من، هەریەکە لە (سەبری ئاگر (کوڕی عوسمان سەبری هۆزانڤان بوو)، هۆشەنگ سەبری و نەجیب باڵایی و بەکر حەسەن)ی چیرۆکنووس ئەندامی ئەو شاندە بوون.

کە ئێمە گەیشتینە ڕۆما، ئۆچالانیان لە نەخۆشخانە سەربازییەکەوە گواستبووەوە بۆ خانوویەک کە هێزێکی گەورەی پۆلیس پاسەوانییان دەکرد.

ڕێگایان داین سەردانی بکەین، چووینە ناو خانووەکەو بە قادرمەیەکی پێچاوپێچدا سەرکەوتین بۆ نهۆمی دووەم، جگە لە خۆی، سێ پیاو و ژنێک یاوەری بوون، کە منی بینی یەکسەر پەلاماری دام و باوەشی پیاکردم، ئەندامانی شاندەکە سەیریان لێهات کە پەیوەندی من و ئۆچالان بەوجۆرەیە.

وتی: "پێنجوێنی ئاگات لێیە لە بیقاع ئێمە حکومەت بووین، ئێستا لە ژوورێکی بچووکدا یەخسیرم".

وتم: "ڕاستە لە ژوورێکی بچوکدایت، بەڵام ئێستا کە تۆ قسەیەک دەکەیت وەکو بۆمب لە هەموو ئۆروپا دەنگدەداتەوە، هەموو دنیا چاوەڕێی قسەیەکی تۆیەو لە دەرەوە سەدان ڕۆژنامەوان و کەناڵی تەلەفزیۆنی دەیانەوێت قسەیەکی تۆ بگوازنەوە". کە وام پێوت گەشایەوەو لە چاوەکانیدا هیواو

ورەی کێوە سەرکەشەکانی کوردستانم بەدی دەکرد.

وتی: "پیلانێکی گەورەمان لەسەرەو دنیایان لێ تەنیوین، ئەوانەش کە بە دۆستمان دەزانین، پشتیان تێکردین، بەڵام با بزانیت دۆزی کورد لە من گەورەترە، من دەستبەسەربم، یان لە زیندانیشدا بم، لە بەرخودان و خەبات ناکەوم و ئێوەش کاری خۆتان بکەن و دەرەنجام شۆڕش سەردەکەوێت، پەکەکەش ناکەوێت و هەزاران ئۆچالانم لەناو پەکەکەدا هەیە".

کە هاتینە دەرەوە، هەرچی ڕۆژنامەنووس و تەلەفزیۆن و میدیایە تێمان مروکان وتیان: چی بە ئێوە وتووە؟ من هەر زوو تاومدایەو نەمهێشت هیچکام لە هەڤاڵەکانم قسە بکەن و بە کوردی و بە کورتی بە میدیاکانم وت: "شۆڕش سەردەکەوێت و پەکەکە لەناو ناچێت و هەزاران ئۆچالان لەناو پەکەکەدا هەیە".

هێندێک کەس ڕایان وایە، کە عەبدوڵڵا ئۆچالان دەبوو بچێتە شاخ، وەڵامی من بۆ ئەوانە ئەوەیە، کە بڵێم نەیدەتوانی، چونکە لە شام لەژێر چاودێریی دەزگای هەواڵگریی سوریدا بوو، چەند دەزگایەکی هەواڵگریی گەورەش بڕیاری گرتنیان دابوو.

گرتنی عەبدوڵڵا ئۆچالان بۆ کورد غەمێکی نەتەوەیی گەورە بوو، بۆ پەکەکەش گورزێکی کەمەرشکێن بوو، چونکە ئەو وێنەیەی ڕێکخستن و هەوادارانی پەکەکە بۆ سەرۆکەکەیان هەیانە، ئەوەیە کە ئەو ئەفسانەیە، بۆیە سەیر نییە کە دوای بیستنی هەواڵی گرتنەکەی سەدو هەشت کەس خۆیان بسووتێنن.

لەدوای ئەو ڕووداوە، ڕێکخستنەکانی پەکەکە تەواو تووشی سەرگەردانی و نائومێدیی ببوون و مۆراڵی خەڵکیش لە ئۆروپا دابەزیبوو، زۆرکەس تەکینەوەو وازیان هێنا.

لەو دەمەدا ڕایەک هەبوو لەناو خەڵکدا پێی وابوو، پەکەکە بە گرتنی ئۆچالان کۆتایی دێت و وردە وردە هەڵدەوەرێت و دەتوێتەوە، زۆر نووسەرو شارەزاش لە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەو میدیادا ئەم ڕایەیان هەبوو، میدیای دەوڵەتی تورکیش زۆر برەوی بەم بۆچوونە دەدا، تاوەکو ڕێکخستنەکە نائومێد ببن و بڕووخێن.

لە ڕۆژگاری ئاوها سەخت و تاریکدا تۆزێک ئومێدو هیوا، واتایەکی زۆر گەورەی هەیە.

برادەرانی پەکەکە ڕۆژنامەیەکیان هەبوو بە تورکی دەردەچوو لە ئۆروپا، بە ناوی (ئوزگور پۆڵەتیک)، دەستم کرد بە نووسین بۆ ئەو ڕۆژنامەیە، بە سۆرمانجییەکەی

خۆم وتارم دەنووسی، ئەوانیش دەیانکردە تورکی و بڵاو دەبووەوە. لەناو تورکیاشدا ڕۆژنامەی (ڕادیکاڵ)، کە هاوسۆزی پەکەکە بوو، ئەو وتارانەی منیان دووبارە بڵاو دەکردەوە.

لەو وتارانەدا دەمویست ورەی خەڵک بەرزبکەمەوە، جۆرها نموونەم لەسەر مێژووی کورد دەهێنایەوەو باسی ئەوەم دەکرد، چەندین جار شۆڕشەکانی کورد لە باکوور، لە باشوورو ڕۆژهەڵات دووچاری کارەسات بووە، سەرکردەی وەکو قازی محەمەدو شێخ عەبدولسەلام بارزانی و شێخ سەعیدی پیران و سەید ڕەزای دەرسیم و شێخ مەحمودی حەفید کراون بە دارا، بەڵام هەردەم شۆڕشەکان بەگوڕو تینی گەرمترەوە هەڵگیرساونەتەوەو لەوەی پێشووتر زیاتر پەرەی سەندووەو دۆزی گەلەکەمان زیاتر بەرەو پێشەوە چووە.

لەو نووسینانەدا باسی ئەوەم دەکرد، پەکەکە تەنانەت بە نەمانی سەرۆکەکەشی کۆتایی نایەت، چونکە سەرەتایەکی گرنگی دامەزراندووەو بیروباوەڕو ڕێکخستنێکی بەهێزو تۆکمەی هەیەو لەسەر زەویش گەریلای هەیەو لە ئۆرووپاش بوونی هەیە.

ئـەم نووسینانە کـاردانـەوەی باشـی هـەبـوو، خەڵک ڕاوبۆچوونیان بەهەند وەردەگرتم و وەک تروسکاییەک سەیریان دەکـرد، هێندێک جـار ڕۆژنامەکە پاشکۆی بە ئینگلیزی و ئەڵمانیش دەردەکــردو وتـارەکـانـی منیش بـەو زمانانە بڵاو دەبـوونـەوە، میدیای ئەورووپیش وەک سەرچاوەیەکی کوردی بۆچوونەکانی ڕەچاو دەکرد.

لە یەک لەو وتارانەدا کە بۆ ئوزگور پۆلەتیک دەمنووسی، بە ناونیشانی (دیموکراسی کوردو دیکتاتۆرییەتی تورک) باسم لەوە کرد، هەرێمی کوردستان دەوڵەتیش نییە مافی بە هەموو نـەتـەوەو ئاین و پێکهاتەکان داوە، تورکمان نوێنەری لە حکومەت و پەرلەماندا هەیە، بەڵام سێ ملیۆن کورد لە ئەستەمبوڵ، حکومەتی تورکیا ڕێگایان نادات لەماڵی خۆشیاندا بە کوردی قسە بکەن، داوام کردبوو سێ ملیۆن کوردی ئەستەمبوڵ، مافی ئەوەیان هەیە ئۆتۆنۆمییان هەبێت.

گەورە ڕۆژنامەنووسی تورک (ئەمین چۆلەشان) کە بە قەڵەمی دەسـەڵات ناسراوە، بە زنجیرەیەک وتار وەڵامی نووسینەکەی منی داوەتەوە، یەکێکیان بە ناونیشانی ئەوەیە (دۆستی نزیکی ئۆچالان، داوای تێکدانی تورکیا دەکات)، هەرچی خراپەو ناشێت، بە من و کوردو پەکەکەی دەڵێت.

دواتر لە زیندان تورکەکان وتارەکەی منیان بۆ ئۆچالان بردبوو، وتبوویان: "فەرموو بزانە ئەوە دۆستەکەی تۆ چی دەڵێت" ئۆچالانیش خوێندبوویەوە، وتبووی: "شتێکی خراپی نەوتووە".

جگە لەم گۆڤارە لە لوبنان، گۆڤارێکی بە عەرەبی بڵاودەبووە، بە ناوی (سورگوڵ) بە عەرەبیش ئەو بۆچوونانەم بۆ ئەوانیش دەناردو لەوێش بڵاو دەبووەوە، جگە لەمانە بەشی عەرەبی ڕادیۆی مۆنتکارلۆو بی بی سی و تەلەفزیۆنی ئەلجەزیرەش، زوو زوو لەسەر ڕەوشەکە چاوپێکەوتن و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکردم. هێندێک جار ئەلجزیرە تورکێکی شۆڤێنییان دەهێنا. جارێک (موستەفا ئوزجان)، کە لە دامەزرێنەرانی ئاک پارتی و عەرەبیزان بوو لەگەڵیدا بە گیروگاز هاتم، قسەکانیم سەبارەت بە کۆتاییهاتنی پەکەکە بەتاڵ دەکردەوەو لە مەد تیڤیش بەپێی پێویست دەردەکەوتم، هەموو قسەکانم بەو ئاراستەیە بوو کە ورەو مۆڕاڵی خەڵک بەرزبکەمەوە.

بێگومان لە تەلەفزیۆنی ئەڵمانیاو وڵاتانی تری دنیاشدا، تورکیا لۆبی بۆ ئەوە دەکرد کە ئەو بۆچوونە بڵاوببێتەوە، کە پەکەکە تیرۆریستەو لەدوای گرتنی سەرۆکەکەی، کۆتایی پێدێت.

لە ئەڵمانیا سیاسییەکی بەناوبانگ هەبوو لە (سی دی ئۆ)، پارتەکەی (مێرکڵ) ئەو پیاوە کاریگەری هەبوو، جاران لە تەلەفزیۆن و میدیای ئەڵمانیدا زۆرخراپ لەسەر پەکەکە قسەی دەکرد، بۆ مێژوو عەلی قازی هەوڵی زۆری دا تا قەناعەتی بگۆڕێت، ئێمەش سەردانێکمان بۆ ڕێکخستن و عەلی بردی بۆ لای ئۆچالان کە لە شام بوو، دوای ئەوەی لە نزیکەوە لە پەکەکە گەیشت، کە قسەی بۆ تەلەفزیۆن و میدیا دەکرد، شتی باشی دەوت، ئەوەش کاریگەر بوو.

لە کوردی خۆشمان هەبوو لە پەکەکە تەکینەوە، بەڵام زۆربەی برادەرانی ئینستیتیوت و کوردی تریش لە هەوڵی جوامێرانەدا بوون بۆ ئەوەی قۆناغەکە تێپەڕێنین.

شتێکی تر کە دوای ئۆچالان وەکو تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوو بۆ سەرکردایەتیی پەکەکە، ئەوەبوو برادەران توانییان بەشێوەیەکی باش قۆناغەکە تێپەڕێنن و ژیرانە سەرکردایەتی بەڕێوەببەن.

گرتنی ئۆچالان واقیعێکی تاڵ بوو، بەڵام دەبوو هەموان لەگەڵی هەڵبکەن، بۆیە پاش ماوەیەک ئێمە کەوتینەوە چالاکی سیاسی و دیبلۆماسی و گفتوگۆکانیشمان بۆ دامەزراندنی کۆنگرەی نەتەوەیی چڕکردەوە، من لەگەڵ برادەرانی باشوورو ئەوانی تریش هەرکەسە لەلای خۆیەوە کەوتنە پەیوەندیکردن.

### ٣- کۆنگرەی نەتەوەیی.

یەکەمین کۆبوونەوە بۆ دامەزراندنی کۆنگرەی نەتەوەیی لە ساڵی (١٩٩٨)دا لە هۆڵی سەرۆکی شارەوانیی ئەمستردام بەسترا.

جگە لە بەشێکی زۆر لەوانەی کە ئەندامی پەرلەمانی کوردستانی تاراوگە بوون، کەسانی تر لە ئۆروپاو ئەمریکاو وڵاتانی تری دونیاوە تێیدا بەشداربوون.

نوێنەرانی حزب و ڕێکخراوە کوردستانییەکانی هەر چوارپارچەکەی کوردستان تێیدا بەشداربوون.

(پارتی دیموکراتی کوردستان) بانگێشت کرابوو، بەڵام قایل نەبوو بە شداریی کۆنگرەی نەتەوەیی بێت.

با لێرەدا دوو سەرنج تۆمار بکەم:

یەکەم: نازانم پارتی نەیدەویست بەشداریی بکات، یان بارودۆخی بەهۆی هاوسنووریی بە تورکیاوە ڕێگای پێ نەدەدا بەشدار بێت؟!

دووەم: یەکێک لە وەڵامەکانی پارتی بۆ ئێمە ئەوە بوو، کۆنگرەکە دەبێتە ڕێکخراوێکی سەر بە پەکەکە، پەکەکەش خۆی لە لیستی تیرۆردایەو ئێمەش ئێستا لە هەرێمی کوردستان لەناو هاوکێشەی هەرێمی و نێودەوڵەتیداین و بەشداریی ئێمە لەو کۆنگرەیەدا زیان بە هەرێم و بە دۆزی

کورد دەگەیەنێت.

با زۆر بە هەست و سۆزەوە بڕیار نەدەم، بەشێک لەم قسانەی پارتی ڕاستی تێدابوو، ئەو بەشەی کە ناڕاستییە ئەوە من نایزانم.

کۆنفرانسی دامەزراندنی کۆنگرەی نەتەوەیی دەستی پێکرد، لیژنەی ئامادەکار وتاری خوێندەوە، حزب و ڕێکخراوە بەشدارەکانی هەر چوارپارچە وتاری خۆیان خوێندەوە.

یەکێک لەوانەی کە بانگێشت کرابوو (وەلید جومبولات) بوو، وەلید وتارەکەی بەوە دەستپێکرد، وتی: "من کوردم و شانازیی بە کوردبوونی خۆشمەوە دەکەم، بەڵام ڕۆشنبیریی و پەروەردەی من عەرەبییە". قسەی تری سەبارەت لایەنگریی خۆی بۆ مافی گەلی کوردو خەباتە ڕەواکەی کردو لە کۆتاییشدا وتی: "هەر ئەرکێک ئەم کۆنگرەیە بیخاتە سەر شانی من، بە شەرەفی دەزانم و بە شانازیشەوە جێبەجێی دەکەم".

ئەم هەڵوێستەی وەلید جومبولات، وام لێدەکات لێرەدا کەمۆکەیەک لەسەر مێژووی بنەماڵەی جونبولات کە بە کوردی (گیان پۆلا)یە، باس بکەم.

وەلید جونبولات سەرداری دروزەکانە، کە ئێستا بەشێک لە دروزەکان لە لوبنانن و لە ئیسرائیلیش هەن و مافیشیان هەیە، ئەمانە لە بنەڕەتدا کوردی یەزیدین و ڕەگوڕیشەیان لەناو کوردانی یەزیدی و لە مێژووی دوورتریشدا لە زەردەشتی و ڕۆژگاری باڵادەستی پەهلەوییەکاندایە، دواترو لە قۆناغی تردا لە (هەکاری)ەوە چوونەتە (دەشتی حەڵەب)و لەوێ سەرداری ڕۆژانی خۆیان بوون و پاشان لە (جەبەل لوبنان) گیرساونەتەوە.

ساڵی (١٩٧٠)، کە بەیاننامەی یانزەی ئازار دەرچوو، (کەمال جونبولات)ی باوکی وەلید دێتە ئێراق و بۆ پیرۆزبایی سەردانی مەلا مستەفا دەکات.

کۆنگرەکە چەند ڕۆژێک بەردەوام بوو، بە کۆی دەنگ عەبدوڵلا ئۆچالان بە سەرۆکی ڕەمزیی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد دیاریکرا.

عیسمەت شەریف وانلی بوو بە سەرۆک، پانزە کەسیش بۆ دەستەی سەرۆکایەتی هەڵبژێردران، منیش یەکێک بووم لەوانەو ئەوانی تریش ئەوەی بیرم بێت ئەم بەڕێزانە بوون:

(زوبێر ئەیدار، ڕەمزی کارتاڵ، دکتۆر جەبار قادر ، یەشار کایا، تایەر کەمالی زادە، سەلیم بابان، گوڵستان پەروەر) (بروکسل) یەکخستنی هێزی کورد.

### ٤- کۆنفرانسی ئاشتی.

ئێمە لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی کۆنگرەی نەتەوەیی پلانێکی ڕژدمان بۆ کارکردن دانا.

یەکێک لە چالاکییەکانمان، بەستنی (کۆنفرانسی ئاشتی) بوو لە برۆکسل، لەم کۆنفرانسەدا زۆر کەسایەتیی سیاسی کوردو بیانی بەشداربوون، لە کەسانی خاوەن پێگەی کاریگەر، تێیاندا بوو ئەندامی پەرلەمانی ئۆروپاو ئەندامی ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانیاو کۆنگرێسمانی ئەمریکایی دۆستی کورد بوون.

یەکێک لەوانەی لەم کۆنفرانسەدا وتاری خوێندەوە (مادام میتیران)ی هاوژینی سەرۆکی پێشووتری فەڕەنسا بوو، قسەکانی لە دوو خاڵدا کورت دەکەمەوە:

یەکەم:

زۆر بە نیگەرانییەوە باسی دەستگیرکردنی ئۆچالانی کرد، وتی: "کە سەرکردەیەکی گەورەی شۆڕشگێڕی کوردم بەو یەخسیرییە بینی لە فڕۆکەیەکدا بە چاو و قۆڵبەستراویی، خۆم بۆ نەگیراو دامە پرمەی گریان".

دووەم: وتی: "بەداخەوە تائێستا ئێوەی کورد خۆتان ناناسن و دۆزی ڕەوای خۆتان نەناسیوە، لە سەروبەندی گرتنی ئۆچالاندا هێندێک سیاسی کورد تەلەفۆنیان بۆ

دەکردم و گرتنی ئۆچالانیان پیرۆز دەکرد، من لەبەر گریان نەمدەتوانی وەڵامی ئەوان بدەمەوە".

جگە لەم قسانەی مادام میتران، کە بەدبەختی کوردیان دەردەخست، دوو ڕووداوی کۆمیدتراجیدی لەم کۆنفرانسەکەدا ڕوویاندا.

یەکەمیان:

هەموو بۆنەکانی پەکەکە بە سرودی ئەی ڕەقیب دەست پێدەکات و ئەم کۆنفرانسەش هەر وابوو. هەرکە دەستکرا بە چڕینی سرودەکە کۆمەڵێک هەستان و چوونە دەرەوە، چووم بزانم بۆچی چوونەتە دەرەوە، لێم پرسین سەیر دەکەم کۆمۆنیستەکانی باشوورو سەلەفییەکانی باکوور دژی سرودی ئەی ڕەقیب یەکیانگرتووە، کۆمۆنیستەکان دەڵێن: ئەی ڕەقیب سرودی نەتەوەیی کۆنەپەرستانەیەو سەلەفییەکانیش دەڵێن: نابێت بوترێت دینمانە، ئاینمانە کوردستان، ئینجا دەوەرە بزانە ئەم بەدبەختییە سەرو سامانی هەیە؟

دوای کۆتاییهاتنی سرودەکە، برایانی سەلەفی و کۆمۆنیست بە هەڵوێستێکی یەکگرتوو گەڕانەوە هۆڵەکەو بەشداریی کۆبوونەوەکەیان کرد.

دووەمیان: هەرکە ئەمان هاتنە ژووری، ئینجا کوردی

ڕۆژهەڵات چوونە دەرێ، دکتۆر مەحمود عوسمان لامەوە دانیشتبوو، وتی: "کاکە تۆ کوردی باشوورو باکوورت ئاشتکردەوە، برۆ بزانە کوردی ڕۆژهەڵات چییان دەوێت".

که چووم بۆ لایان، وتیان: "ئێمە بەشدار نابین، چونکە ئاڵای کوردستانی لێ نییە".

ئاڵای ئۆروپاو ئاڵای یەکەکە درابوو بەسەر مێزی کۆنفرانسەکەدا، وتم: "کاکە ئێستا ئەوەشتان بۆ چارەسەر دەکەم"، چووم لە ژوورێکی ئوتێلەکە چەرچەفێکی سپیم هێناو خستمە نێوان دوو ئاڵاکەی تری سەرمێزەکە، سپییەکە لەگەڵ ڕەنگی زەردو سورو سەوزەکەدا بوو بە ئاڵای کوردستان.

لە کاتی پشوودان و دوای وتار خوێندنەوە، پەیامنێری ڕۆژنامەی (ئەلحەیاتی لەندەن)ی هات چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردم بە درێژیی باسی ئامانجی ئەم کۆنفرانسەو ئامانجی دوورمـــەودای کۆنگرەی نەتەوەییم بۆ کرد، کە خەبات دەکات بۆ یەکخستنی گەلی کورد لە هەر چوارپارچەکەو بۆ خەونی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی.

پێش دەستپێکردنی گفتوگۆکە، لێی پرسیم هۆکاری ئەو ئاڵۆزییە چی بوو کە یەک دووجار لە هۆڵەکەدا دروست بوو، منیش بۆم باسکرد. کابرا زۆر بە شەوقەوە گوێی بۆ

قسەکانم هەڵخستبوو، بەڵام کە لێبوومەوە وتی: "جا باشە ئێوە لە هۆڵێکدا لەگەڵ یەک ڕێک ناکەون، ئێستا لەسەر ئاستی چوارپارچەکە چۆن ڕێکدەکەون؟".

٥- ترپەی دڵی مادام میتران.

من دەزانم مادام میتران دڵسۆزێکی بێ مەبەستی ئێمەی کورد بوو، زۆر کاری گرنگیشی بۆ ئێمە کردووە.

لەو سەردانەماندا بۆ ئەمریکا کۆنفرانسێکیان بۆ سازکردبووین، لە بینای کۆنگرێس لە واشنتن، دکتۆر نەجمەدین کەریم لەوەدا ڕۆڵی کاریگەری هەبوو، شەو میوانداریيەکی کوردانەی کردین، بەیانی کە دەچووین بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە، سەیر دەکەم لە بەردەم باڵەخانەکەدا، مادام میتران بێکەس و دەستەوستان لەسەر کورسییەک دانیشتووە.

بەرلەوەی ئێمە بگەین، مادام میتران لە دەرگای بیناکەوە چووبووە ژووری، ئامێری پشکنینەکە زەنگی لێدابوو، هەرچەند پشکنیبوویانەوە، ئامێرەکە هەموو جار زەنگی لێداوەو ئاسایشەکانیش نەیانهێشتووە بچێتە ژوورەوە، بۆیە بە کەساسی لە دەرەوە لەسەر کورسییەک دانیشتبوو.

نەجمەدین کەریم زۆر تێکەڵ بوو لەگەڵ مادام میتران،

وتی: "ئەو نەخۆشی دڵی هەیەو لە سنگیدا ئامێرێکیان بۆ داناوە، ئەوەیە بووە بە کێشە". چوو بۆ لای ئاسایشەکان و تێی گەیاندن ئەوە کەسایەتییەکی جیهانییە، ئیتر هاتەوەو دەستی مادام میترانی گرت و چووینە ژوورەوە.

هەرچەند ناوی مادام میتران دێتە ناوانەوە، ئەو دیمەنەم بیر ناچێتەوە کە چۆن لەبەردەم ئەو باڵەخانەیەداو بۆئەوەی بەشداریی کۆنفرانسێکی کوردی بێت، بە کەساسی دانیشتبوو، لە دڵی خۆمدا دەڵێم بۆچی دڵی ئەم ژنە میهرەبانە کە لەگەڵ ترپەی دڵی کوردایە، دەبێت نەخۆش بێت؟! هەمووجاریش نزام دەکرد، دڵی مادام هەرگیز لە لێدان نەکەوێت.

## ٦- کەڵکەڵەی گەڕانەوە بۆ نیشتمان.

لەدوای گرتنی ئۆچالان نە کاروباری ئینستیتیوت و نە کۆنگرەی نەتەوەییش وەک جاران نەبوو، بەتایبەت کە پەککەکە ئەو توانا ماددییەی جارانی نەمابوو، کەڵکەڵەی گەڕانەوەی کوردستانیش لە کەللەی دابووم.

من بەدرێژایی ئەو (١٣)ساڵەی لە ئۆروپا بووم، لە گەشت و سەفەردا بووم، هەموو وڵاتانی دنیا گەڕام، شوێن نەما نەچم و نەیبینم، هەرگیز تەلیسمی ئەو هەموو پایتەخت

و جوانییەی وڵاتانی دنیا بەقەد بۆنی پاییزەبارانێکی خاکی کوردستان تەلیسمی نەبوو.

لەو سیانزە ساڵەی لە ئۆروپا بووم، سێ جار لە ڕێگای ئێرانەوە گەڕابوومەوە کوردستان، لەو سەردانانەمدا دۆست و هاوڕێ و خزم و کەس هاندەرم بوون بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.

خاڵێکی گرنگی تر کە هاندەری گەڕانەوەم بوو، ئەوەبوو ماڵ و منداڵم لە ئۆروپا جێگیر کردبوو، لەمەولا لە کوردستان ئەگەر مەترسیشم لەسەر بێت، خۆم تەنها دەبم و ئەوان بەهۆی منەوە تووشی دەردەسەریی نابن.

کە لە ئەڵمانیا مافی پەناهەندەییم وەرگرت، پاش چوار ساڵ و نیو توانیم ماڵ و منداڵ ببەمە ئۆروپا. ئەوان جگە لەوەی چەند جارێک بەهۆی منەوە ماڵوێران ببوون، بەردەوامیش لەبەردەم هەڕەشەدا بوون، چەندین جار هێزەکانی ئاسایش چووبوونە سەریان و گێچەڵیان پێکردبوون. ماڵیان ئاوابێت هێندێک دۆست و برادەر دەیانپاراستن، بەتایبەتی (دکتۆر سەعدی بەرزنجی)و براکانی، ئەگینا دوور نەبوو هەموویان بەهۆی منەوە تیابچوونایە.

سەرەتا توانیم لەڕێگای قاچاخەوە (ڕەوا)ی کوڕە گەورەم بهێنم بۆ ئەڵمانیا، مایەوە کوڕو کچێکی ترو

هاوژینەکەم، ئەوان نەدەکرا بەهۆی هێندێک مەترسییەوە بە ڕێی قاچاخدا بێن، بۆیە سەرەتا چوونە بەغدا، لەوێوە چوونە (عەمان)و لەوێشەوە بۆ (ئەنقەرە)و لەوێش خۆیان بە باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا ناساندبوو، لەوەوبەر مامەڵەی هاتنم بۆ کردبوون، بۆیە بە ئاسانی بە فڕۆکە گەیشتنە ئەڵمانیاو منیش خاترجەم بووم.

بەدرێژیی تەمەنم ئەوەتی خێزانم دروستکردبوو، ئەمە یەکەمجار بوو هەست بە ئارامی بکەم و لە دڵی خۆمدا بڵێم شتێکی باشم بۆ ئەوان کردووە، چونکە هەردەم بەهۆی منەوە دووچاری ماڵوێرانیی و خۆحەشاردان و ڕاکردن و ڕاوەدوونان ببوون.

لێرەدا بە گونجاوی دەزانم داوای لێبووردنیان لێ بکەم و بە دایکیشیان بڵێم: "بەڕاستی هاوڕێی بێ غەلوغەشی ڕۆژانی سەختی خەبات بوویت".

بەڵام ئەنجام
لێوی حەز هەر دەگا بە ماچ
عیسا دادەگیرێ لە خاچ...!

١- گەڕانەوە بۆ کوردستان.

ساڵی (٢٠٠٢) مام جەلال هاتبوو بۆ پاریس (سەلاح ڕەشید)، کە لە بەرلین بوو، هات بۆلام، وتی: "مام جەلال دەیەوێت بتبینێت".

چووم بۆ پاریس و مام جەلالم بینی، گفتوگۆی زۆرمان کرد، پێشنیاری کرد کە بگەڕێمەوە هەرێمی کوردستان و وتی: "گۆڕانکاریی گەورە لە ئێراقدا بەڕێوەیەو لەگەڵ برادەرانی پەکەکەش کێشەی زۆرمان هەیە، ڕەنگە لەمەولا پێویستمان بەوە بێت کە بۆ ناوەندگیریی و ئاڵوگۆڕی ڕاوبۆچوون لەنێوان ئێمەو ئەواندا، باشترە بێت لە کوردستان بیت".

لەسەر قسەی مام جەلال بڕیاری گەڕانەوەم داو بەرلەوەش دەبوو کاروباری ئینستیتیوتەکە بسپێردرێت بە کەسێکی تر، بۆیە من نووسراوی خۆم پێشکەشی شارەوانی کردو ئاگادارم کردنەوە، چیتر من بەرپرسیار نابم بە ڕێکاری یاسایی و کەسێکی تر جێگای من دەگرێتەوە.

لەسەر قسەی مام جەلال گەڕامەوە کوردستان و تەلەفۆنم بۆ سەلاح ڕەشید کرد، وتی: "ئێستا مام جەلال لە

دەرەوەی وڵاتە، دەتوانیت کاک نەوشیروان ببینیت".

تەلەفۆنم بۆ کاک نەوشیروان کرد، وتی: "وەرە بۆ ماڵەوە".

چووم بۆ لای کاک نەوشیروان، بۆم باسکرد کە مام جەلال پێی باش بووە بێمەوە کوردستان، وەکو ئەڵقەی پەیوەندی لەنێوان باکوورو باشووردا، قسەی زۆرمان کردو ژمارەی تەلەفۆنمان ئاڵوگۆڕ کرد.

مام جەلال گەڕایەوە بۆ کوردستان، ئەویشم بینی، ئیتر لەو ماوەیەدا هەموو پەیوەندییەکانی پەکەکەو یەکێتی لە ڕێگای منەوە دەکرا.

من کە گەڕامەوە کوردستان دەمێک بوو حکومەتی هەریم دامەزرابوو، بۆیە کەوتمە سەرو سەودای ئەوەی ڕاژەی فەرمانبەرییەکەم زیندوو بکەمەوە.

(عومەر فەتاح) ئەودەمە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو، چووم بۆ لای، وتم: "من کاتی خۆی بەڕێوەبەر بووم، دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ کارەکەی خۆم"، یەکسەر فەرمانی بۆ دەرکردم، بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیریی، لەڕاستیدا کارەکە ئەوەندە ئاسان بوو، داوای بەڕێوەبەری گشتیشم بکردایە بۆی دەکردم، کە هاتمە دەرەوە، ئاهی پەشیمانیم هەڵدەکێشا.

٢- سەربازە دیلەکان.

سەرو سەودام لەگەڵ (هەڵۆی برایم ئەحمەد)دا هەبوو، ماڵیشمان نزیکی یەک بوو، بۆیە جارجارە پێکەوە گفتوگۆمان لەگەڵ یەکتر دەکرد.

ڕۆژێک هەڵۆ هات بۆ ماڵمان، وتی: "لە شەڕدا پەکەکە دوانزە سەربازی تورکیان بە دیل گرتووە، تورکیاو ئەمریکاییەکانیش مام جەلالیان ئاگادارکردووە، کە ئەگەر ئەو سەربازانە ئازاد نەکرێن، ئەوا کارەسات بەسەر باشووردا دێنن"، منیش ئامادەییم دەربڕی وتم: "چیم پێ بکرێت دەیکەم".

مام جەلال ناردی بەدوامدا، وتی: "پێنجوێنی برۆ بۆ لای برادەران و تێیان بگەیەنە کە فشارێکی زۆرمان لەسەرەو بەدرێژیی سەبارەت بە بارودۆخەکە قسەیان بۆ بکە".

من چووم بۆ قەندیل و نامەکەی مام جەلالم بۆ موراد قەرەیڵان خوێندەوە، بۆشم وەردەگێڕایە سەر کرمانجی، چونکە نامەکە بە عەرەبی نووسرابوو، وەڵامم وەرگرت و گەڕامەوە.

هەڵۆ لەگەڵ چەند ئەمریکییەک هاتن بۆ ماڵەوە، باسی ئەوەیان کرد کە تورکیا نیازی خراپەو ئێمەش وەک ئەمریکا پێمان باشە ئەو سەربازانە بدرێنەوە بە تورکیا، بۆئەوەی

هەرێم دووچاری گێچەڵ نەبێت.

هەر لەو بەینەدا کاک نەوشیروان مستەفا تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی: "ئەمریکییەکان داوای بینینی تۆیان کردووە"، وتم: "یەک دوو جار لەگەڵ هەڵۆدا هاتوونەتە لام و بینیومن". وتی: "نا، ئەم کەسە ئەمریکاییە بەتایبەت بۆ بینینی تۆ هاتووە، ئەگەر تۆ قایل بیت بەیانی وەرە بۆ ماڵی خۆمان و هەر خۆشم وەرگێڕانتان بۆ دەکەم".

ڕۆژی دواتر چووم بۆ ماڵی کاک نەوشیروان، کابرایەکی ئەفەندی دانیشتبوو، پاش یەکتر ناسین، وتی: "من لە باڵیۆزخانەی ئەمریکایی لە بەغداوە هاتووم". کورت و پووخت پێی وتم: "تورکیا بە ئێمەیان وتووە ئاگادارتان بکەینەوە، کە ئەگەر سەربازە دیلەکان ئازاد نەکەن، هەردوو فڕۆکەخانەی هەولێرو سلێمانی بۆردوومان دەکەین". ئەم پیاوە زانیارییەکانی وردتر بوون لەو ئەمریکاییانەی کە پێشتر بەهۆی هەڵۆوە بینیبوومن.

جارێکی تر من سەردانی قەندیلم کردەوە، لە مەترسی بارودۆخەکەو زانیاری ئەمریکاییەکان و نییەتی تورکیا ئاگادارم کردن.

ئەم هاتوچوونەم بەوە کۆتایی هات کە برادەرانی پەکەکە قایل بوون سەربازە تورکەکان ئازاد بکەن.

ئینجا باس و خواسی ئەوە هاتە پێشێ، بە چ میکانیزمێک ئەم سەربازانە ڕادەستی تورکیا بکەینەوە. هێندێک برادەر لە یەکێتی دەیانویست ئەمە بقۆزنەوە، وتیان: "با سەربازەکان بێنە سلێمانی و لێرە تەسلیمی تورکەکانیان بکەینەوە"، منیش وتم: ئێوە بەردەوام دەڵێن: "پەکەکە لەم ناوچەیە نییە، ئێستا سەدان کیلۆمەتر ئەم سەربازانە بێنین بۆ سلێمانی تورکیا دەڵێت دیارە هەر لەناو شارەکەدان".

برادەرانی پەکەکە میکانیزمێکی تریان گرتەبەر لە ئۆروپاوە پەیوەندییان بە ڕێکخراوی خاچی سوری نێودەوڵەتییەوە کردو لەگەڵ حکومەتی هەرێمیشدا ڕێکەوتن، کە لە گوندێکی سەر سنوور بە ئامادەبوونی وەزیری ناوخۆی هەردوو ئیدارەی سلێمانی و هەولێر (کەریم سنجاری و عوسمانی حاجی مەحمود)و نوێنەری خاچی سوری نێودەوڵەتی، هەر دوانزە سەربازەکە ڕادەستی دەوڵەتی تورکیا بکرێنەوە.

٣- بەرەو کۆشکی شای ئوردن.

پاش ئەوەی هەوڵەکەم سەرکەوتوو بوو لە گەڕانەوەی سەربازەکانی تورکیادا، ڕۆژێک هەڵۆ کەسێکی لەگەڵ بوو، هاتن بۆ ماڵەوە، بە ناوی باڵیۆزی ئەمریکاوە لە بەغدا، دەمانچەیەکی وەکو دیاری بۆ هێنام، دوای ئەوەش ئەو

ئەمریکاییانەی تریش کە هەر دۆستی هەڵۆ بوون لە سلێمانی، هاتن بۆ لام و هەندێک دیارییان هێنا، کتێبی عەرەبی لەسەر مێژوو و ئەدەبی ئەمریکاو کۆمەڵێک کتێب و قەڵەمێک و دروشمێکی دینی و گوایە ئەمە سوپاسگوزارییە، لەبەرئەوەی ڕۆڵم هەبووە لە ئازادکردنی سەربازە تورکەکاندا.

ئەم هەولانە پەیوەندیی من و هەڵۆی زیاتر لێک نزیککردەوە، ڕۆژێکیان هەڵۆ هات بۆ ماڵەوەو وتی: "ڕاوێژکارێکی پادشای ئوردن هاتووە بۆ کوردستان و نوێنەری هەموو لایەکی بینیوەو دەیەوێت نوێنەری پەکەکەش ببینێت، منیش پێم باش بووە تۆ ببینێت، منیش وتم: "لاریم لەوە نییە".

وادەی دانیشتنەکە ڕێکخرا، لەگەڵ ئەو ڕاوێژکارەی شاعەبدوڵلای ئوردندا، کە ناوی سالح بوو، کۆبوومەوە.

ئەم پیاوە زانیارییەکانی سەبارەت بە پەکەکە هەر ئەوەبوو، کە دەوڵەتی تورکی و فەرمانگەی جەنگی تایبەتی هەواڵگری تورکیا لە نێوەندە دیبلۆماسییەکاندا بڵاوی دەکەنەوە، هەردەم دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە پەکەکە ڕێکخراوێکی تیرۆریستییە، بۆیە من زۆرم لەو زانیارییانە بۆ ڕاستکردەوەو سەبارەت بە پەکەکەو عەبدوڵلا ئۆچالان ئەوەی پێویست بوو، بەباشی بۆم ڕوونکردەوەو باسی

ئەوەشم کرد کە پەکەکە بە ناچاریی پەنای بردۆتە بەر چەک، ئەگینا لایەنگری چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کوردە لە تورکیا، بۆ شم باسکرد من خۆم پێشنیاری ئاشتییانەی چارەسەری کێشەی کوردم لەلایەن ئۆچالانەوە، گەیاندۆتە دەست سەرۆکی نەتەوەیەکگرتووەکان.

پاش ماوەیەک هەڵۆ هات بۆ ماڵمان، وتی: "تۆ دەبێت بچیت بۆ عەمان، لەوێ دەیانەوێت بتبینن و تەنانەت شای ئوردنیش دەتبینێت". من لاریم نەبوو، بەڵام وتم: "سەرەتا دەبێت بچم پرس بە برادەرانی قەندیل بکەم" پێشنیاریشی کرد کە پەکەکە نامەیەک بۆ پادشای ئوردن بنووسن، دیاربوو پێشنیاری ڕاوێژکارەکەی پادشا بوو، نامە بنووسن.

سەردانی قەندیلم کردو موراد قەرەیڵانم بینی و بۆم باسکرد، کە حکومەتی ئوردنی بە بایەخەوە لە سەردانی من دەڕوانن و خۆشیان داوایان کردووە، تەنانەت شاعەبدوڵڵای ئوردنیش دەبینم.

موراد خۆی زۆری پێ باش بوو، وتی: "بەڵام با لەگەڵ برادەرانی سەرکردایەتیشدا کۆبوونەوەیەک بکەین"، باسی هۆنینەوەی نامەیەکیشم بۆ کرد، کە پەکەکە ئاڕاستەی پادشای ئوردنی بکات.

چاوەڕێم کرد تا ئەوان کۆبوونەوەی خۆیان کردو گەیشتنە بڕیار، دیاربوو سەردانەکەیان پەسەند کردو نامەیەکیشیان نووسی و بەکراوەیی دایانە دەستم، منیش خوێندمەوە، دوو تێبینیم لەسەر نامەکە هەبوو، هەردوو تێبینییەکەیان بە هێند وەرگرت و بەوجۆرەی من وتم، جارێکی تر نامەکە داڕێژرایەوەو تایپ کراو درایە دەستم.

گەڕامەوە بۆ سلێمانی و فڕیم بۆ عەمان، نامەیەکم لە بەرکی باخەڵدایە بۆنی گوڵێلکی کێوی چیای سەرکەشی قەندیلی لێدێت و دەیبەم بۆ دەرباری پادشای ئوردن.

هەڵۆ خۆی ڕۆژو وادەی سەفەرەکەمی پێوتم و تیکتیشم بۆ بڕدرابوو، بۆیە کە لە فرۆکەخانەی سلێمانییەوە فڕیم و لە عەمان نیشتمەوە، دیاربوو هەموو شت ڕێکخرابوو، هەرکە چوومە ناو ریزی میوانانی تایبەتەوە، بینیم دوو کەس دروشمێکیان بڵند کردووە، نووسراوە (حەمەمین پێنجوێنی) خۆیان پێ ناساندم (ئەبو تالا)و شۆفێرەکەی بردیانم بۆ ئۆتێل شیراتۆن.

یاوەرەکەم کە خۆی وەک ئەفسەرێکی پلە باڵای دەزگای موخابەراتی ئوردن ناساند، وتی: "ئوستاز تۆ ئۆتۆمبێلێک بە شۆفێرێک و پاسەوانێکەوە لەخزمەتتدایە، ڕۆژانە بە وڵاتدا دەتگێڕن، چیت دەوێت و چۆنت دەوێت، ئەوان وا دەکەن و

شانشینی ئوردن لە خزمەتتدایەو تۆ میوانی پادشای، هەتا وادەی بینینی پادشای وڵات دێت".

نزیکەی هەفتەیەک بە پاکی ئوردنداگەڕاندیانم، شوێنەواری مێژوویی و مۆزەخانەو شوێنە گەشتیارییەکان، لە عەمانیش بۆ هەموو شوێنێکیان بردم، وتیان: " تۆ سەرپشکی لەوەی چی دەکڕیت و وەکو دەستودیاری دەیبەیتەوە"، لە عەمان لە "مەکە مۆڵ"، کە ئەوسا گەورەترین بازاڕی عەمان بوو، دوو کراس و بۆینباخێکم کڕی، نەیانهێشت پارە بدەم، لە دوای ئەوەوە ئیتر حەزم لە شتێکیش بووایە نەمدەکڕی، چونکە دەمزانی نەیاندەهێشت پارە بدەم و دەیانوت: "تۆ میوانی پادشای ئوردنی"، بۆیە ئیتر منیش خۆم لە سەوداو مامەڵە دەپاراست.

ئۆتۆمبێلی خانەخوێکان جۆری مارسیدس بوو، تابلۆی کۆشکی پادشای وڵاتی پێوە بوو، بۆیە بۆ هەرکوێ دەچووین، بەگەرمی پێشوازیمان لێدەکرا، حەوت هەشت ڕۆژێکی پادشایانەم گوزەراند.

لەو ماوەیەدا لە هۆڵی پێشوازیی ئوتێلەکە چاوم کەوت بە (دکتۆر مۆفەق دەرگەڵەیی)، کەمنی بینی بە یاوەریی پاسەوانی پادشایی، لای سەیر بوو، وتم: "هەموو شت باشە، کە گەڕامەوە کوردستان بۆت باس دەکەم". جارێکیشیان

(هوشیار زێباری)م بینی، خۆم هەڵەکرد نەبادا پرسیارو قسەوباس دروست بێت.

ئێوارەیەکیان ئەو ئەفسەرەی لە فڕۆکەخانە هاتبوو بەپیرمەوە، وتی: "بەیانی خۆت ئامادە بکە سەعات هەشت دێم بە دواتا، سەرۆکی موخابەراتی ئوردن دەبینیت".

بەیانی ئەو ئەفسەرەی لە فڕۆکەخانە پێشوازیی لێکردم، هات بە شوێنمدا، بۆ ئوتێلەکەو ڕۆیشتین بۆ دیوانی موخابەراتی گشتی، بەڕێوەبەری گشتی خۆی پێشوازیی لێکردم و منیش نامەکەم دایەو کەوتینە گفتوگۆو پرسیاری سەبارەت پەکەکە لێکردم، منیش ئەوەی پێویستبوو بۆم باسکرد، پاشان پرسیاری کرد، کە جەنابی سەرۆک کۆمار ئاگاداری ئەم هاتنەتە بۆ ئوردن؟ وتم: "بەڵێ ئەو ئاگادارە"، پاشان پرسی جگە لە مام جەلال کێی تر ئاگاداری ئەم هاتنەتە بۆ لامان، وتم: "هەڵۆی برایم ئەحمەد، کە ژنبرای سەرۆک کۆمارە".

پرسیاری ئەوەشی کرد کە من کوردی ئێراقم، پەیوەندیم بە کوردی تورکیاوە چییە؟ وتم: "من دۆستی ئەوان و هاوڕێی عەبدوڵڵا ئۆچالانم، بەڵام زیاتر نێوەندگیریی دەکەم لەنێوان ئەوان و لایەنەکانی تردا".

نامەکەیان بردو پاش کەمێک هێنایانەوە، دیاربوو

کۆپییان کردبوو، خستییانە فایل و زەرفێکەوە، وتیان: "کە چوویتە لای مەولانا (مەبەستیان پادشا بوو)، ئەم فایلەی بەم شێوەیە پێشکەش بکە".

لە ڕێگای گەڕانەوەماندا بۆ ئوتێلەکە ئەو ئەفسەرەی لەگەڵمدا بوو ژمارەو ئەدرەسی خۆی پێدام و وتی: "هەرکاتێک ڕێت کەوتە ئوردن بۆ هەر کاروبارێک پەیوەندیم پێوە بکە". دیاربوو ئەفسەرەکە زۆر دەستڕۆیشتوو بوو، چونکە لە دیداری بەڕێوەبەری موخابەرات و تەنانەت لە دیدارەکەی پادشاشدا هەر لەگەڵمدا بوو.

بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستام، لە بەردەم دەرگای ژوورەکەمدا لە سەبەتەیەکدا ڕۆژنامەکانی ئەوکاتەی ئوردنیان بۆ دادەنام و منیش خۆم پێوە سەرقاڵ دەکردن، ڕۆژێکیان لە یەکێک لە ڕۆژنامەکاندا کەوتە بەرچاوم کە (داود باغستانی) لە عەمان کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی گرتووە، لە کۆنگرەکەشدا وتوویەتی: "ئەو لە تەلئەبیبەوە هاتووە بۆ عەمان و لەوێ بەشداریی مەراسیمی دامەزراندنی ئینستیتیوتی بارزانی کردووەو نامەیەکی پەکەکەشی گەیاندۆتە شەمعون پێریس".

من بە بینینی ئەم هەواڵە ساکام، چەند ڕۆژێکی نەبرد، ئەبو تالا هات بە دوامداو وتی: "دەچین بۆ لای بەڕێوەبەری موخابەرات".

چووینەوە بۆ ئەو شوێنەی یەکەمجار بەڕێوەبەری موخابەراتم لێ بینی، کە چوومە ژوورەوە، پاش بەخێرهێنان، بە مۆنییەکەوە چاوی تێبڕیم و ئەو ڕۆژنامەیەی خستە بەر دەستم کە قسەکانی داود باغستانی تێدا بڵاوبۆتەوەو پرسی: "ئەمەت بینیوە؟"، وتم: "بەڵێ، بینیومە".

وتی: "شتی وا چۆن دەبێت، پەکەکە لە یەک کاتدا تۆ دەنێرن نامە بگەیەنێتە مەولاناو داود باغستانیش دەنێرن نامە ببات بۆ شەمعون پێرس؟"، وتم: "من هیچ ئاگاداری ئەمە نیم".

لەڕاستیدا ئەم لێدوانانەی داود باغستانی، بایی ئەوە بوو ڕیسەکەی من بکاتەوە بە خوری، تەنانەت بینینی پادشای ئوردنیش تێکبدات، ئەگەرچی وا نەبوو، بەڵام ئیشی خراپی خۆی کرد.

دوایی کە گەڕامەوە بۆ لای برادەرانی پەکەکە، ئەو کەتنەی داود باغستانیم بۆ گێڕانەوە، وتیان: "ئێمە هیچ نامەیەکمان نەنووسیوە، بەڵام خۆی وتوویەتی دەچم بۆ تەلئەبیب، چیتان بۆ بکەم؟ وتوومانە ئەگەر کەسێکی پایەدارت بینی، دوو قسەی کوردانە بۆ پەکەکە بکە، تەنها هەر ئەوە بووە"، لەدوای ئەوە پەکەکە کۆتاییان بە پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ داود باغستانیدا هێنا، دەریش نەکەوت تا چەند ڕاستە کە

داود باغستانی، شەمعون پێرسی بینیوە!

چەند ڕۆژێکی ترم لە عەمان بە گەشت و گەڕانەوە بەسەربردو ئەفسەرەکە ئاگاداری کردمەوە کە وادەی بینینی پادشا هاتووە، هات بە شوێنمداو بردمی بۆ "مینای عەقەبە" پادشا لەوێ بوو، لە ڕێگەش ئاگاداری کردم کە ئەمڕۆ پادشا زۆر سەرقاڵەو لە (بەترا) بەشداریی مەراسیمێک دەکات، بۆ ئەوانەی خەڵاتی نۆبلی ئاشتییان وەرگرتووە.

چوومە لای (شاعەبدوڵڵا)و نامەکەم پێشکەش کردو چاوێکی پیاخشاند، ناوەرۆکی نامەکە کورت و پووخت بوو، بە عەرەبیش نووسرابوو، باسی ئەوەی تێدابوو ئێمەی گەلی کورد لەسەر خاکی خۆمانین، کەچی لە تورکیا وەک هاوڵاتی پلە دوو مامەڵەمان لەگەڵ دەکرێت و هیچ مافێکمان پێ ڕەوا نابینرێت، تەنانەت مافی ئەوەشمان نییە بە زمانی خۆشمان قسە بکەین، دەمانەوێت بە ڕێگای ئاشتی وەکو گەلێک مافەکانمان دەستەبەر بکەین، بۆ ئەمەش داوا لە جەنابی پادشا دەکەین کە پشتیوانیمان بکات".

قاوەیەکیان بۆ هێنابووم کەمێکم لێ خواردەوە، پاش خوێندنەوەی نامەکە شا عەبدوڵڵا سەیرێکی کردم و ئەفسەرەکەی یاوەریشم دەستەو نەزەر وەستابوو، منیش

وتم: "بۆئەوەی لەکاتی مەولانا نەگرم دەڕۆم، بەڵام من چی وەڵامی برادەران بدەمەوە"، شا عەبدوڵڵا وتی: "ئینشا ئەڵڵا خێر".

پاش مانگێک ئەردۆگان سەردانی شا عەبدوڵڵای کرد، بێگومان لە میدیادا باس لەوە نەکرا کە گوایە باسی کێشەی کورد کراوە لەو دیدارەدا، بەڵام لەو ماوەیەدا شا عەبدوڵڵا باسی مەترسی (هیلالی شیعی) کردبوو و هێندێک نووسەرو توێژەvmوەش لە ڕاگەیاندنەکاندا باسی ئەوەیان دەکرد، کوردی تورکیاو کوردی ئێراق بە گشتی سوننە مەزهەبن و دەبێت مافیان بدرێتێ، بۆئەوەی نەکەونە بەرەی شیعەوە.

دوای بینdkی شا عەبدوڵڵا گەڕامەوە بۆ سلێمانی، مام جەلال ناردی بە شوێنمدا بۆ بەغدا، وتی: "ئەردۆگانم بینیوە، باسی چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کوردم لەگەڵدا کردووە لە تورکیاو هەڵوێستی باش بووە".

لەو سەرو بەندەدا سیاسییەکانی ئەک پارتی و میدیای تورکی هەڵوێستی نەرمیان دەنواند بەرامبەر بە کورد، دەشیانویست بۆ هەڵبژاردن هاوسۆزیی کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن.

جارێکیشیان هەر لەو ماوەیەدا ئەردۆگان سەردانی بەغدای کرد، پێش ئەوە مام جەلال تەلەفۆنی بۆ کردم کە

بچم بۆ لای، وتی: "پێش ئەوەی بێیت بۆ بەغدا، بچۆ بە برادەرانی قەندیل بڵێ نامەیەکی نەرم بنووسن، بۆئەوەی کە ئەردۆگان هات بۆ بەغدا، بیدەمە دەستی".

لێرەدا دەمەوێت بەیادی مام جەلالەوە شتێکی خۆش بگێڕمەوە. مام جەلال وتی: "کە نامەکەی پەکەکەم دایە دەست ئەردۆگان و خوێندییەوە وتی، جەنابی سەرۆک دیارە پەکەکە لە ژوورەکەی ئەودیون، سەیری دیرۆکەکە بکە، ئەم نامەیە بیستوچوار سەعات پێش ئێستا نووسراوە"!

مەبەستی ئەردۆگان ئەوە بوو، ئێوە دەڵێن دەستمان بە پەکەکە ناگات و بەو شاخانەوەن، ئەی چۆن وا بە دەمودەست فریاکەوتوون، ئەم نامەیەیان لێوەرگرن؟!

مام جەلال وتی: "هەوڵەکانمان بەرەوپێشەوە چووە، ئێستا گەیشتووە بەوەی ئەوان دەیانەوێت یەکێک ببینن کە ئاگاداری سیاسەت و هەڵوێستی پەکەکە بێت و بشزانن پەکەکە چۆن لە ئاشتی دەڕوانێت، بەڵام وتوویانە نامانەوێت ئەو کەسە پەکەکە بێت، بۆئەوەی ئەگەر دوای ئەو یەکتربینینە ئاشکرابوو، بڵێین ئێمە لەگەڵ پەکەکە دانەنیشتووین", مام جەلال وتی: "من تۆم دەستنیشان کردووە بۆ ئەم ئەرکە، دەبێت بچیت بۆ تورکیا".

بێگومان من لاریم لە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە نەبوو، بەڵام وتم: "دەبێت بچم پرس بە برادەرانی قەندیل بکەم، ئەوسا جەنابت چی بڵێیت وا دەکەم".

ئەم جارەیان بە فەلاکەت گەیشتمە قەندیل، چەند سەعاتێک بە پێ و بە سواری وڵاخ هەتا گەیشتمە شوێنی مەبەست، کە گەیشتم موراد قەرەیلان و جەمیل بایک و دۆران کالکان، لەوێ بوون، سۆزان ئاڤیستاش کە ئەودەمە هاوسەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتی بوو، ئامادەی دانیشتنەکە بوو، باسی هەوڵەکانی مام جەلالم بۆ کردن، ئەوان خۆشیان لە کەناڵی ترەوە ئاگاداربوون کە نییەتێک بۆ ئاشتی هەیە لە تورکیا.

وتم مام جەلال دەڵێت: "ئەگەر تۆ بچیتە تورکیا، گەورەترین کاربەدەستی دەوڵەت دەبینیت، تەنانەت دوور نییە ئەگەر پێویست بکات عەبدوڵڵا گول و ئەردۆگانیش ببینن، جا ئێوە دەڵێن چی؟".

وتیان: "ئێمە دەزانین ئەوان چییان دەوێت، پێت دەڵێن با پەکەکە چەک دابنێت و بچێتە دەرەوەی سنوورو ئێمەش لێبووردن بۆ هەندێکیان دەردەکەین و ئەوانی تریش با بچنە ئۆروپا"، بەڵام بەهەرحاڵ پێمان باشە تۆ بچیت و ئەو کارە ئەنجام بدەیت، منیش پرسیارم کرد "من چی بەوان

بڵێم؟ وتیان: "تۆ جارێ بچۆو گوێ بگرە، بزانە ئەوان چی دەڵێن، کە هاتیتەوە ئەوسا قەسەی تر دەکەین".

چوومەوە بۆ بەغداو بە مام جەلالم وت: "برادەران قایل بوون و پێیان باشە بچم بۆ تورکیا، ئیتر مام جەلال خۆی هەموو شتی ڕێکخستبوو، پاش یەک دوو ڕۆژ لە وادەی سەفەرەکە ئاگادارکرام.

٤- ئیمرە تەنەر.

لە فڕۆکەخانەی سلێمانییەوە بەرەو ئەستەمبوڵ بەڕێکەوتم، ماڵ و منداڵی (بەهرۆز گەلاڵی) نوێنەری یەکێتی لە تورکیا لە فڕۆکەکەدا بوون، دیاربوو کاروباری سەفەرەکەمان بەیەکەوە ڕێکخرابوو، بەڵام خۆمان لە یەک نەگەیاند.

کە لە ئەستەمبوڵ نیشتینەوە، بەهرۆز گەلاڵی لە چاوەڕوانیماندا بوو، لەوێ لەگەڵ بەهرۆز هێندێک قسەمان کرد. ئیتر ئەو منی بە کەسێکی تر ناساندو جیابووینەوەو ئەویش چوو بە لای ماڵ و منداڵەوە.

ئەو کەسەی کە بەهرۆز پێی ناساندم، بە عەرەبی قسەی دەکرد، بردمی بۆ شوێنێک ڤێلایەک بوو، دیاربوو میوانخانەی تایبەتی خۆیان بوو، شەوێک لەوێ مامەوەو

بەیانی لەگەڵ ئەو کورەدا کە بوو بە یاوەرم، فڕین بۆ ئەنقەرە, بردمییە ئوتێلێکی پێنج ئەستێرە، لەوێ سویتێکی تایبەتی بۆ گرتبووم و بە ئوتێلەکەدا گەڕاندمی و وتی: "تۆ لێرە میوانی خواردن و خواردنەوەت هەمووی لەسەر ئوتێلەکەیە، بەدڵی خۆت چیت دەوێت وا بکەو منیش سەردانت دەکەمەوە".

ئوتێلەکە ئەوەندە دڵگیر بوو، ئەو شەوەم لەوێ ڕابواردو نەچوومە دەرەوە، بەیانی ئەو کوڕەی یاوەرم بوو، لە خەو هەڵیساندم، خۆم گۆڕی و چوومە خوارەوە, بەهرۆز گەلاڵی لە ڕیسێپشنی ئوتێلەکە دانیشتبوو، بەهرۆز بەجیا بە منی وت: "پێیان بڵێ با من وەکو وەرگێڕ لەگەڵت بێم"، بە کوڕەکەی یاوەرم وت، وتی: "پێویست بە وەرگێڕی کوردی ناکات، من تورکییەکەت بۆ دەکەم بە عەرەبی، تۆش عەرەبییەکەت لە من باشترە، ئیتر وەرگێڕت بۆ چییە؟".

بردیانم بۆ باڵەخانەیەک کە فەرمانگەی هەواڵگریی دەوڵەتی تورکیا بوو، کە چووینە ژوورەوە بە قادرمەدا سەرکەوتین بۆ نهۆمی دووەم، کابرایەکی بەتەمەن هاتە پێشوازیی و تەوقەی لەگەڵ کردم، خۆم ناساندو ئەویش وتی: "من ئیمرە تەنەر"م، ئیمرە تەنەر ڕاوێژکاری ئەمنی قەومی تورکیا بوو، کە چووینە ژوورەوە جگە لە ئیمرە،

دوو کەسی تریشی لێبوو، یەکێکیان ژن بوو، ئەوی تریش کوڕێکی گەنج بوو.

ژوورەکە دیاربوو، بەتایبەت ئامادەکرابوو بۆ دیداری نهێنی، چونکە هەمووی کامێراو ئامێری ئەلەکترۆنی بوو.

جگە لە من و کوڕەکەی یاوەرم کە وەرگێڕانی بۆ دەکردم، ئەو سێ کەسەی لە ژوورەکەدا بوون، سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی سەربازیی و سەرۆکی موخابەرات و سەرۆکی دەزگای ئاسایشی ناوخۆی تورکیا بوون.

هەریەکەیان فایلێکی لە بەردەمدا بوو، ئامێری پەیوەندیش بە گوێچکەیانەوە بوو، من بەرامبەر هەرسێکیان دانیشتبووم وەرگێڕەکەش لە تەنیشتمەوە بوو. من خۆم پێناساندن و تۆزێک باسی خۆم و مێژووی خۆم بۆکردن.

ئیمرە تەنەر کە ئەوان خۆیان (ساین موستەشار)یان پێدەوت، وتی: "پێم خۆشە لەگەڵ کەسایەتییەکی وەکو تۆدا دادەنیشین و لەگەڵ سەرۆک تاڵەبانیدا بە تەلەفۆن قسەمان کردووەو باسی تۆی بۆ کردووم".

پاشان وتی: "ئەم دانیشتنەمان دوورودرێژ دەبێت و پرسیاری زۆرت لێ دەکەین و تۆش تەواو ئازادیت، چی دەڵێیت بیڵێ، ڕاستەوخۆ ئەوەی لەم ژوورەشدا دەگوزەرێت بە ڤیدیۆ، سەرۆک کۆمارو سەرۆک وەزیران سەیری

دەکەن و گوێیان لێیەتی، بۆیە هەرچیان پێ وتوویت بە سەربەستی بیڵێ".

منیش ئاوها دەستم پێکردو وتم: "سڵاوی موراد قەرەیڵان و جەمیل بایک و سەرکردایەتیی سیاسی و سەربازیی پارتی کرێکارانی کوردستانتان پێدەگەیەنم، سڵاوی تایبەتیشم بۆ جەنابی سەرۆک کۆمارو جەنابی سەرۆک وەزیرانی تورکیا، هەردوو بەڕێزان عەبدوڵلا گول و ڕەجەب تەیب ئەردۆگان".

وتم: "بۆیە منیشیان ڕاسپاردووە بەتایبەت ئەم سڵاوەیان بگەیەنم، چونکە لەو ڕۆژەوە کۆماری تورکیا دامەزراوە، ئەوان یەکەم سەرۆک کۆمارو یەکەم سەرۆک وەزیرانن، بە ئاشکرا دانیان بەو ڕاستییەدا ناوە کە لە تورکیادا کورد هەیەو کێشەیەی کوردی هەیەو هەوڵی چارەسەری دەدەن".

جا بەڕاستیش هەر وابوو، سەرەڕای هەرشتێک کە دواتر بە هەڵەی ئەک پارتی و پەکەکەش ئاشتییەکە تێکچوو، دەبێت ئەوە بۆ مێژوو بنووسرێت، کە لەوەوبەر هیچ سەرۆکێکی تورکیا ئامادە نەبووە تەنانەت دان بە بوونی کوردیشدا بنێت، کەچی عەبدوڵلا گول و ئەردۆگان لەو ماوەیەدا لە وتارەکانیاندا بە بایەخەوە باسیان لە کورد دەکردو جارێکیان ئەردۆگان لە وتارێکیدا شیعرێکی

"ئەحمەدی خانی"شی خوێندەوە.

ڕاستە ئەمان لە ڕوانگەی هاوسۆزیی ئاینی و موسڵمانێتییەوە باسیان لە برایەتی کوردو تورک دەکردو مەبەستی ئایدیۆلۆجی خۆیان هەبوو، بەڵام ئەوە شتێکی نوێ بوو لە مێژووی کۆماری تورکیادا.

بێگومان من بەرلەوەی بێم بۆ تورکیا، لەگەڵ برادەرانی پەکەکە بەدرێژیی قسەم کردبوو کە چی بڵێم، ئەگەرچی ئەوان پێیان وابوو ئەمجارە هەر گوێ بگری باشە، لەگەڵ مام جەلالیش قسەم کردبوو، ئەویش ڕێنمایی باشی کردم، وتی: "تۆ دەچیت لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا قسە دەکەیت، دەبێت ورد بیت و بزانیت چی دەڵێیت".

بەدرێژیی ئەوکاتانەی لە فڕۆکەکەدا بووم و شەوانیش کە بە تەنیا بووم هەر لە خەیاڵی ئەوەدا بووم لەم دیدارانەدا چی بڵێم و چۆن قسە بکەم و چۆن بتوانم شتێکی باش بۆ گەلەکەم بکەم.

شەو تا بەیانی حاڵم لە حاڵی قوتابییەک دەچوو کە لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکدا بێت، بڕیاری مان و نەمانی یەکلایی بکاتەوە، بۆیە سەعییەکی باشم بۆ ئەم دانیشتنە کردبوو.

وتم: "ئەو برادەرانە دەڵێن ئێمەی کورد بێ ئەمەک نین

لە بەرامبەر هەڵوێستی سەرۆک کۆمارو سەرۆک وەزیراندا بەوەی دانیان بە کێشەی کورددا ناوە، ئێمەش ئامادەین بەپیر چارەسەرەوە بێین و ڕێگای گفتوگۆ هەڵبژێرین و ئاشتی لەنێوان تورک و کوردا بەرپا بکەین، چونکە ئێمە هەردوو نەتەوە دۆستین و خوێنمان تێکەڵاوی یەک بووەو موسڵمانین و براین، لەجیاتی ئەوەی خوێنی یەکتر بڕێژین، دەمانەوێت پێکەوە بە ئاشتی بژین".

هەستم کرد قسەکانیان پێخۆش بوو، ئاگاشم لێبوو کە لەو ئامێرەی بە گوێچکەی ئێمرە تەنەرەوەیە شتی پێدەڵێن، چونکە ناوبەناو غافڵ دەبوو، گوێی بۆ قسەکەرەکە شل دەکرد کە لەگەڵیدا لە پەیوەندیدا بوو.

وتم: "ئەو برادەرانە داوای گەورەیان نییە، تەنها دەیانەوێت کورد مافی خۆی هەبێت، بە زمانی خۆی قسە بکات و بخوێنێت، وەکو میللەتێک لە دەستووردا بڵێن لەسەر زەوی و لەم وڵاتەدا هەیە".

ئەقڵی خۆم گوشی و لە منداڵییەوە هەرچی فێرببووم و دەمزانی خستمە خزمەتی ئەو قسانەوە کە لەم ژوورەدا دەمکرد.

ئیتر ئەوان کەوتنە پرسیارکردن، دیاربوو بەشێک لە پرسیارەکان پرسیاری سەرۆک کۆمارو سەرۆک وەزیران

بوون، کە ڕاستەوخۆ گفتوگۆکەیان دەبینی.

ئـەم دانیشتنە سێ سەعات و نیوی خایاند، جارێک پشوویەکمان دا، بۆ ئاو و قاوەخواردنەوە، بەڵام پشووەکەش هەر بە ڤیدیۆو کامیرا تۆمار دەکرا.

لە پشووەکەدا ئیمرە تەنەر وتی: "من خزمەتم تەواو بووەو خانەنشین دەبم، بەڵام سەرۆک کۆمارو سەرۆک وەزیران خانەنشینییەکەمیان بۆ شەش مانگ دواخستووە، بۆئـەوەی لێکۆڵینەوەیەک ئامادە بکەم لەسەر چۆنێتی چارەسەرکردنی کێشەی پەکەکەو کورد لە تورکیا، وتی: "من بۆ ئەمە مەسعود بارزانیم بینیوە، جەلال تاڵەبانیم بینیوە، لەگەڵ زوربـەی سیاسییەکانی باشووردا قسەم کـردووە، لەگەڵ کەسایەتیی سیاسی باکووریشدا قسەم کـردووە، ڕاوبۆچوونی هەموان کۆ دەکەمەوە بۆئەوەی میکانیزمێکی گونجاو بدۆزینەوە بۆ چارەسەری ئاشتییانەی کێشەی کـورد". وتـم: "ئـەم کـارەی تۆ دەیکەیت، شتێکی پـیرۆزە، شتێکی مێژووییە بـۆ کـوردو بۆ تورکیش و شایەنی ئەوەی خەلاتی نۆبلی ئاشتیت پێبدرێت و دەبیت بە قارەمانی ئاشتی و کۆتاییهێنان بە شەڕو ئاژاوە، وتم ئەمە کارێکی مرۆڤدۆستانەشە، شەڕ چ سودێکی هەیە، ئەو ملیار دۆلارانەی لە شەڕدا خەرجی دەکەن، لە ئاوەدانیدا خەرجی

بکەن، وڵاتەکەتان دەبێت بە بەهەشت".

کابرا بە ڕوخسارییەوە دیاربوو کە ئەم قسانەی منی پێخۆشە، دوای پشوودان و قاوەخواردنەوە، درێژەمان بە گفتوگۆکە دا.

پرسیاریان لەوە کرد، کە ئایا بەڕاستی پەکەکە ئامادەیە بە ئاشتی ئەم کێشەیە لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا چارەسەر بکات، یان ئەمە هەنگاوێکی تەکتیکییە، چونکە زانیارییان زۆر بوو، گومانیان لەوە هەبوو کە پەکەکە سەر بە ئێرانەو ناتوانێت لە ئەجندای ئێران دەرباز بێت.

منیش بەپێی توانای خۆم وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دەدایەوە.

لە درێژەی دانیشتنەکەداو ئەوەی تورکیا دەیویست و دواتریش بۆ برادەرانی قەندیلم گواستەوە، کورت و پووخت ئەمە بوو.

(پەکەکە چەک دابنێت و بە چەند قۆناغێک لە سنووری تورکیا بچێتە دەرەوە، لە بەرامبەریشدا پەرلەمان یاسای لێبووردن دەربکات و بێنەوە ناو تورکیا، پەیوەندی بە هەدەپەوە بکەن و کاری سیاسی بکەن، لە پەرلەمان ململانێی خۆیان لە چوارچێوەی دەستووردا بەڕێوەببەن.

دەیانەوێت بەشداری دەسەڵات بن بەپێی پێگەیان لە

هەڵبژاردن و کورسییەکانیان، با بەشداربن، دەشیانەوێت بەشداریش نەبن، دەتوانن ئۆپۆزسیۆن بن.

شەست کەس هەن لە پەکەکە لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە لە لیستی ڕەشدان و لێبووردن نایانگرێتەوە، ئەوانە دەتوانن، یان لە هەرێمی کوردستان دابنیشن، بۆ ئەمە ئێمە خۆمان لەگەڵ بارزانی و تاڵەبانی ڕێک دەکەوین، ئەگەر ئەوەش ناکەن، با بچنە هەندەران. تورکیا خەرجی سەفەرکردنیشیان دابین دەکات، لە ماوەی پێنج ساڵیشدا تورکیا دەستە دەستە بڕیاری لێبووردن بۆ ئەو شەست کەسەش دەر دەکات. ئەو پێنج ساڵەش بۆ ئەوەیە کە بتوانرێت لەو ماوەیەدا هەستەوەرییەکی میللی وەها دروست بکەین کە زەمینە بۆ لێبووردنی ئەوکەسانە خۆش بکات.

وتم: "ئەمانە هەمووی شتی باشن، بەڵام پێویستە متمانە دروست بێت، چونکە بە یاسا لێبووردنی گشتی دەردەکرێت، بەڵام لە تورکیا (بکەری نادیار) هەیە، ئایا ئەوانەی بەر لێبووردنی گشتی دەکەون، ناکەونە بەر لێشاوی تیرۆرکردن؟".

ئیمرە تەنەر بە پێکەنینەوە وتی: "دەوڵەت شتی وا ناکات کاری بکەری نادیار، لایەنی تر دەیکات کەسێک شتی وا بکات ئێمە بەپێی یاسا سزای دەدەین". دیاربوو قسەکەمی

پێ ناخۆش بوو.

سەبارەت بە لێبووردنی گشتی وتم: "پەکەکە داوا دەکات کە دەبێت عەبدوڵلا ئۆچالانیش بگرێتەوە، جگەلەوەش لە دەستووری تورکیادا ئەوە جێگیر بکرێت کە کورد میللەتێکەو مافی هەیەو هاوڵاتی کوردیش هەمان مافی هاوڵاتی تورکی هەیە، وەکو چۆن لە دەستووری ئێراقدا هەیە".

وتم: "بۆ زامنی هەر گفتوگۆیەکیش، پەکەکە داوا دەکات نەتەوەیەکگرتووەکان سەرپەرشتی بکات"، بۆ ڕاکێشانی سۆزی ئەوانیش وتم: "یان موئتەمەری ئیسلامی، یان جامعەی عەرەبی".

وتیان: "بۆ لێبووردن لە ئۆچالان، ئەوە پەیوەندی بە عەسکەرەوە هەیە، ئەوان حوکمیان داوە، دەبێت لەناو خۆماندا گفتوگۆ بکەین".

بۆ چەسپاندنی مافی کورد لە دەستووری تورکیاداو سەرپەرشتیکردنی گفتوگۆی کوردو تورکیا لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە، وتیان: "ئێمە دەست دەکەین بە لێکۆڵینەوە، پرس و ڕا دەکەین، ناتوانین ئێستا وەڵام بدەینەوە".

لە کۆتایی دانیشتنەکەدا وتم: "باشە ئەگەر پەکەکە هەموو داواکارییەکانی تورکیای پەسەند کردو ئێوە هیچتان

نەکرد، ئیمرە تەنەر تۆزێک ڕاوەستا، وتی: "ئەوسا منیش دێم پەیوەندیی دەکەم بە قەندیلەوە!" منیش وتم: "ئەهلەن وەسەهلەن، لەوێ خۆم پێشوازیت لێ دەکەم".

کۆبوونەوەکە تەواو بوو، لە دڵی خۆمدا وتم: "من بەتەمابووم بمگرن، کەچی وا ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی دەکەم بە گەریلا!"

٥- پۆزشێك بۆ ئیمرە تەنەر.

من یەک دووجار باسی ئەم دیدارەی ئیمرە تەنەرم کردووە، (فورات نیوس) چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردم و لەسەر زاری من، ئەو قسەیەی ئەو بڵاوبۆتەوە، میدیای تورکیاش هەڵیگرتەوەو بەندوباوی شۆڤێنییانەیان بۆ هۆنیوەتەوە. دوو سێ جار بانگیان کردە پەرلەمانی تورکیا، نەژادپەرست و شۆڤێنییەکان ئەوەی نەشێ، بە ئیمرە تەنەریان کرد، لەسەر ئەوەی بە پێنجوێنی وتووە: "دەچمە قەندیل".

ئەویش جوامێرانە بەرگریی لە خۆی کردو وتی: "ئێستاش لەسەر بۆچوونی خۆم سورم و کێشەی کورد لە تورکیا هەر بە گفتوگۆ چارەسەر دەکرێت".

منیش لایەنگری گفتوگۆو چارەسەری ئاشتییانەم، بۆیە

لێرەدا بە چاکم زانی پۆزشێک بۆ ئیمرە تەنەر بهێنمەوە، ئەگەر لەسەر قسەی من دووچاری تەنگ و تاو بووبێت.

## ٦- هەواڵی خۆش.

گەڕامەوە بۆ سلێمانی و هەواڵی خۆشم پێبوو سەبارەت بە ئاشتی، پەیوەندیم بە سکرتارییەتی مام جەلالەوە کرد، وتیان: "لە هەولێرەو چاوەڕوانی تۆ دەکات".

چووم بۆ هەولێر مام جەلال لە ماڵی کاک کۆسرەت بوو، منیان برد بۆ ئەوێ، دکتۆر خەسرەو گوڵ محەمەدیش لەوێ بوو، بەدرێژیی باسی کۆبوونەوەکەی ئەنقەرەم بۆ گێڕانەوە.

مام جەلال وتی: "جا ئەگەر کارەکە بە داڵدەدانی شەست کەسی پەکەکە لە هەرێمی کوردستان کۆتایی بێت، با شەست نەبن و سەدبن، من خۆم هەموو شتیان بۆ دەکەم".

دکتۆر خەسرەو کە تا ئەوکاتە بەرپرسیاری (دەزگای زانیاری) بوو، زۆر کاروباری برادەرانی پەکەکە لە ڕێگەی ئەوەوە ئەنجامدەدرا، تۆزێک گلەیی و گازندەی کرد، چونکە ئاگاداری چوونی من نەبوو بۆ ئەنقەرە. وتم: "برا ئەوە مام جەلال خۆی، دەتوانیت لێی بپرسیت، ئاگاداری کردووم کە لای کەس باسی نەکەم".

خەسرەو هەمیشەو لە هەموو هەڵوێستێکدا کوردێکی بێ غەل و غەش بوو، ڕەچاوی بەرژەوەندیی گشتی دەکردو لە غەمی کورددا بوو، بۆیە نەمدەویست دڵی لێم برەنجێت.

دوای ئەوەی پایەمی تورکەکانم گەیاند بە مام جەلال، وتی: "برۆ بۆ قەندیل بزانە ئەوان دەڵێن چی؟" چوومەوە بۆ قەندیل، ئەو کاتە موراد قەرەیڵانم دەستکەوت، هەموو شتم بۆ باسکرد، بەدرێژیی باسی دانیشتنی من و تورکەکانم کرد، ڕای مام جەلالیشم بۆ باسکرد، وتم: "کاکە ئەو پیاوە کە ناوی ئیمرە تەنەرە، وتی ئەگەر پەکەکە هاوکاربن، تورکیا نامەردیی بنوێنێت، دەبم بە گەریلا، دەشییەوێت تۆ ببینێت". موراد وتی: "من خۆم ئیمرە تەنەر دەناسم، خەڵکی دیار بەکرە، ئەقڵێکی گەورەی موخابەراتییە".

٧- نییەتی باشی پەکەکە.

بێگومان پەکەکە مەسەلەی چەک دانانیان ڕەتکردەوە، بەڵام لەگەڵ دیالۆگدا بوون، وتیان: "ئەگەر حکومەتی ئەک پارتی ڕاست بکات، ئێمەش بەڕاستی دەمانەوێت شەڕ بوەستێت و کێشەکان بە ئاشتی چارەسەر بکرێن". یەکلایەنە پەکەکە ئاگربەستی ڕاگەیاند.

لەو ماوەیەدا پەکەکە بۆ تاقیکردنەوەی نییەتی حکومەتی تورکیا، پێنج گەریلای بە چەکەوە ناردەوە تا خۆیان ڕادەستی حکومەت بکەن، چەند کەسێکیشی لە ئۆروپاوە بەهەمان شێوە ناردەوە تورکیا. ئەو پێنج گەریلایە کە لە (برایم خەلیل) و (سلۆپی)و بە ئاگاداری تورکیا چوونەوە (سلۆپی)، بە سەدان هەزار کەس پێشوازییان لێکردن و ئەوە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو. جاری دووەم کە چوومەوە بۆ تورکیا، ئەوکورەی کە وەرگێڕ بوو لەگەڵمدا وتی: "وتوویانە ئەوە دوو سێ گەریلا هاتوونەتەوە خەڵک ئاوها پێشوازییان دەکەن، جا ئەگەر جەمیل بایک و موراد قەرەیلان بێنەوە، چییان بۆ دەکەن؟"

٨- سەردانی دووەمم بۆ ئەنکەرە.

من بۆ گەیاندنی پەیامەکان و سەرخستنی هەوڵی ئاشتی لەنێوان مام جەلال و قەندیلدا لە هاتوچووندا بووم. ئاگادارکرامەوە کە تورکەکان داوایان کردووە جارێکی تر سەردانی ئەنقەرە بکەمەوە.

مام جەلال ئەمجارەش خۆی ڕێنمایی کردم و ئاگاداریشی کردمەوە کە دەبێت سەردانەکە بە نهێنی بێت، بەڵام من ئەمجارە دکتۆر خەسرەوم ئاگادارکردەوە، بۆئەوەی گلەییم لێ نەکات.

بێگومان دەبوو جارێکی تر بچمەوە بۆ قەندیل، بۆئەوەی ئاگاداریان بکەمەوە.

ئەمجارە موراد قەرەیڵان و سۆزان ئاڤێستام بینی، وتم: "تورکەکان داوایان کردووە سەردانێکی تریان بکەم، ئێوە چی دەڵێن و چییان پێ بڵێم؟" من پێش نیازم کرد نامەیەک بنووسن، وتیان: "نامە نانووسین، سەرنج و بۆچوونەکانی ئێمە لای خۆت تۆمار بکەو بەوانی بڵێ". منیش هەر وام کرد.

هەمووشت لە ڕێگەی برادەرانی سکرتارییەتی مام جەلالەوە ڕێکخرا، لە سلێمانییەوە فڕیم بۆ ئەستەمبوڵ، لەوێ وەرگێڕەکەی ئاشنام لە چاوەڕوانیمدا بوو، پێکەوە سواری فڕۆکە بووین بۆ ئەنقەرە.

بردیانمە ئوتێلێک نزیک کۆشکی (جان کایا)، بەیانی هاتن بە شوێنمدا، چووینەوە بۆ هەمان شوێنی جاری پێشوو (ساین موستەشار ئیمرە تەنەر) پێشوازیی لێکردم و ئەمجارە کەسێکی تری لابوو، بە ئەحمەد ناوێک پێی ناساندم، نازانم تا چەند کابرا ئەحمەد بوو، مەحمود نەبوو.

کەوتینە گفتوگۆ، منیش بە درێژیی ئەوەی پێیان وتبووم، بۆم باسکردن، ئەوانیش بە پەرۆشەوە گوێیان لێ دەگرتم و وتم: "برادەرانی پەکەکە لەم قۆناغەدا چەک دانانێن، چونکە

پێیان وایە هیچ گرەنتییەکیان نییە دەوڵەتی تورکیا بەڵێنەکانی جێبەجێ بکات، بەڵام شەڕ ڕادەگرن و بۆ نییەتپاکیش، ئەوە چەند گەرلایەکیان ناردۆتەوە، لە ڕێکخستنەکانی ئۆروپاش خەڵکیان ناردۆتەوە تورکیا، دەشڵێن ئەوە ئێمە هەنگاوێکمان ناوەو با حکومەتیش نییەتپاکی خۆی بنوێنێت، لەو هەموو زیندانییەی ئێمە، کە تیایاندایە کە مئەندامەو تەنانەت نزیکەی پێنجسەدیان هەر ژنن، با لەوانە چەند کەسێک ئازاد بکەن.

سەبارەت بە گفتوگۆش وتم: "بە موراد قەرەیلانم وتووە، ئیمرە تەنەر ئامادەیە خۆی سەردانی قەندیل بکات، لە وەلامدا وتی پێویست ناکات ئەرک بکێشێت، ئەوە عەبدوڵڵا ئۆچالانیان لەبن دەستدایە، قسە لەگەڵ ئەو بکەن، بڕیاری چی داو چی وت، ئێمە لێرە لە قەندیل جێبەجێی دەکەین".

لە وەلامدا ئەوان بۆ ئازادکردنی زیندانییانی پەکەکە وتیان: "ئەوە دەبێت پەرلەمان یاسای بۆ دەربکات و بچێتە ئەنجومەنی وەزیران، ئێرە دەوڵەتی قانوونەو ئەوکاتە سەرۆک دەتوانێت بڕیار دەربکات".

سەبارەت بە گفتوگۆکردنیش لەگەڵ ئۆچالان وتیان: "ئەو عەسکەر گرتوویەتی و حوکمی داوە، تائێستاش عەسکەر باڵادەستە لە تورکیادا، ئەگەر ئەمە بکەین، دوور نییە کودەتا بکەن".

کۆبوونەوەکە سەعات و نیوێکی خایاند، پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، وەرگێڕەکە چەند ژمارەیەکی تەلەفۆنی دامێ، کە بۆ هەرشتێک پێویست بێت لەگەڵ ئەودا قسە بکەم.

دوای کۆبوونەوەکە، ئیمرە تەنەر لەگەڵ وەرگێڕەکەدا بردمییە ژوورێکی بچووکەوە، کە بەسەر باخچەیەکدا دەیڕوانی، وتی: "ئوستاز من داوایەکم هەیە، تۆ کە هاموشۆی ئۆروپا دەکەیت، ئەگەر جارجارە سەردانی ئێمە بکەیت سوپاسگوزار دەبین، لێرە لە تورکیا پاسپۆرتی سورت دەدەینێ، شوقەت دەدەینێ، پێویستی ماددیی چیت بوێت، بۆت دابین دەکەین". وتم: "من کە هاتووم بۆ ئێرە بە ئاگاداری قەندیل و تاڵەبانی هاتووم، هەرکات ئەوان پێم بڵێن و پێویست بکات، سەردانتان دەکەم".

لەڕاستیدا ئیمرە تەنەر زۆر بەئەدەبەوە داوای شتێکی لێکردم و منیش ڕەتم کردەوە، کە گەڕامەوەو ئەمەم بۆ مام جەلال باسکرد، هەستاو باوەشی پیاکردم و وتی: "ئاخر من تۆ دەناسم، بۆیە ئەم کارە قورسەم بە تۆ سپاردووە".

هاتمەوە بۆ سلێمانی، مام جەلال لە بەغدا بوو، پێش سەفەرەکە ئاگاداری کردم کە گەڕامەوە ئەگەر لە سلێمانی نەبوو، یەکسەر بچم بۆ بەغدا. چووم بۆ ئەوێ بۆ لای

و بەدرێژیی باسی کۆبوونەوەکەم بۆ گێڕایەوەو وتی: "بچۆرەوە بۆ قەندیل و پێیان بڵێ و هانیان بدە، تا دەتوانن نەرمیی بنوێنن، چونکە ئەردۆگان بەڕاستییەتی و دەیەوێت کورد بە لای خۆیدا ڕابکێشێت".

چوومەوە لای برادەرانی قەندیل، ئەوان هەر بەگومان بوون و دەیانوت: "حکومەت دەیەوێت هەڵمان بخەڵەتێنێت، بۆیە گفتوگۆش لەگەڵ عەبدوڵڵا ئۆچالان ناکات، دەیەوێت ڕاستەوخۆ لەگەڵ قەندیل گفتوگۆ بکات، دەیەوێت کەلێن بخاتە نێوان ئێمەو سەرۆکەوە".

## ٩- ساردیی لە پرۆسەی ئاشتیدا.

بەم جۆرە ماوەیەک پەیوەندییەکان بەردەوام بوون، من لەنێوان مام جەلال و قەندیلدا هاتوچۆم دەکرد، بەڵام ئەوەی باش بوو، شەڕ وەستابوو، هێندێکجاریش کە فرۆکەی تورکی دەهات، برادەران ئاگاداریان دەکردم و منیش لە ڕێگەی وەرگێڕەکەوە پەیوەندیم دەکرد.

ماوەیەک هەموو شت وەستاو ساردییەک لە پرۆسەی ئاشتیدا ڕوویدا، مام جەلال بانگی کردم بۆ بەغدا، وتی: "من لەگەڵ ئەردۆگاندا تێکمداوە، چونکە سەبارەت بە ئاشتی چەند بەڵێنێکی پێداوم و ڕاستی نەکردووە، بەڵام من پێشنیارێکت بۆ

دەکەم، برۆ لەگەڵ (نێچیرڤان بارزانی) قسە بکە، ئەو ئاگاداری هەموو شتەو پەیوەندیشی لەگەڵ ئەردۆگان لە من باشترە".

چووم بۆ لای کاک نێچیر، وتی: "من ئاگاداری هەموو جموجوڵەکانم، دەشزانم تۆ لەنێواندا بوویت، مام جەلال وردەکاریی پێ وتووم و تورکەکان داوایان کردووە کاک مەسعودیش هیمەت بکات، بەس ئەو خۆی پێی وتوون بۆ ئەم مەسەلەیە، پێم باشە هەمووی مام جەلال بیکات، بەڵام مادام ئێستا شتەکە ساردیی تێکەوتووە، ئەم پێشنیارەی مام جەلالم لاپەسەندەو بۆ ئەو مەبەستە سەردانی تورکیا دەکەم".

بۆ مێژوو دەیڵێم: "پاش سەردانی کاک نێچیرڤان بارزانی بۆ لای ئەردۆگان، دەروازەیەکی نوێ لە پرۆسەی ئاشتی کرایەوەو تەنانەت زەمینەش ڕەخسا بۆئەوەی پەرلەمانتارانی هەدەپە ڕێگایان پێبدرێت بچنەی ئیمراڵی و سەردانی عەبدوڵلا ئۆچالان بکەن، کە ئەمە لەوەوبەر کاری نەکردە بوو".

١٠- بۆچوونی ئۆچالان لەبارەی ئاشتییەوە.

هەوڵەکانی نێچرڤان بارزانی بەری هەبوو، چەند جار حکومەتی ئەکەپە سەردانی ئۆچالانیان کردبوو، لەبارەی ئاشتییەوە قسەیان لەگەڵ کردبوو، ئیتر ئەوەبوو ڕێگاشیان

کردەوە بۆئەوەی هەدەپە سەردانی بکەن.

یەکەمجار (ئەحمەد تورک و ئالتان تان) سەردانی ئۆچالانیان کرد، دواتریش لەگەڵ ئەحمەد تورکدا (پەروین بۆڵتان و ئیدریس بالۆکیان)و کەسانی تریش سەردانیان کرد.

گفتوگۆی هەدەپەو دیداریان لەگەڵ ئۆچالان، پرۆسەی ئاشتی خستە قۆناغێکی گرنگەوە، بەتایبەت کە ئۆچالان لایەنگری ئاشتی دەکرد، شاندەکانی هەدەپەش کاریگەریی گرنگیان هەبوو، بۆ بەرەوپێشەوە بردنی پرۆسەکە.

ئەوان هاتن بۆ کوردستانیش، هەرچەند دەهاتن لە رێگەی منەوە مام جەلال و یەکێتییان دەبینی و سەردانی قەندیلیشم بۆ رێکدەخستن.

پاش ئەوەی ئۆچالانیان دیبوو، هاتن بۆ کوردستان، مام جەلالیان بینی و چوون بۆ قەندیل و برادەرانیشیان بینیبوو. کە هاتن بۆ ماڵی ئێمە، پەروین و ئیدریس وتیان: "عەبدوڵڵا ئۆچالان وتوویەتی سڵاوم بگەیەنن بە پێنجوێنی"و زانیبووشی کە نەشتەرگەریی دڵم کردووە، وتیان: "زۆر لە تەندروستی پرسیویت"، جا لەو ماوەیەدا کە نەشتەرگەرییەکەم کردبوو، میدیای تورکیا بڵاویان کردبووەوە، کە پێنجوێنی هاورێی نزیکی ئۆچالان بەهۆی

نەشتەرگەریی دڵەوە ژیانی لەمەترسیدایەو ڕەنگە بمریت.
باش بوو ئەمجارەشیان نەمردم!

پەروین و ئیدریس دووجار هاتن بۆ ماڵەوە، جاری تریش لە دەرەوە دەمبینین، وتیان: سەرۆک دوو پێشنیاری بۆ تۆ هەبووە.

یەکەم: ببیتە نوێنەری ئاپۆ لە ئێراق، وتم: "ئەمەم پەسەندە، بەڵام با بە دەستوخەتی خۆی و بە تورکیش بێت، نووسراوێکم بۆ بێنن.

دووەم: وتیان: "دەوڵەتی تورکیاو ئۆچالان ڕێکەوتوون لە تورکیا لیژنەیەک لە ئاقڵمەندان پێکبهێنرێت، بۆ چارەسەری کێشەی کورد، ئەوان بڕیاری چییان دا، پەکەکەو حکومەت پابەند دەبن پێوەی، خەڵکی گرنگی تێدا بوو، لە هەموو ناوچەکانی تورکیا، کە ژمارەیان حەفتا کەسێکە، ئۆچالان پێشنیاری ناوی تۆی کردووە یەکێک بیت لەو حەفتا کەسە"، بەمەش قایل بووم.

جەمیل بایک بانگی کردم بۆ قەندیل، بۆ نوێنەرایەتی ئۆچالان لە ئێراق پێی خۆش بوو، بەڵام بۆ ئەندامێتی لیژنەی ئاقڵمەندان، دیاربوو وەکو پەکەکە پێیان خۆش نەبوو بەو بیانووەی وتیان: "تۆ کوردی ئێراقیت".

ئەو شاندە باسی ئەوەیان کرد کە ئۆچالان زۆر لایەنگری

ئاشتییە، ئەمە بە دەرفەتێکی مێژوویی دەزانێت بۆ گەلی کورد لە تورکیادا، چونکە لە هیچ سەردەمێکدا تورکیا قایل نەبووە، تەنانەت دان بە بوونی کوردیشدا بنێت، بۆیە ڕێنمایی بۆ قەندیل ئەوەیە، کە کارێک نەکەن گفتوگۆکە تێک بچێت، تەنانەت ئەو پێشی باش ببوو کە بیر لە دانانی چەک بکەنەوەو لە سنووری تورکیاش بچنە دەرەوە، بەو شێوەیەی خۆیان بە چاکی دەزانن، ئەو داواکارییانەش جێبەجێ بکەن کە تورکیا داوای کردووە. ڕێنمایشی بۆ پەکەکە ئەوە بوو کە کارێکی وەها نەکەن، بیانوو بدەنە دەست تورکیا کە لە گفتوگۆکردن پەشیمان ببێتەوە.

وتیان: هەموو ئەم بۆچوونانەی ئوجالانمان بە مام جەلال وتووە، ئەویش زۆر لایەنگری ڕاکانی ئاپۆیەو بە ئێمەشی وتووە: "بە برادەرانی پەکەکە بڵێن، من چاک ئەردۆگان و سەرانی ئەکەپە دەناسم و دەزانم چۆن بیردەکەنەوە، بۆیە تکایە کارێک نەکەن بیکەنە بیانووی تێکچوونی پرۆسەی ئاشتی".

١١- سوودەکانی پرۆسەی ئاشتی.

ئەوەتەی دەوڵەتی تورکیا دامەزرابوو، ئەمە یەکەمینجارە حکومەتێک دان بە بوونی کێشەی کوردیدا بنێت و ئامادە بێت گفتوگۆ لەگەڵ هێزێکی کوردیدا بکات.

لە سایەی پرۆسەی ئاشتیدا بۆ یەکەمجار زمانی کوردی

لە یەخسیریی ئازاد بوو، تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە بە کوردی دانران و حزبێکی کوردی وەک هەدەپە، توانی لە پەرلەمانی تورکیادا نزیکەی هەشتا کورسی بهێنێت و دۆزی کورد بباتە ناو پەرلەمانی تورکیاوە.

لەم ماوەیەدا ڕێکخستنەکانی پەکەکە زیادیان کردو توانییان لەناو تورکیاشدا پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هێزە چەپەکاندا پتەو بکەن و هەستی نەتەوایەتیی کوردیش لە تورکیادا گەیشتە ترۆپک.

لە هیچ سەردەمێکدا وەک ئەم قۆناغە هاوڵاتی کورد تەقلی چالاکی سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردی نەبووە. لەناو ڕای گشتیی تورکیاشدا کێشەی کورد، ناووناوبانگی پەیدا کردو لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش دەنگدانەوەیەکی گەورەو هاوسۆزی بۆ پەیدا بوو، کار گەیشتە ئەوەی لەسەر پەکەکە دەوترا کە تیرۆریستە، بەیەکجاریی بڕەوێتەوە، حزب و هێزو کەسایەتیی ئەمریکایی و ئۆروپایش هەوڵیان بۆ ئەوە دەدا کە پەکەکە لە لیستی تیرۆر دەربکەن.

تەنانە تیمێک لە پارێزەرانی "ماندێلا" سەردانی ئۆچالانیان کردو هاتن بۆ کوردستان، من ناردمن بۆ قەندیل و لە هەوڵی ئەوەدا بوون لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کار بۆ ئازادکردنی ئۆچالان بکەن.

بێگومان پرۆسەی ئاشتی بۆ حکومەتی ئەکەپەو تورکیاش سودی هەبوو، لەلایەک ئەو خەرجییە زەبەلاحەی بۆ گەڕایەوە، کە لە جەنگی دژ بە پەکەکە خەرجی دەکرد، ئەردۆگان خۆی و حزبەکەی پێ بەهێز کرد، لەلایەکی تریش ناوبانگی حکومەتی ئەکەپە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی سودی زۆری لێبینی و ئەگەر پرۆسەکە سەری بگرتایە، دوور نەبوو دەرگای چوونە ناو یەکێتیی ئۆرووپا بۆ تورکیا ئاوەڵا بکات.

ئەم قۆناغە بۆ کوردی تورکیا دروست لەو قۆناغە دەچوو، کە لە ساڵی (١٩٧٠)دا کوردی باشوورو حکومەتی ئێراقی گەیشتنە ڕێککەوتنی یانزەی ئازار.

بێگومان کوردی هەر چوارپارچەکە پشتیوانی پەکەکەو هەدەپەیان دەکرد، بۆئەوەی لەسەر پرۆسەی ئاشتی بەردەوام بێت، کە هەدەپە بە هەشتا کورسییەوە چووە پەرلەمانەوە، هەموو حزب و کەسایەتییە سیاسی و ڕۆشنبیرەکانی باشوور داوایان لێدەکردن بچنە حکومەتەوەو بەشداریی دەسەڵات بکەن، بەڵام بەداخەوە برادەرانی قەندیل قەدری ئەم دەرفەتە مێژووییەیان نەزانی.

لەو ماوەیەدا چەندم پێکرا، چ بە بینین و چ لەڕێی میدیاوە، دەمویست ئەو پەیامە بگەیەنم کە بە هێندنەگرتنی

ئەم دەرفەتە، بە زیانی گەورە بۆ کێشەی کوردی باکوور دەگەڕێتەوە، بەڵام بەداخەوە ڕەنجەکەم بەوەی فەرهاد چوو.

١٢- ئاسۆیەکی نادیار.

بەهۆی بووژانەوەی دۆزی کورد لە تورکیاو ئازادی لە چالاکی سیاسی و فەرهەنگی و میدیای کوردییەوە، نەژادپەرست و شۆڤێنییەکان، لەگەڵ پارتی وەک مەهەپەو عەسکەردا، کەوتنە بەرەیەکەوە دژ بە ئەکەپەو دەیانوت ئەگەر وا بڕوات ئەکەپە بەم سیاسەتە نەرمەی بەرامبەر کورد، وا دەکات کورد لە تورکیا جیابێتەوەو دەوڵەت دروست بکات.

هەندێک سیاسەتی هەڵەی پەکەکەو بێگومان سیاسەتی هەڵەی ئەکپارتیش وایان کرد، پرۆسەی ئاشتی سارد ببێتەوە. ئەمجارە ئەکەپە بۆ بەرژەوەندیی خۆی و بەهێزکردن و دەستبەسەرداگرتنی دەسەڵات لە تورکیادا، کەوتە بەرەی شۆڤێنی و نەژادپەرستەکان دژ بە کورد، وای لێهات ئاسۆی کێشەی کورد گرێبدرێت بە چارەنووسی ئەردۆگانەوە، کە بێگومان ڕەنگە چارەنووسی کێشەی کورد لە تورکیا ئاسۆی ناڕوون بێت، بەڵام بێگومان چارەنووسی هەمیشە گەش و ڕوونتر دەبێت لە چارەنووسی دیکتاتۆرێکی وەک ئەردۆگان.

١٣- شەڕی نێوان حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پەکەکە.

بۆ ئەنجامدانی چالاکی، هێزێکی سی چل کەسی (حدکا) دەیانویست ئاودیوی ئێران ببن، بۆ ئەو ناوچە سنوورییانەی نزیکی (ورمێ)، داوایـان لە پەکەکە کردبوو ڕێگایان لێ نەگرن، پەکەکە بەڵێنی دابـوو دەسـت نەهێنێتە ڕێگایان، هێزەکە هاتبووە ناوچەکانی پەکەکەو بە ناوی ئەوەی کە دوو سێ ڕۆژ لەوێ دەبن و پاشان ناوچەکە بەجێدەهێڵن، بەڵام هەفتەیەک زیاتر دەمێننەوە، کە داواشیان لێدەکەن ناوچەکە جێبهێڵن، ڕەتی دەکەنەوە. دە ڕۆژ زیاتر بەسەر مانەوەیاندا تێپەڕ دەبێت، دەگاتە دوو هەفتە، ئاگاداریان دەکەنەوە هەر ناڕۆن، بۆیە بەناچاریی تەقەیان بەسەردا دەکەن. ئەوانیش وەڵام دەدنەوەو گەریلایەک شەهید دەکەن، پەکەکەش دەست لەوان دەکەنەوە، سێ پێشمەرگەی (حدکا) شەهید دەکەن.

بە گەیشتنی ئەم هەواڵانە، کەوتمە پەیوەندیکردن بە هەموو لایەنەکانەوە، لە تەلەفزیۆنیشەوە پەیامێکم بڵاو کردەوە بۆ ڕاگرتنی شەڕ، توانرا شەڕەکە لەوێدا ڕابگیرێت.

بۆ گفتوگۆ لیژنەیەک پێکهێنرا، من و هەڤاڵ (دەمهات)، کە پاشان لە ئەزمڕ فڕۆکەی درون شەهیدی کرد، لە حدکاش لە (محەمەد نەزیف و حەسەن شەریفی) بە ئامادەبوونی

(کەریم سنجاری) لە پارتی و (عەدنانی حەمەی مینە) لە یەکێتی. لە هەولێر چەند جارێک کۆبووینەوە، لە بارەگای (حدکا) لە کۆیە گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

یەکەم: هەرچوار قوربانییەکەی ئەو ڕووداوە بە شەهیدی ڕێگای ڕزگاریی کوردستان لەقەڵەم بدرێن.

دووەم: هێزەکانی حدکا بە دووریی بیست کیلۆمەتر لە شوێن و مۆڵگەکانی پەکەکە دووربکەونەوە.

سێیەم: لیژنەیەکی تەنسیق لەنێوان هەردوولادا پێکبهێنرێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو خاڵەی سەرەوەو ئاگاداربوون لە هەر پێشهات و ڕووداوێکی نەخوازراو.

## ١٤- شەڕی نێوان حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران و پەکەکە.

تا دەهات چالاکییەکانی (پارتی ژیانەوەی کوردستان) پژاک، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان زیادیان دەکردو ڕێکخستنەکانی پەرەیان دەسەند، ئەوەی هەموو حزبە کوردستانییەکان بە یەکەوە پێیان نەدەکرا، پژاک بە تەنها دەیکرد.

ئێران پژاکی بەدەستیاوی پەکەکە دەزانی، بۆیە هێزێکی گەورەی سوپای پاسدارانی لەسەر سنوور کۆکردەوەو دەستی کرد بە ئاگربارانکردنی ناوچەکانی پەکەکەو

بەتەواوی تەنگی پێهەڵچنیبوون، بەتایبەت کە هێزێکی بچووکی پژاک لە دیوی ئێران و لە نزیک (سەردەشت) بەسەر لوتکەی چیای (جاسوسان)ەوە بوون، ئێران هەرچی دەکرد ئەو لوتکەیەی بۆ نەدەگیرا، هێزە سەربازییەکەی داخی ئەوەی بە پەکەکە دەرِشت و هەراسانی کردبوون.

من کە ئەمەم زانی و ئاگام لە حاڵی پەکەکە بوو، چووم بۆ لای مام جەلال لە بەغداو هانام بۆ ئەو برد.

مام جەلال وتی: "برِۆ هەڤاڵ (سەبری یۆک)و هەڤاڵ (دەنیزم) بۆ بێنە بۆ بەغدا". دواتر مام جەلال پێی وتم: "بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ (ئەحمەدی نەژاد) سەرۆک کۆماری ئێران کردووە، وتوویەتی ئەم شەرِە دژی پەکەکە، لە بەرژەوەندیی ئێران نییەو ئەویش رِایسپاردووە، وتوویەتی خۆت سەرپشک بە بۆ رِاگرتنی شەرِەکە چی دەکەیت بیکە".

سەبری یۆک و دەنیزم برد بۆ بەغداو بە ئامادەبوونی مام جەلال کۆبوونەیەکمان لەگەڵ شاندێکی باڵای ئێراندا کرد بە سەرپەرشتی (سەردار محەمەدی)، شاندەکەی ئێران پێکهاتبوون لە نوێنەرانی سوپای پاسداران و وەزارەتی ئیتلاعات و نوێنەری مەقامی رِەهبەری، لەم کۆبوونەوەیەدا گەیشتینە لێکترگەیشتنێک سەبارەت بەوەی کە ئێران هێرشەکانی رِابوەستێنێت، پژاکیش چالاکییە سەربازییەکانی

لەناو ئێراندا ڕابگرێت و بڕیاردرا کۆبوونەوەیەکی تریش ئەنجام بدرێت.

کۆبوونەوەی دووەم لە (مەرزی باشماخ) لە دیوی ئێران کرا، من و سەبری بۆک و دەنیز، لەلایەنی ئێرانیشەوە جگە لەو کەسەی کە لە کۆبوونەوەکەی بەغدادا بوو، دوو کەسی تریش هاتبوون، کە دیاربوو نوێنەری قەرارگان.

لەم کۆبوونەوەیەدا گفتوگۆی زۆرکرا، ئاڵوگۆڕی بیروبۆچوون کرا سەبارەت بە چارەسەر، دەرەنجام گەشتینە ڕێککەوتنێک کە بەم شێوەیە بوو:

پژاک لوتکەی جاسوسان چۆڵ بکات و ئێرانیش هێزەکانی لە چواردەوری چیاکە پاشەکشە پێ بکات.

ئێرانییەکان داوای مۆڵەتی دوو ڕۆژیان کرد، وتیان: "چونکە زۆرمان لێکوژراوە لەو ناوە، کاتمان دەوێت بۆئەوەی تەرمەکان بدۆزینەوە"، برادەرانی پەکەکەش وتیان: "ئێمەش دوو تەرممان کەوتۆتە دەست ئێوە، بماندەنەوە".

کۆبوونەوەی سێیەمان لە (سەری ڕەش) بوو، لەلایەن پارتییەوە کەریم سنجاری و کەسێکی تر ئامادە بوون، دکتۆر خەسرەو گوڵ محەمەدیش بە نوێنەرایەتی یەکێتی هاتبوو، لەلایەنی ئێرانیشەوە جگە لە سەردار محەمەدی و سێ کەسی تر هاتبوون، سەبری بۆک و دەنیزیش نوێنەری

پەکەکە بوون و منیش ناوبژیوان بووم.

لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری کۆبوونەوەکانی پێشوو هەڵسەنگێنراو هەردوولا، ئێران- پەکەکە قایل بوون لەو ڕێکارانەی گیراونەتەبەر، ئێرانییەکان وتیان: "ڕاستە پژاک چالاکییەکانی خۆی لەناو ئێران ڕاگرتووە، بەڵام داواکاریی ئێمە ئەوە بووە کە لە سنووری ئێران بچێتە دەرەوە".

پەکەکەش داوایان کرد کە ئێران ڕێگا بدات بچنەوە ئەو ناوچە سنوورییانەی کە پێشتر بەهۆی تۆپباران و بۆردوومانی ئێرانەوە چۆڵیان کردووە، ئێرانیش ڕێگای لۆجستییان لێ نەگرێت و ڕێگا بدات پێویستییەکانیان لە دیوی ئێرانەوە دابین بکەن، کارئاسانیش بکات بۆئەوەی بریندارەکانیان لەناو ئێران چارەسەر بکەن. هەر لەوێدا بڕیاردرا دوای سێ مانگ کۆبوونەوەیەکی تر لەنێوان ئێران و پەکەکەدا بکرێت.

سێ مانگەکە تێپەڕی، پێدەچوو هەردوولا بە خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتنەوە پابەندبن، ئەمجارە کۆبوونەوەکە لە دوای ئەو وادەیە، لە سەربازگەیەک بوو لە دیوی ئێران، لەنێوان سنەو مەریواندا.

لەو کۆبوونەوەیەدا لەلایەن پەکەکەوە جگە لە سەبری یۆک و دەنیز، هەڤاڵ زاگرۆس، کە کوردی ڕۆژهەڵات و

خەڵکی ناوچەی ورمێ بوو، فارسی و تورکی و کوردی وەکو یەک دەزانی، هاتبوو، ئەمەش ئاماژەیەک بوو کە ئیتر پێویستیان بە من نەماوە کاری وەرگێڕانیان بۆ بکەم.

لەلایەنی ئێرانییەوە، ئەوانەی بەشداری کۆبوونەوەکە بوون، پێکهاتبوون لەمانە:

- بەرپرسی دۆسیەی پەکەکە لە ئێران و تورکیا، جگە لە سەردار محەمەدی.
- بەرپرسی دۆسیەی پەکەکە لە سوریاو لوبنان.
- بەرپرسی دۆسیەی پەکەکەو پژاک لە ئێران.
- بەرپرسی دۆسیەی پەکەکە لە ئۆروپا.

هەموو ئەمانەش کە شاندێکی گەورەی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، (سەردار حاجی قاسم سلێمانی) سەرۆکایەتی دەکردن.

سەرەتا ئەوەی قسەی کرد سەردار محەمەدی بوو، کە لە هەموو کۆبوونەوەکانی تردا لەگەڵ شاندی ئێرانی ئامادە دەبوو، وتی: "ئێمە وەکو لایەنی ئێرانی لە ڕەوتی گفتوگۆکانی پێشووترو ڕێکەوتنەکانمان زۆر قایلین، لە کۆبوونەوەی پێشووتریشدا پێمان وتن بۆ ئەم کۆبوونەوەیە دەبێت کەسانێک لەلایەنی ئێوەوە ئامادە بێت، کە بڕیاربەدەست بێت، ئێمە خۆمان لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاری تەواومان

بەدەستە، بۆیە بەفەرمی داوای ئەوەتان لێدەکەین، کە ڕێکەوتنێکی ستراتیجی لەنێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و پەکەکەدا ببەستین".

هەڤاڵ سەبری یۆک بە تیلەی چاو سەیرێکی هەڤاڵەکانی کرد، وەک ئەوەی بە من بڵێت "تۆ قسە بکەم"، منیش وتم: "بۆ ئەمە دەبێت ماوەی پانزە ڕۆژێک مۆڵەتمان بدەن، بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵ سەرووتردا"، هەروەها وتیشم: "دوا بڕیار لای هەڤاڵ سەبری یۆکە"، ئەویش وتی: "من دەڵێم پانزە ڕۆژ زیاتری دەوێت".

لە وەڵامدا ئەوان وتیان: "ئێمە پێمان وتوون کەسی بڕیاربەدەست بهێنن بۆ ئەم کۆبوونەوەیە"، سەبری یۆک وتی: "ئێمە بڕیارمان بەدەستە، بەڵام چاوەڕوانی داوایەکی وەک ئەمە نەبووین، کە لەگەڵ دەوڵەتێکی گەورەدا هاوپەیمانی ستراتیجی ببەستین".

دیاربوو بەشداربوونی قاسم سلێمانی لەو کۆبوونەوەیەدا لەبەر ئەوەبوو، ئەوان پێیان وابووە هەرگیز پەکەکە داوایەکی وا ڕەت ناکاتەوەو هەر لەوێدا ڕێکەوتنی ستراتیجی ئیمزا دەکات.

ئینجا قاسم سلێمانی کەوتە قسە، وتی: "ئەگەر ئەم ڕێکەوتنەمان لەگەڵ بکەن، ئێمە چەکی فڕۆکەشکێن و دژە

تانکیشتان دەدەینێ، تەنانەت هاوکارتان دەبین لەوەی لەناو کوردستانی تورکیادا ڕووبەرێکی فراوان ڕزگار بکەن و لەوێ شەڕی خۆتان بکەن، لە ئاسمان و زەمینەوە ئەو ناوچەیەشتان بۆ دەپارێزین، بەو مەرجەی بەڵگەیەک لەسەر هاوکاریی و پەیوەندییەکانمان نەبێت، لەبەر ڕەچاوکردنی یاسا نێودەوڵەتییەکان".

لەولاوە یەکێکی تر هەڵیدایەو وتی: "کاتی خۆی لە سەردەمی شادا، ئێمە هاوکاریی بارزانیمان کرد، بۆئەوەی مەلا مستەفا ناوچەیەکی بەرفراوانی لەژێر دەستدا بێت و لەوێوە شەڕی ئێراق بکات"، دوایی زانیم ئەم کابرایە کە لە هەموان بەتەمەنتر بوو، لە سەردەمی شاوە لەناو کاری هەواڵگریدا سەری سپی کردووە. کۆبوونەوەکە کۆتاییهات، بڕیاردرا پاش پانزە ڕۆژێک پەکەکە وەڵامی ئێران بداتەوە.

گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، لە ماڵی خۆمان لەگەڵ سەبری یۆک دەنیزو زاگرۆس نانێکمان خواردو تاوتوێی ئەو داوایەی ئێرانییەکانمان کردو گەیشتینە ئەوەی کە ئەم ڕێکەوتنە نە لە بەرژەوەندیی کوردو نە لە بەرژەوەندیی پەکەکەشدایە، چونکە ئێران بەخۆڕایی پشتگیریی پەکەکە ناکات، بێ بەرامبەر ڕێکەوتنی ستراتیجی ناکات و دەبێت پەکەکە ببێتە بەشێک لە سیاسەت و ئەجندای ئێران، ئەوسا

چی داوا لێبکرێت ناچارە بیکات، ئەمەش واتە بڕیاری پەکەکە بەدەست ئێران دەبێت.

وتیان: "دەبێت بەیانی لەگەڵمان بێیت بۆ قەندیل"، لەڕاستیدا تەندروستیم باش نەبوو، ئەو داوایەی ئێرانییەکانیش سەرو دڵی گرتبووم، بۆیە داوای لێبووردنم کرد.

ئەوان بۆ ڕاوێژ چوونەوە بۆ قەندیل، پێش پانزە ڕۆژەکە هاتنەوە، وتم: "بڕیاری چیتان داوە". وتیان: "ئەو کارە ناکەین و ئەوە خیانەتە، سبەینێ پێمان دەڵێن بچن بە گژ دیموکرات و کۆمەڵەو پژاکدا".

وتیان: "دەبێت لەگەڵمان بێیت دەچینەوە بۆ ئێران". من و هەرسێکیان چووینەوە بۆ ئێران، لە سەربازگەیەکی تر لە نزیک مەریوان کۆبووینەوە، ئەمجارە ئاغای سەردار محەمەدی و سێ کەسی تر بوون، کە گوێیان لە ڕاکەی هەڤاڵانی پەکەکە بوو، قایل نین لەگەڵ ئێران ڕێکەوتنی ستراتیجی بکەن، تووشی شۆک بوون، واقیان ورماو چاوەڕوانی ئەو وەڵامە نەبوون!

سەبری یۆک وتی: "ئێمە بە ناوەڕۆکی هەموو ڕێکەوتنەکەی پێشووەوە پابەند دەبین، بەڵام ناتوانین ڕێکەوتنی ستراتیجی بکەین، ڕێکەوتنی وەها لەنێوان دوو حکومەت و دوو دەوڵەتدا دەکرێت، ئێمە هێزێکی پارتیزانین

بەو شاخانەو ناتوانین ڕێکەوتن بکەین، بەیانی گرووپێکمان لێ یاخی دەبێت و دەڵێت بەو ڕێکەوتنەوە پابەند نابین، یان گرووپێکمان لێ جیا دەبێتەوە دەچێتەوە تورکیا، یان دەچێتە هەرێمی کوردستان، بۆیە ئێمە ناتوانین پابەندبین بە ڕێکەوتنێکی واوە".

هاتینەوە سلێمانی، وتم: "ئێتر ئەوە هەڤاڵ زاگرۆستان لەگەڵەو پێویستتان بە من نییە وەرگێڕانتان بۆ بکەم، بۆ کاروباری لای مام جەلال کەی ویستتان ئاگادارم بکەن، یان ڕاوێژێکتان هەبوو ئامادەم، بەڵام بۆ کاروباری ئێران، بوونی من پێویست نییە"، ئەوان زۆر پێداگرییان کرد، بەڵام لەوکاتەوە من دەستبەرداری پەیوەندیی ئێران بووم و ئاگام لێی نییە.

لەم کۆبوونەوانەدا هێندێک شت ڕوویان دا، کە ڕەنگە شایانی ئەوە بن بۆ مێژوو تۆماریان بکەم و وەڵامیش بن بۆ زۆر زانیاری پێچەوانە، دەتوانم تا ئێرەش کە من ئاگادارم، شایەتی بۆ پەکەکە بدەم کە کوردانە خۆی نواندو ملی کەچ نەکرد، ئەگەرچی ئێرانییەکان بەڵێنی گەورەیان پێدان.

## ١٥- کۆبانێ، نانەوێ.

تا دەهات شەڕ لە کۆبانێ گەرم دەبوو، پەلاماری داعش زیادی دەکردو گەمارۆدانی شارەکە تەسک دەبووەوە، بارودۆخی مرۆیی خراپ و چەک و خواردن و پێویستی دەرمان نەدەما.

هەڤاڵ دەمهات کە وەکو سکرتێرو نهێنگری هەڤاڵ جەمیل بایک وابوو، تەلەفۆنی بۆ کردم، باسی باردۆخی خراپی شەڕڤانانی کۆبانێ و نەبوونی چەکی کرد، وتی: "برادەران دەڵێن چی پێدەکرێت بیکات، بارودۆخ زۆرخراپە".

منیش بە جارێک پەشۆکابووم، هەواڵەکان هەمووی ناخۆش بوون، نەمدەزانی چی بکەم، کەوتمە پەیوەندی، ئەودەمە مام جەلال نەخۆش کەوتبوو، توانای کارکردنی نەبوو، بۆیە زۆربەی کارەکان لای (هێرۆخان) بوو، لە ڕێگای (ئاراسی شێخ جەنگی)یەوە چوومە لای هێرۆخان، هێرۆخان ئاراسی ڕاسپارد هەرچی دەکرێت بیکەن و دریغی نەکەن، ڕۆژێکەو ئەمڕۆ، بکەونە کۆکردنەوەی چەک و تەقەمەنی.

لەو هەولانەدا بووم (هەڵۆی برایم ئەحمەد) لە ئۆرووپاوە تەلەفۆنی کردو وتی: "ئەمریکاییەکان دەیانەوێت کۆبانێ نەکەوێت و یارمەتی شەڕڤانان بدەن، دەمانەوێت ڕێگایەک

بدۆزینەوە بۆئەوەی یارمەتییان پێ بگەیەنین"، منیش قسەم لەگەڵ دەمهاتدا کردو وتی: "برادەران دەڵێن (ساڵح موسلیم) لە ئۆروپایە ژمارەکەی بدە بە هەڵۆی برایم ئەحمەد، بۆئەوەی قسە بکەن و میکانیزمێک بدۆزنەوە بۆ هاوکاریی"، ئیتر من هەڵۆو ساڵح موسلیم-م بەیەکەوە بەستەوە.

دەمهات کەسێکی پێناساندم لە ناوجەرگەی شەڕەکەوە، بۆئەوەی پەیوەندی دروست بکەم، لەوەوبەریش بۆ ئاڵوگۆڕی زانیاریی ئاراسی شێخ جەنگی کەناڵێکی بۆ کردبوومەوە لەگەڵ ژووری ئۆپەراسیۆنی کوردی و ئێراقی و هاوپەیمانان، ئیتر بەردەوام، هەر سەرەسەعاتێک من لەگەڵ ئەوان و ڕۆژئاواو دەمهاتدا زانیاریم ئاڵوگۆڕ دەکرد.

هەڵۆ تەلەفۆنی کردەوە، وتی "پەیوەندیت لەگەڵ دەکەن ئاگات لە تەلەفۆنەکەت بێت"، پاش سەعاتێک پیاوێک تەلەفۆنی کردو بە ئینگلیزی قسەی دەکرد، پێم وت: "ئەگەر عەرەبیزانێک قسەم لەگەڵ بکات باشترە". سەعاتێک زیاتری پێچوو تەلەفۆنێکی ترم بۆ هات، ژنێک بە عەرەبی قسەی کرد، وتی: "من بۆ کارێکی تایبەت هاتوومەتە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، یەکێکم دەوێت ئینگلیزی بزانێت لەناو کۆبانێدا". پەیوەندیم بە ساڵح موسلیمەوە کردو وتم: " پێویستم بە ئینگلیزیزانێکە کە لەناو شەڕەکەدا بێت"، ساڵح موسلیم وتی:

"دەبێت چاوەڕوان بکەیت، چونکە ئینگلیزیزانی لێ نییە، دەبێت یەکێک پەیدا بکەین بەنهێنی بتوانێت بچێتە ئەوێ".

پاش ڕۆژێک تەلەفۆنێکم بۆ هات کە وەڵامم دایەوە، وتی: "من ئەو کەسەم کە لە ناوجەرگەی شەڕەکەی کۆبانێ-وە قسەت لەگەڵ دەکەم و ئینگلیزییەکەشم باشە"، وتم: "ژمارەکەت دەنێرم بۆ ئەو شوێنەی کە خۆیان پەیوەندیت پێوە دەکەن". تەلەفۆنم بۆ ئەو ژنە کردەوە کە بە عەرەبی قسەی لەگەڵ کردم، وتم: "ئەوە ژمارەی ئەو کەسە ئینگلیزیزانەیە کە لە ناوجەرگەی شەڕەکەی کۆبانێ-دایە". جارجار ئەو ژنە بۆ پرسیارکردن تەلەفۆنی بۆ دەکردم.

لە ڕێگای تەلەفۆن و کۆمپیوتەرەوە پەیوەندییەکانم ئەوەندە زۆر بوون، ڕۆژێک لەناکاو هەرچی مۆبایل و کۆمپیوتەرو تەلەفۆنی نۆرمەڵ و ئینتەرنێت هەیە لەکار کەوتن، ماڵی ئێمە پەیوەندی بە دنیای دەرەوە نەما، هەموو ماڵەکانی دەوروبەر پەیوەندییان هەبوو، هیچ کێشەیان نەبوو، چوومە دەرەوە بە تەلەفۆنی تر پەیوەندیم کرد بە ئاراسی شێخ جەنگییەوەو ئاگادارم کرد، پاش ماوەیەک تەلەفۆنی بۆکردمەوە، وتی: "سەعاتێکی تر هەمووشت چاک دەبێتەوە"، وتم: "مەسەلە چییە"؟ وتی: "دوایی پێت دەڵێم". دواتر زانیم کە ئەوەندە لە شوێنی جیاجیاوەو بە

بەردەوامی لە ماڵی ئێمەوە پەیوەندی کراوە، گێژاوێکی ئەلەکترۆنی لەسەر زۆنی ماڵی ئێمە دروست بووەو لایەنی پەیوەندیدار ترسیان لە چالاکییەکی گوماناویی کردووە.

قسەکەی ئاراس ڕاست دەرچوو، پاش سەعاتێک هەموو پەیوەندییەکان چاکبوونەوە تەلەفۆن و کۆمپیوتەر ڕۆحیان بە بەردا هاتەوە.

لەو ماوەیەدا هەوڵەکانی هیرۆخان، کە ئاراس ڕۆڵی گرنگی تێدا هەبوو، بەری هەبوو، توانرا هەشت تەن چەک و تەقەمەنی هەمەجۆر لەلایەن یەکێتییەوە کۆبکرێتەوەو بگەیەنرێتە دەست ژووری ئۆپەراسیۆنە هاوبەشەکان.

ئەمەش بەبێ کێشە نەبوو، چونکە تورکیا زانیاری دەستکەوتبوو، دژی ئەوە بوو هیچ هاوکارییەک بە شەڕڤانان بکات، هاوپەیمانان لەناو خۆیاندا ببوو بە گفتوگۆیان و ڕای جیاوازیان هەبوو، کار بەوە گەیشتبوو یارمەتییەکان بۆ کۆبانێ نەنێردرێن.

بۆ مێژوو دەبێت جارێکی باسی هەڵوێستی جوامێرانەی فەرەنسا بکەم، کە نوێنەرەکەیان پێداگریی کردبوو کە ئەگەر هاوپەیمانان ئەو یارمەتییانە نەنێرن بۆ کۆبانێ، ئەوا فەرەنسا بە فڕۆکەی خۆی هەرچی پێویست بکات دەیگەیەنێت بە شەڕڤانانی کۆبانێ.

من هەموو ئەو نامانە کە ڕۆژانەو سەعات بە سەعات لە کۆبانێ و شەڕڤانانەوە بۆم دەهات، هەر لە ماڵەوە بۆیان دەکردم بە ئینگلیزی و کوردییەکەو ئینگلیزییەکەشم دەنارد بۆ ژووری ئۆپەراسیۆنەکان، ئەو نامانە کە لە گۆڕەپانی جەنگەکەوە دەهاتن، ئەوەند کاریگەر بوون مرۆڤ خۆی بۆ نەدەگیرا.

نوێنەری فەڕەنسا وتبووی: "من ئەو نامانەم ناردووە بۆ سەرۆکی فەڕەنسا لەسەر ئەو کارەساتە مرۆییەو سەرۆکی فەڕەنسا خۆی لەسەر خەتە". ئەم هەوڵەی فەڕەنسا هاوپەیمانانی ناچار کرد کە خۆشیان هەشت تەن چەک و پێداویستی تر ئامادە بکەن، پارتیش بە چوار تەن بەشداری بکەن. هەموو هاوکارییەکان بوون بە بیست تەن و لە ڕێگای پەیوەندی بە شەڕڤانانەوە، لە ئاسمانەوە بەردرانەوەو کەوتنە دەست شەڕڤانان.

یەکێک لەو بارانەی کە لە ئاسمانەوە بەردرانەوە، کەوتە دەست داعش و ئەوانیش زۆر دڵیان پێی خۆشبوو، دوایی دەرکەوت کە ئەوە تەڵەیەک بووەو ئەو چەک و تەقەمەنییانە بە پیلان خراوەتە دەست داعش و (جی پی ئێسی) پێوە بووەو بەهۆی ئەوەشەوە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان توانیویەتی بە ئاسانی بیانکاتە ئامانج.

مۆراڵی شەڕڤانان بەرزبووەوەو تەرازووی جەنگەکە سەنگەلا بوو، پەیوەندییان پێوەکردم، بەدەم گریانەوە لە خۆشیدا نە من، نە ئەوانیش نەماندەزانی چی بکەین، یارمەتییەکان بە ئاسمانەوە بەردەدرانەوە، لە تەلەفزیۆن سەیرم دەکرد، تەلەفۆنم بۆ ئاراسی شێخ جەنگی کرد لە دەرەوەی وڵات بوو، وتی: "ئەوە منیش سەیری دەکەم، دە بڕۆ ئینجا بۆ خۆت تێر تێر بنوو".

بە درێژیی بیستوپێنج شەو من و خێزانەکەم بەدیار کۆمپیوتەرو مۆبایلەکانمانەوە، وەنەوز دەیبردینەوە، شەوێک تێر خەو نەبووین، ئەمشەو بەئارامی نووستین.

دەبێت باسی ئەوە بکەم، کە ئیتر لەو ڕۆژەوە باڵانسی شەڕەکە گۆڕدرا بە لای شەڕڤاناندا، شتێکی تریش کە لەسەر ئاستی هەر چوارپارچەکە کاریگەری هەبوو، چوونی پێشمەرگە بوو بۆ کۆبانێ، ئەگەرچی ئەوە شتێکی ڕەمزییش بووبێت، بەڵام زۆر گرنگ بوو وەک داستانێکی نەتەوەیی دەگێڕدرێتەوە.

کە تورکیا زانی هەموو دنیا لەگەڵ کورددان، ویستی ئەویش خۆی وا دەربخات کە دەیەوێت هاوکار بێت، بۆیە ڕێگای بە هێزی پێشمەرگە دا بە تورکیادا بچن بۆ کۆبانێ.



سەردانێک بۆلای پەیکەری ئازادی، پێنجوێنی و عەلی بەگیت سەرۆکی کۆنگرەی نەتەوەیی لە برۆکسل



میهرەجانی شیعریی دهۆک



دیدارێک لەگەڵ سیناتور جۆکەنەدی برازای جۆن کەنەدی سەبارەت بە دۆزی کورد و پرۆسەی ئاشتی لە باکوری کوردستان



جەنگیز چاندار، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ستۆکهۆڵم



دیدارێک لەگەڵ مەسعود بارزانی بۆ هێورکردنەوەی نێوان پارتی و پەکەکە



لەراستەوە: سەلاح رەشید، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، مام جەلال، کەمال فوئاد، ٢٠٠١ - سلێمانی




پێنجوێن، ماڵی باوکم، لەخزمەت دایکمدا (حەبیبە سەعید)



محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ١٩٧٢



محەمەد ئەمین پێنجوێنی، مام جەلال



دڵشاد مەریوانی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، کەمال میراودەلی، کۆڕێکی ئەدەبی - سلێمانی




ئاهەنگی کردنەوەی میهرەجانی ئەحمەدی خانی لە بەرلین



لەراستەوە: محەمەد ئەمین پێنجوێنی، محەمەدی حاجی مەحمود. فایەق مەنمی، حسێن رەسوڵ - بەرلین



محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ئەیلولی ١٩٦٤



نەورۆزێک لە شەمەندەفەردا



پێشکەشکردنی خەڵات بە مامۆستا عەلی مەردان لە فیستیڤاڵی عەلی مەردان، ١٩٨٠



دیداری ئەدیبانی کورد و عەرەب لە دوکان، هەشتاکان



لەراستەوە: محەمەد ئەمین پێنجوێنی، پرۆفیسۆر حەسەنی حوسامی، د. حەسەن عەلی، برزو، بەرلین، نەخۆشخانەی شاریتێ



کۆڕێکی ئەدەبی زانکۆی سلێمانی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ئازاد عەبدولواحید، محەمەد موکری



یادی ٢٠٠ ساڵەی سلێمانی، یەکەم یادی ٢٠٠ ساڵەی سلێمانی ، هۆڵی سەندیکای کرێکاران



پێشانگای پۆستەری شیعری کوردی، کۆمەڵێ شاعیر و هونەرمەندی کورد لەناویاندا پێنجوێنی و ئەژی گۆران و شێرکۆ بێکەس و هێمن



پێشانگای پۆستەری شیعری کوردی



ئەشکەوتی ئەنیشکی، لەگەڵ نوسەر و روناکبیرانی دهۆک، هەشتاکان



لەراستەوە: ئەحمەد هەردی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، حەسیب قەرەداغی



جەمال شارباژێری و محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ١٩٧٤



کردنەوەی پیشانگای شێوەکاری ( خالید رەسول) سلێمانی



میر تەحسین میری ئێزیدییەکان، مەجید خانی حەمە رەشید خان، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، لەندەن



محەمەد ئەمین پێنجوێنی و نێچیرڤان بەرزانی سەرۆکی هەرێم






یەکەم کۆبونەوەی راوێژکاری بۆ کرنگرەی نەتەوەییە لە راستەوە:
سیروان رەحیم، د. کەمال میراودەلی، د. نەجمەدین کەریم، محەمەد
ئەمین پێنجوێنی، ئیبراهیم ئەحمەد، عەلی قازی محەمەد



هۆڵی دادگای باڵای کۆنگریسی ئەمریکا، پێشکەشکردنی یاداشتێک دەربارەی رەوشی کورد، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، فاروق (کوردی رۆژئاوا)



بەرلین - ئینستیتۆتی کورد
لەراستەوە: د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، پێشرەو سەید ئیبراهیم،د. فیەرهاد ئەمین، نەجیب باڵایی، سەبری ئاگر، بەکر جەسەن



کۆنفرانسی ئاڤێستا - بەرلین




کۆنفرانسی چوارسەد ساڵی تێپەڕبوون بەسەر نووسینی شەرەفنامەدا
- بەرلین



محەمەدی حاجی مەحمود، محەمەد ئەمین پێنجوێنی



لەراستەوە: ئەحمەد باراش قلچ، فەقی حسێن تونج، د. عیسمەت شەریف وانلی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، هۆڵەندا - ماستریخ - ڕێپێوانی بۆن - بروکسل



فەقێ حسێن، عیسمەت شەرریف، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، وێنەکێشێکی کوردستانی باکوور، ڕێپێوانی بۆن - برۆکسل



شێخ تەیب ، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، مەلا ڕەئووف



لوبنان - بیقاع، خوانێک لەگەڵ ئاپۆ
محەمەد ئەمین پێنجوێنی، مومتاز حەیدەری ، ئاپۆ



لەگەڵ ئاپۆدا



سەردانێکک بۆلای بەڕێز ئۆجالان- حەمە کەریم عارف، رەئوف حەسەن، ئۆجالان، محەمەد ئەمین پێنجوێنی



لەگەڵ بەڕێز ئۆجالاندا



محەمەد ئەمین پێنجوێنی و ئۆجالان، ئیتاڵیا - رۆما



برۆکسل، کۆبوونەوەی پەرلەمانی کوردستان، لەراستەوە: نەجدەت بۆڵدان، نەورۆز، فلامەند، عیسمەت شەریف وانلی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ئەحمەد ئاکتاش



ئەندامانی پەرلەمانی دەرەوەی وڵات



ئەندامانی کۆنگرەی نەتەوەیی برۆکسل



لەگەڵ عەزیز محەمەد دا



سەیرانێک لە مێرگەپان



لەگەڵ موکەرەم تاڵەبانی



سەردان بۆلای کۆنسەی یەکێتی ئەورووپا - برۆکسل



لەگەڵ شێخ محەمەد شاکەلی



مەراسیمی خەڵاتکردنی محەمەد ئەمین پێنجوێنی، بەغداد - ٢٠٢١



سەردانێک بۆ قەڵای شێروانە



برۆکسل، بارەگای کۆنگرەی نەتەوەیی
لەراستەوە: زوبیر ئایدار، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، رەمزی قەرتاڵ



یەکەم دیدارمان لە بیقاع لەگەڵ بەڕێز ئۆجەلان، زستانی ١٩٩٢



کۆنفرانسی یەکێتیی ئەوروپا لە ئیتاڵیا، وتارێک دەربارەی کیمیابارانی هەڵەبجە



محەمەد ئەمین پێنجوێنی لەسەر مەزاری دکتۆر قاسملۆ، پاریس



لەگەڵ ئۆجەلان لە بیقاع، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، ئۆجەلان، حەمە کەریم عارف، د. رەئوف عوسمان، رەئوف حەسەن،



محەمەد ئەمین پێنجوێنی و هۆمەر دزەیی و هۆمەر شێخ موس



وتارێک، کۆنگرەی گەل، قەندیل



پێنجوینی و خەڵات عومەر



- محەمەد ئەمین ئەحمەد محەمەد خواموراد لە ساڵی (١٩٤٤) لە شارۆچکەی پێنجوێن لەدایک بووە.

- یەکێک بووە لەو شاندەی کە بۆیەکەمینجار بۆ پرسی گەلی کوردستان چاوی بە (پتروس گالی) سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان کەوتووە.

- یەکێک بووە لەو شاندەی کە بۆ یەکەمینجار بۆ پرسی گەلی کوردستان چاوی بە (پاپا پۆلسی دووەم)ی پاپای ڤاتیکان کەوتووە.

- لەگەڵ ئەم کەسایەتی و سەرۆک دەوڵەتانەدا کۆبۆتەوە (یاسر عەرەفات، ماسیۆ دالیما سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیا، موعەمەر ئەلگەزافی، سەرۆکی ئیتاڵیا، وەزیری دەرەوەو ناوخۆی بەلجیکا، سەرۆکی پەرلەمانی ئۆروپا، ئەندامانی پەرلەمانی ئۆروپا)، جگە لە دەیان سیناتۆرو کۆنگرێسمانی ئەمریکایی و دەیان سیاسەتمەداری جیهان بۆ باسکردنی مافی ڕەوای کوردو کوردستان.

- ئەندامی دامەزرێنەری پەرلەمانی دەرەوەی وڵات و ئەندامی کۆنسەی بەڕێوەبردن بووە، ئەندامی دامەزرێنەری کۆنگرەی نەتەوەیی بووە لە ئۆروپا.

- دەستێکی باڵای هەبووە لە دامەزراندنی کەناڵی سەتەلایتی مەد تیڤی لە ئۆروپا.

- سەرۆکی دووەم ئینستیتیوتی کوردی بووە بۆ لێکۆڵینەوەو زانست لە بەرلین.

- دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (لێکۆڵین) بووە بە لاتینی و کرمانجی و گۆڤاری (کوردستان ئەمڕۆ) بە پیتی عەرەبی.

- ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کوردو ڕۆژنامەنووسانی جیهانە.

- ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کوردو یەکێتی هونەرمەندانی کوردو یەکێتیی مامۆستایان و پزیشکانی کورد لە ئۆروپا.

- ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حزبی شیوعی ئێراق و ئەندامی سەرکردایەتیی قیادەمەرکەزیی بووەو بەرپرسی لقی کوردستانیش بووە.

- پۆستی قایمقامی و بەڕێوەبەری ناحیەو بەڕێوەبەری گشتی هەبووە.

- چەندین دیوانی شیعری هەیەو لە کتێبی (ڕۆح و هەورو بەفردا) کۆی کردوونەتەوە.

- ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی هاوکاری و گۆڤاری کاروان و گۆڤاری نووسەری کورد بووە.

- ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە گرتنی چەندین سیمینارو کۆڕو کۆبوونەوەو کۆنفرانس لە ناوخۆو دەرەوەی وڵات لەسەر کلتوورو فەرهەنگ و دۆزی کورد.

- ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە نێوەندگیریی هێزەکانی کوردستان لەسەر ئاستی هەر چوارپارچەی وڵات.

- ڕۆڵی هەبووە لە پرۆسەی ئاشتی لە باکووری کوردستان و لە تورکیادا.

- ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لە پشتیوانیکردنی بەرخۆدانی ڕۆژئاڤا.

(کۆتایی)

(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) پردی نێوان باکوور و باشوور.

(عەبدوڵلا ئۆچالان).

(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) پیاوی ئەرکە سەختەکان.

(جەلال تاڵەبانی).

(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) چەپێکی نەتەوەیی، نەتەوەییەکی چەپ.

(جەمال نەبەز).

(محەمەد ئەمین پێنجوێنی) دیپلۆماتێکی شارەزا لە مێژوو.

(عیسمەت شەریف وانلی).

سەیدای پێنجوێنی شاعیرو سیاسی و کوردێکی ئەنتەرناشیونالّ.

(پرۆفیسۆر نادری نادرۆف).

دەخوازم هەموو کوردێک تێکۆشەرێکی بۆ فیزی وەکو محەمەد ئەمین پێنجوێنی بێت.

(دکتۆره دوریه عەونی).